# بیری سیاسی

## کۆن و ناوەڕاست

دکتۆر غانم محەمەد ساڵەح

مامۆستای یاریدەدەری زانستە سیاسیەکان- زانکۆی بەغداد

وەرگێڕانی: سەلام کەریم

چاپی یەکەم .. ... .... ..... ...... ٢٠٠٥

# ناسنامەی کتێب

کتێب: بیری سیاسی کۆن و ناوەڕاست

بابەت: بیری سیاسی

نوسەر: د. غانم محەمەد سالەح

وەرگێڕ: سەلام کەریم عەلی

کۆمپیوتەر: وەرگێڕ

بەرگ: کامل محەمەد

چاپ: یەکەم

تیراژ: ١٠٠٠ دانە

ژمارەی سپاردن: (١٠٩)ی ساڵی ٢٠٠٥ ی وەزارەتی ڕۆشنبیری حکومەتی هەرێمی کوردستان

چاپ: چاپخانەی هێمن / سەیدسادق

لەبڵاوکراوەکانی

خانەی چاپ و بڵاوکردنەوەی چوارچرا

پێشەکی

## شوناسی بیری سیاسی

**ڕێکخستنی سیاسی**" دیاردەیەکی لەمێژینەی گشت کۆمەڵێکی مرۆڤایەتییە، لەهەر جێگەیەك کۆمەڵێکی مرۆیی هەبێت جۆرێك لەڕێکخستنی سیاسیو ئەندازەیەك لەڕێساو بنەمای یاسایی تایبەت هەیەو مەبەست لێی ڕێکخستنی هەڵسوکەوت و ڕەفتاری تاکە کەسەکانی ناو ئەو کۆمەڵگەیەو هەروەها پەیوەندییان بەدەستەی فەرمانڕەوە ڕێکدەخات.

مرۆڤ جیاواز لەگشت بونەوەرە زیندوەکانی تر، لەسایەی رەحمەتی سروشتدا نەماوەتەوەو هەوڵیداوە لەدەوروبەرو دیاردەکانی ناو سروشت تێبگاو شرۆڤەیان بکات، وەك چۆن لەروانگەی فیکریی خۆیەوە لەپێناو کۆنترۆڵکردنی سروشت و پەرەپێدانی رەگەزەکانی دەوروبەر کاریکردوە، سەرباری ئەم ئەرکانە هەوڵێکی دیکەی مرۆڤ بۆ ئەوە بووە داهات و سەرچاوە سروشتییەکانی ناو گەردون گەشە پێبدات و دواجار لەبەرژەوەندی خۆیدا بەکاریان بهێنێت.

مرۆڤی سەرەتایی Primitive man لەسایەی رەحمەتی سروشتدا ژیاوەو بەگوێرەی یاساکانی گەشەسەندنی سروشتی نەبوبێت نەیتوانیوە گەشەبکات و لەقۆناغەکانی دواتردا خۆی لەبونەوەرەکانی دیکەی ناو گەردون جیاکردەوە، ئەمەش لەو ساتەوەختەوە دەست پێدەکات کە تیایدا بەرە بەرە دەرکی بەدیاردەکانی دەوروبەر دەکردو ئنجا پەیتا پەیتا بیری خۆی

لەخزمەتکردنی ئەو دیاردانەو گەشەپێدان و دواتریش گونجاندن و ڕێکخستنیان دەخستەگەڕ.

بۆیە پرۆسەی خستنەگەڕی بیری مرۆڤ لەپێناو تێگەیشتن لەسروشتی دەوروبەر بووەتە مایەی تێگەیشتنی هەڵسوکەوتی مرۆیی‌و پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکانی‌و تاکو مرۆڤی گەیاندە ئاستێکی پێشکەوتوی ئەوتۆ کە تیایدا لەسروشت رابمێنی‌و دیاردەکانی شرۆڤە بکات.

هەمان ئەو ڕێگەیە کە بەهۆیەوە مرۆڤ راستییەکانی سروشت ئاشکرا دەکردو یاساکانی ژیان و سروشتی روندەکردوەو هێزی سروشتی دەخستە ژێر کۆنترۆڵی خۆیەوەو سودی لەسەرچاوەکانی وەردەگرت، مرۆڤی هاندا تاکو پرسیار لەبارەی بیروبۆچونە فیکریی‌و نەریت و ڕێکخستنە کۆمەڵایەتیەکانی خۆی بکات، هەروەها لەئاشکراکردنی سروشتی مرۆڤ و توانای لەبەرنامەڕێژیدا بەمەبەستی پێشخستن و گۆڕینی ئەو بیروبۆچونانە.

بەمشێوەو لەئاکامی ئەو هەنگاوانەدا، بەشێوازێکی سروشتی گشت پێکهاتەو ڕێکخراوە کۆمەڵایەتییەکان گەشەو گۆڕانکارییان بەسەردا هات و مرۆڤیش بەرە بەرە دەرکی بەبونی ئەو ڕێکخستنانە کردوەو بەئیرادەی خۆی کاری بۆ گەشەسەندنیان کرد.

هیچ گومانی تێدا نییە دەوڵەت لەبەهێزترینی شێوازەکانی ڕێکخستنی کۆمەڵایەتییە، بۆیە دەبوو مرۆڤ (پاش ئەوەی چەند نمونەیەکی دادوەریی لەیاساکانی فەرمانڕەواییدا پەرەپێدا) لەناو ئاڵۆزیی پرۆسە بەردەوامەکانی پەرەسەندنی مرۆڤایەتیدا بەشوێن ئەم دامەزراوەیەدا بگەڕێت: بنجوبنەوانەکانی ئاشکرابکات، پرسیار

لەبارەی بنەڕەتەکەیەوە بکات و یان پشتگیری دەسڵاتەکەی بێت، دیالۆك لەمەڕ چوارچێوەی گونجاوی ئەرکەکانی بکات. بیری سیاسی وەك ئەنجامێك بۆ ئەم پرۆسەیە هاتوەتەوە ئاراوە.[1]

بەگەشەسەندنی بیری مرۆڤ و زیادبونی توانای لەتوێژینەوەو لێهەڵهێنجاندا بازنەی بیرکردنەوەی سیاسیانەش فراوان بوەو، تیۆرە سیاسیەکان هاتونەتە ئاراوەو لەقۆناغێکی دواتری زۆر پێشکەوتوو تردا ئەو مەزهەبە سیاسیانە دەرکەوتن کە تەنیا بەشیکرنەوەی دیاردەیەکی کۆمەڵایەتی دیاریکراو یان قەتیسبون لەسنوری کێشەیەکی سیاسیو دۆزینەوەی چارەسەرەکەیدا ناوەستن، بەڵکو بەرنامەو میتۆدێك دادەنێن کە لەچارەسەرکردنی قەیرانە سیاسییە جۆراوجۆرەکاندا پەنای بۆ دەبرێت.

کەواتە بیری سیاسی گرنگی بەو بیرۆکەو چەمکانە دەدات کە لەدیاردەی سیاسییەکان دەکۆڵنەوە لەرێگەی پەسنکردن و لێکۆڵینەوەو راڤەکردنەوەهەوڵی ناسینی دەدەن لەپێناو دروستکردنی تێگەیشتنێکی دیاریکراو لەمەڕ ئەم دیاردە یان ئەوی تریان، ئنجا گواستنەوە لەمیانەی پێکبەستییەك لەگەڵ دیاردە کۆمەڵایەتییەکانی تردا بەرەو کۆمەڵە هەوڵدانێکی گشتگیرکردن کە دەشێت یارمەتیدەر بێت لەپێشبینی کردندا.[2]

بەگوێرەی ئەوانەی باسکران، دەتوانرێت بوترێت دەرکەوتنی بیری سیاسی هاوکات بووە لەگەڵ پەیدابونی مرۆڤی پرسیارکار

---

1 – Cettel,Rymond G.Hitory of Politicalthought. George Allen and unwin . LTD.. London-1951- P-4

2 – الدکتور. علی احمد عبدالقادر: مقدمة فی النظریة السیاسیة، مطبعة الکیلانی، القاهرة – ١٩٧٤.. ل ٧٩.

لــەبارەی سروشــتی پابەنــدبون بەگوێرایــەڵی و ملکــەچ بــوون بــۆ فەرمانڕەوا، بەواتایەکی وردتر بیر پێش جوڵە هەبووە، چونکە جوڵە بێجگە لەهەوڵ لەپێناو گەیشتن بەئامانجێکی دیاریکراو هیچیتر نییە، هەرچــەندێك ئامــانج بەبەشــەکی یــان تیرەیــی یــان راســتەوخۆ پەســنبکرێت، هــیچ نییــە جگــە لەگوزارشــتکردن لەکۆمەڵــە دەرك و وێناکردنێك و ئنجا بریتییە لەبیر.[3]

بـەڵام لەگـەڵ ئەوانەشـدا ناکرێـت دیـاریکردنی بنەڕەتـەکانی بـیری سیاسی کۆمەڵە راستییەکی بەڵگە نەویستمان لـەبیر بباتـەوە کـە لـەبەر سەلمێنراوی و چەسپاوییان پێویستیان بەبەڵگە بۆ هێنانەوە نییـە،[4].. ئەوانیش:

١. مـەرج نییـە هـەموو بیرێـك هەرچـەندە پەیوەست بێـت لەگـەڵ دەســڵات یــان بەپابەنــدبونی سیاســییەوە بچــێتە نــاو ئــەو چوارچێوەوە کەوا ڕاهاتوین بە"بیری سیاسی" ناویبەرین.

**بــیری سیاســی:** ئاســتێکی بــەرزترە لەئاستەکانی بـیری ئاسـایی، بەچەشــنێك لــەبیری سیاســیدا ئاســت باڵاییــەك لەلێکۆڵینــەوەو هــەروەها دەســتبڵاوییەك لــەبونیات و رەســەنایەتی و پەیوەســت بەنەریتــە ژیارییــەکان لــەبیری سیاســیدا تێبینــی دەکــەین، بەچاوپۆشــی لەئــەوەی بنــەماکانی لێکۆڵینــەوەی سیاســی گرێدراوییــەکی لــەنێوان بــیری سیاســی و کولتــوری خۆرئــاوادا دروست کـردوە، ئـەوەی جێگـەی گومـان نییـە مرۆڤایـەتی کۆمەڵـە

---

3 - بڕوانە: الدکتور. حامد ربیع: تطور الفکر السیاسی، کلیة الأقتصادو العلوم السیاسیة، جامعة القاهرة ١٩٧٦- ١٩٧٧.. لا ١.

4 - هەمان سەرچاوەی پێشو.. لا ١-٢.

نمونەیەکی تۆکمەی بیری سیاسیو وێناکردنی سیاسی ناسیوە، لەوانە: بیری هیندستانیو بیری چینی، بەبێ چوونە سەرباسی بیری سیاسی ئیسلامی، کە هەندێك نمونەی ئەو جێبەجێکردنانەن.

سەرباری ئەمانەش پێویستە دان بەراستییەکی ئاشکرادا بنێین، کە زانستی سیاسی لەپرەنسیپە هاوچەرخەکانیشیدا هێشتا لەسەر بیری سیاسی گریکەکان دەژیو تائێستاش هەمەکییو چەمکەك و زاراوە بەکارهاتوەکانی لەناونانی گشت ئەو شتانەی پەیوەندییان بەبونی سیاسییەوە هەیە لەو فەلسەفە کۆنەوە کە بیری سیاسی گریکەکانە وەردەگرێت.. تەنانەت ئەگەر بڕوانینە کولتوری سیاسی بەواتا وەرگیراوەکانی دیموکراسی دەبینین سەرەتاکانی دەگەڕێتەوە بۆ بیری یۆنانیو هەروەها بەچەندین ئەڵقەی پێکەوە گرێدراو لەچەق و دەوروبەری شارستانییەتی ئەوڕپا دەخولێتەوەو چەقبەستنەکە راستەخۆ یان ناڕاستەوخۆ دەبێت.

٢. بیری سیاسی هەقیقەتێکی شارستانییە، بەڵام هاوکات گریمانەی ئاستێکی دیاریکراو لەرێکخستن و پێگەیشتنی بەرنامەڕێژکراو لەتوێژینەوەی دیاردەی سیاسیدا دێنێتە ئاراوە، ئەگەرچی بەکاربردنی رۆژانە جیاوازی لەنێوان لەبیرو فەلسەفەدا دروستکردوە و کۆمەڵە بنەمایەکی زانستیو بابەتی بۆ سەلماندنی جیاوازیی نێوان بیرو فەلەسەفە لەئارادایە، ئنجا بیری سیاسی کاتێك وەك ناو لەچەمکێك دەنرێت، چیتر ناکرێت بەتەنیا گوزارشت لەکۆمەڵە ماك و وێناکردنێکی ئاسایی بکات، بەڵکو دەبێت بەرزبکرێتەوە بۆ ئاستی پێگەیشتنی ناوخۆییو رێکخستنی لۆژیکیو دابەشکردنی هەمەکیانەی رەگەزەکان، تاکو بەهەموو

ئەمانەوە بگاتە ئاستی سیستمێکی تۆکمەی ئەوتۆ کە توانایدایە بەشێوەیەك لەشێوەکان لەواتای وشەی فەلسەفە نزیك ببێتەوە، ئەگەرچی ئەم نزیکبونەوەیە لەفراوانترین ئاستەکانی واتاشدا بوبێت.

بەهەمانشێوە کاردانەوە سیاسیەکان لەسروشتدا یەك نین و لەهەڵسەنگاندن و دیاریکردنی ئەرکەکانیدا وا پێویست دەکات زیاتر لەپێوەرێك بەکاربهێنرێت، بیری سیاسی پێویستە لەخودی خۆیدا بونیاتێکی لۆژیکانەی کامڵی وێناکردنی سیاسی بەرهەم بهێنێت.

٣. بیری سیاسی لەدەوری کۆمەڵە بەهایەك دەخولێتەوە کە هەندێکجار بە Politc Normative theory ناودەبرێت، لەگەڵ ئەوەی ئەم ناونانە کەمێك لەناوردیی تێدایە، بەجۆرێك تێکەڵی لەنێوان تیۆری سیاسیو مێژوی بیری سیاسیدا دروستکردوە، هاوکات ئەندازەیەك لەدروستی تێدایە کاتێك هەردوو چەمکەکە لەدەوروبەری کۆمەڵە بەهایەکی پایەبڵندی نەگۆڕ چڕدەبنەوە.. هەرچی جیاوازی نێوانیانە خۆی لەلۆژیکی خستنەڕوو و شێوازی چارەسەرکردن و تێروتەسەلیدایە بەمەبەستی دانانی کۆمەڵە پێوەرێکی بزاوت و پێوانەی لۆژیکی، مێژوی بیر لۆژیکی بەدواداچونی زەمەنییو سەرهەڵدانی بیر دەکاتە یەکەی پێوانەو بنچینەی لێکۆڵینەوەکانی..

٤. بیری سیاسی هەریەك لە: تیۆری سیاسی، فیقهی سیاسیو مەزهەبی سیاسی لەخۆدەگرێت، هەموو ئەمانە دەربڕینی جیاوازن بۆ ئاستێکی دیاریکراو لەئاستەکانی وردبینی لەتوێژینەوەو باڵایی لەگشتگیرییو ئامانج لەوێناکردندا، تیۆری سیاسی لەهەموو ئاستەکانی توێژینەوەی سیاسی زیاتر گوزارشت لەوردبینیو

لەخۆگرتن دەكات.. فیقهی سیاسی وشەیەكە بۆ گوزارشتكردن لەبابەتێتیو سەرخستنی رەگەزی یاسایی بەكاردێت و مەزهەبی سیاسی وێناكردنێكی بزاوتیانەیە، وەك چۆن بیری سیاسی لەسەدەی نوزدەیەمدا لەناو كۆمەڵە بزوتنەوەیەكی جەماوەریدا كە ئامانجی گۆڕینی بارودۆخی هەنوكییە لەمیانەی كۆمەڵە ئامرازێكی دیاریكراوەوە، گڵاڵە بووە.[5]

٥. ناكرێت بیری سیاسی تەنیا وەك یەكەیەكی تایبەت و تەرخانكراو بۆ مامەڵەكردن لەگەڵ دەسڵاتدا بەواتای سیاسەتی ناوخۆ وێنا بكرێت، گشت ئەو شتانە لەخۆدەگرێت كە پەیوەندییان هەیە بەباری نێودەوڵەتییو جموجۆڵی هێزە سیاسیەكان لەسەر ئاستی دەرەوە.

گومانی تێدا نییە ماكی فەلسەفییانە پێویستە نۆبەتی یەكەمی پێ ببڕێت،چونكە لەدەوری پابەندبونی سیاسیو راڤەكردن و

---

5- لەهەمان روانگەوە دكتۆر ئیبراهیم چەلەبی تێڕوانینەكانی بەمشێوە دەخاتەڕو" جیاوازیكردن لەنێوان چەمكەكانی بیری سیاسیو تیوری سیاسیو مەزهەبە سیاسیەكان گرنگییەكی ئەوتۆی نییە، بەتایبەت ئەگەر بزانین تیۆری سیاسیو مەزهەبی سیاسی بەرهەمی فیكرن..ئەو فیكرەی كە ئەگەر یەكەیەكی تەواو بێت لەروی هەمەكیو كەمەكییەكانیەوە بەتیۆر ناودەبرێت و كاتێكیش تیۆرە بەرفراوان دەبێت ولایەنگرانی زۆرتر دەبن و خەڵكی لێ كۆدەبێتە ناوی (مەزهەب)ی لێدەنرێت، لەسەر ئەم بنچینەیە بیر تێڕوانینیەكانی خۆی دەخاتە ڕو، ئەگەر تێڕوانینیەكان لەروی تیۆرەوە بەرەو كامڵبون چو، دەكرێت بەتیۆری سیاسی ناوببرێت و ئەم تیۆری سیاسییە ئەگەر پراكتیزەكراو داواكردنی جێبەجێكردنی ناوەڕۆكەكەی دەستی پێكرد، ئیتر ناوی مەزهەبی سیاسی بەسەردا دەسەپێت.

لەمبارەوە بڕوانە: الدكتور. ابراهیم احمد شلبی: تطور الفكر السیاسی، دراسة تأصیلیة لفكرة الدیمقراطیة فی الحضارات القدیمة، الدار الجامعیة، بیروت- ١٩٨٥ لا ١٦.

سەلماندنی ئەو پابەندبونە سیاسیەدا دەخولێتەوە، بەڵام ئەمەش رێگر نابێت لەبەردەم ئەوەی بیری سیاسی بەچوارچێوەیەکی گشتیی دابنرێت کە لەروانگەی بەدواداچونی زەمەنییەوە گشت ئەو شتانە لەخۆدەگرێت کە پەیوەندییان بەبوونی سیاسییەوە هەیە لەسەرجەم جێبەجێکردنەکانیدا.

لەچوارچێوەی ئەم ماکە گشتیانەدا[6]..کە لەبەر رۆشناییاندا بیری سیاسی دیاریدەکرێت، دەکرێت بیری سیاسی بەدیراسەکردنێکی مێژویی پێناسە بکرێت، ئەمەش لەبەرئەوەی بەدواداچونێکی زەمەنییە لەگەڵ جۆرێك لەپسپۆری بابەتەکانی تایبەتن بەو کولتورە فیکریەی کە پەیوەستە بەشرۆڤەی دیاردەی دەسڵاتەوە.

بیری سیاسی لەبنەرەتەکانیدا راستەوخۆ بەرەو کولتوری یۆنانیمان کێشدەکات (لەوانەیە شارستانییەتی یۆنانیش تێپەرێنێت) تا لەقۆناغەکانی دواتردا گوزارشت لەو پەیوەندییە توندوتۆڵە بکات کە شارستانییەتی ئەفلاتۆن بەکولتوری چەرخی رێنسانسەوە دەبەستێتەوە، تاکو لەبەرامبەر تێکۆشانی بیریی ئەم سەدەیەدا بوەستێتەوە کە تیایدا دەژین، ئەمەش جۆرێکە

---

6- دەکرێت لەگەڵ ئەو ناوەشدا ناوی دیکەشی بۆ زیاد بکرێت، هاوشان لەگەڵ گرنگییە رێژەییەکەیدا، چونکە بیری سیسیی خەسڵەتی "رێژەیی" هەیە، ئەمەش لەبەرئەوەی لەلای هەمو کەسێک و لەگشت شوێنێک و لەهەمو زەمەن وکاتێکدا " هەقیقەتێکی رەها"نییە.. لێرەوە بۆمان دەردەکەوێتربیری سیاسی بۆهەتا هەتایی نامێنێتەوە، لەو روانگەوە نەبێت کە بیری سیاسی وەک کارێکی هونەرێکی قەشەنگ تەماشابکرێت، هزری مرۆڤ حەزی پێدەکات و هەمیشە تینویی وەرگرتنی زیاتریەتی.. باشترین بەڵگەش بۆ ئەم راستییە بایەخدان و تێروانینی ئەم قۆناغەو ئەم سەدەیە لەبیری سیاسی لای ئەفلاتۆن لەکتێبێکی وەک "کۆمار"دا هەروەها بۆ "سیاسیەت"ی ئەرستۆو پەیمانە کۆمەڵایەتییەکەی رۆسۆ..

بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: الدکتور. ابراهیم الشلبی: سەرچاوەی پێشو.. ل ١٧-١ .

لەدوپاتکردنـەوەی بـەها جۆراوجۆرەکـان، ئەوانـەی پێـداگریی لەسـەر بیرۆکـەی رزگـارکردنی تاکـە کـەس لەگشـت جۆرەکـانی کۆیلـەکردن دەکەن.

ئەم بەشە لەرۆشنبیری سیاسـی وەك ئەڵقەی پێکەوە بەست وایـە لەنێوان هەقیقەتی شارستانیی لەلایەك و کولتوری سیاسـی لەلایـەکی دیکـەوە.. بریتییـە لـەو پەرەسـەندنە مێژوییـە کـە لێوانلێـوە لـەمیتۆدی فەلسـەفی ، ئـەو میتـۆدە فەلسـەفییەی لـەروی پێکهاتـەوە خـاوەن خەسڵەتی ئاشکرایەو تائێستاش لەژێر سایەی ئەو هەمەکییە بیریی‌و زمانـە میتافیزیکییەدایـە کـە لـەکولتوری یۆنانـەوە سەرچاوەی گرتـوەو ماوەتەوە.[7]

ئەم دیاریکردنەی چەمکی بیری سیاسـی‌و چۆنێتی سـەرهەڵدانی هانـدەرمان دەبێـت ئـەوە بـەیاد بهێنـەوە کـە ئـەم کتێبـە لەسـێ بەشـی سەرەکی پێکهاتوە:

**دەروازەی یەکـەم:** تایبەتـە بـە لێکۆڵینـەوە لـەواقعیی بـیری یۆنـانی لەروانگەی دەرخستنی گرنگیـی ئـەو واقیعـەو ئـەو زەمینەسازیەش کـە لەسـەر سـەریهەڵداوە، ئـەو نمونـە بیرییانـەش کـە دەکرێـت بـۆ بەڵگەهێنانـەوە ئامـاژەیـان پێبـدرێت و ئـەو قوتابخانـە بیرییـە جۆراوجۆرانەی کە بەدوای شکستە کاتییەکەدا هاتن.

**دەروازەی دووەم:** تەرخانـە بـۆ لێکۆڵینـەوە لەشارسـتانیەتی رۆمـا بەگشـت ئـەو دەرئەنجامانـەی لێـی کەوتونەتـەوە، سـەرەتا باسـی

---

[7]- بڕوانە الدکتور. حامد ربیع: ابحاث فی النظریة السیاسیة، مکتبة القاهرة الحدیثة. القاهرة ١٩٧٠.. ل ٢٣-٢٤.

گرنگییەکەی دەکرێت و ئنجا دێتە سەر نمونەی: بیریارەکان و یاساکانی رۆماو ئەو کارەکتەرانەی کە پەیوەندییەکانی رۆمای لەگەڵ وڵاتانی تردا دەبەستەوەو دواتریش رۆڵی رۆما لەدەوڵەمەندکردنی ئەو بیرە سیاسیەدا.

**دەروازەی سێیەم:** بیری سیاسی لەسەدەکانی ناوەڕاستدا، سروشتی ئەم بیرەو مەوداکانی لۆژیکی مەسیحیەت روندەکرێتەوە لەگەڵ ئەو گەشەسەندنانەی لەماوەی دە سەدەدا بەسەر پەیوەندی کڵێسا بەدەوڵەتەوە هاتووەو هاوکات لەگەڵ ئاماژەکردن بە بەشداری دەستەبژێرەکانی عەرەبە موسڵمانەکان لەبیری سیاسیدا.

پێشەکیی

## گرنگیی بیری سیاسی یۆنانی

وا پێدەچێت لەیەکەم تێڕوانینـدا بـیری یۆنـانی بایـەخێکی سـنورداری هـەبێت بەبەراورد لەگـەڵ ئـەو راستیانەی شارستانییەتی هاوچـەرخ هێناونیەتـە ئـاراوە، کـە بووەتـە هـۆی دروسـتبونی جیاوازییـەکی گـەورە لـەنێوان هـەردوو دیمەنەکەدا "دیمـەنێکی کۆن و دیمـەنێکی نـوێ" کـە بـەهیچ شـێوەیەك بـواری بـۆ بـەراوردکردن لەنێوانیانـدا نەهێشتوەتەوە، هەرچـەندە ئەم ئاراستە پێچەوانەی ئـەو هەقیقەتەیـە کـە ئـەو شارسـتانییەتە گوزارشـتی لێـدەکات .. نهێنـی گرنگیـیو بـەهای بیریـی یونـانی تـەنیا لـەوەدا نییـە کـە یۆنـان سەرچـاوەی یەکـەمی سـەرهەڵدانی شێوە لۆژیکییەکانـە، ئـەو شـێوە لۆژیکییانـەی دواتـر بـیری خۆرئـاوای لێـوەی سەرچـاوەی گرتـوەو ئێمـەش هەنوکـە رەگـەزەکانی بیرکردنـەوەو رێگـەکانی گوزارشـتکردن لەبارودۆخە سیاسییە رێکخراوەکانی خۆمان بەشێوەیەکی گشـتی لـەو بیرە وەردەگرین، بەڵکو گرنگییەکە لەوێشـەوە سەرچاوە دەگرێت کەوا فەلسـەفەی یۆنـانی هەقیقـەتێکی رەهایـەو بـەهیچ شـێوەیەك هەڵسـەنگاندن قبوڵناکـات: ئـەو بـیرەی کـە لـەنیوە دورگـەی یۆنـان سـەریهەڵداوە (کاتێـك روبـەڕوی دەبینـەوە) پێویسـتە لەگشـت رێژەییـەکی مێـژویی ئـازاد بکرێـت و بـەرەو کۆمەڵـە بەهایـەکی ناسنوردار ئاراستە بکرێت، بەکورتی بەرەو "هەقیقەت".. فەلسـەفەی یۆنانی کاتێك بەرەو هەقیقەت دەڕوات مەبەستی تـەنیا لـەئامێزگرتنی

ئەو هەقیقەتە نییە بەڵکو بۆ تێکەڵبونە لەگەڵیدا بەجۆرێك پێکەوە "گشت"ێك دروستبکەن کە جیاکردنەوەی مەحاڵە[8]

کولتوری یۆنانی، بەگوێرەی ئەوەی باسکرا" بریتییە لەبیری فەلسەفیی‌و ئەبستراکی لۆژیکیانە سەبارەت بەو بەها باڵایانەی کەوا هەڵسوکەوتەکانی مرۆڤ کۆنترۆڵدەکەن لەنێویاندا هەڵسوکەوتی هاوڵاتی بەرامبەر بەدەسڵات.

کاتێك باس لەفەلسەفەی سیاسی یۆنان دەکەین، باس لەبنەما میتۆدییەکانی فەلسەفەی سیاسی دەکەین لەگشت قۆناغ و گەشەسەندنەکانیدا[9].. ئەفلاتۆن بەتەنیا سیاسەتی ئاشکرا نەکرد، بەڵکو بیری مرۆڤایەتی ئاشکرا کردوە، ئەو ئاشکرا کردنەی کە دواجار بواری بۆ شارستانییەتی خۆرئاوا رەخساند تاکو لەداهێنانەکانی دواتریدا شتێك بدۆزێتەوە کە ئەمرۆ پێدەوترێت لۆژیکی زانستی، خۆ ئەگەر شارستانییەتی کڵێسا توانیبێتی کۆمەڵە نمونەیەکی بیری دیاریکراو بەناوی مرۆڤایەتییەوە پێشکەش بکات،

---

8- هەمان سەرچاوەی پێشوو.. ل ١٢٩- ١٣٠..

ئەم راستییە دەنگدانەوەی خۆی لەو بیروبۆچونانەدا خۆی دەبینێتەوە کە فەیلەسوفی بەریتانی "برتراند راسل" پێشکەشی کردون و پێیوایە: یۆنانەکان بیریان بەشێوەیەکی ئازاد لەجیهان و کۆتایی ژیاندا بڵاوکردوەتەوە بەبێ ئەوەی خۆیان بەکۆتوبەندەکانی بیروباوەڕی باوی کۆمەڵەوە ببەستنەوەو لەئاکامدا ئەو فەلسەفەیان داهێنا کە تاکو ئێستاش خەڵکی بەسەرسامییەوە لێی دەڕوانن و هاوشێوەی باسکردنی "گازی سیحر" باس لەو بلیمەتییە دەکەن.. بڕوانە: برتراند راسل: تاريخ الفلسفة الغربية، الكتاب الاول" الفلسفة القديمة، ترجمة: الدكتور زكي محمود، لجنة التاليف و الترجمةو النشر، القاهرة - ١٩٦٧ .. ل ٢٣.

9- ئەمە وایکردوە هەندێک ئەوە دوپاتبکەنەوە کە یۆنانەکان بەواتای دەقاودەقی وشەکە داهێنەری بیری سیاسین.. بڕوانە: الدكتور محمد فتحي الشنيطي: نماذج من الفلسفة السياسية، مكتبة القاهرة الحديثة، القاهرة-١٩٦١. ل ١٣.

ئەوا نەك تەنیا لەرێساكانیدا، بەڵكو قەرزاری ئەو كولتورە فیكرییە كە لەسۆكراتەوە بەجێماوەو هەریەك لەشیشرۆن و سێنیكا سودیان لێوەرگرتوە.[10]

كەواتە گرنگی فەلسەفەی یۆنانی ئەوەی تێپەراندوە كە تەنیا جۆرێك بێت لەجۆرەكانی حەز بەزانیننكردنی زانستیانە، بیری سیاسی: **یەكەمجار**" خۆی لەپەیوەندی راستەوخۆی بەشارستانییەتی خۆرئاوادا دەبینێتەوە، بەڵام ئەم پەیوەندییە **دووەمجار**" بە بەراورد لەگەڵ ئەو بایەخەی رۆشنبیری سیاسی لەلای یۆنانییەكان هەیبوە كەمدەبێتەوەو ئەو بایەخەی نامێنێ، ئەمەش لەبەرئەوەی لۆژیكی سیاسی و هۆیەكانی گوزارشتكردن لەچەمكە سیاسیەكان تاكو ئێستاش بارە بەسەر شارستانیەتی یۆنانیەوە، وەك چۆن ئەم پەیوەندییە **سێیەمجار**" بەوابەستەبونی گوزارشتی لەبەرامبەر كولتوری ئیسلامیدا دوپات دەبێتەوە كە لەزۆر خەسلەت و رویەوە قەرزاری شارستانییەتی یۆنانییە" بۆ نمونە ئایا دەتوانین بەبێ گەرانەوە بۆ "كۆمار"ەكەی ئەفلاتۆن لەكۆمارەكەی فارابی تێبگەین،[11].. ئەم پێشەكییە كورتە سەبارەت بەپێگەی بیری یۆنانی لەناو بیری مرۆڤایەتیدا هاندەرمان دەبێت لەدیاریكردنی ئەو پەرەسەندنە سیاسیانەی كە لەكۆندا لەوڵاتی گریك دا رویانداوەو لەئاكامدا بووەتە هۆی قاڵبگرتنی بیری یۆنانی لەچوارچێوەی دەوڵەتی شاردا.

---

10- الدكتور حامد ربیع: سەرچاوەی پێشوو.. ل ١٣٠.

11- هەمان سەرچاوەی پێشوو.. ل ١٣.

نزیكەی (٧٠٠ ساڵی پێش زایین) گریكەكان بەشێوەیەكی نایاب و دیاریكراو لەدەوڵەتی شارەكان City States[12] دا سەقامگیر بوون، لەناو خۆیاندا جۆرێك لەگرێبەستی ئاینی‌و عورفییان پێكهێنابوو كە رێگری لەسەربەخۆی سیاسیی هەندێكیان لەهەندێكی تریان نەدەكرد تا لەدواتر بووە مایەی پێكدادانی بەرژەوەندییەكان و كەوتنەوەی شەڕە زۆرو زەوەندەكان.

ماوەی فەرمانڕەوایی هۆمێرییەكاندا (واتە نزیكەی ٥٨٠ پێش زایین) لەوڵاتی گریكەكاندا بەسیستمێكی فەرمانڕەوایی پاشایەتی باوكسالاریی Patricha Monarghy تەشەنەی سەندو توانی بەشێوەیەكی دیاریكراو لە كۆمەڵگای شاری سپارتەدا بەردەوام بێت، بەڵام زۆری نەبرد دەستبەرداری ئەم سیستمە بوو و لەجێگەیدا سیستمێكی فەرمانڕەوایی ئەرستۆكراتی خاوەن ئەنگیزەی سەربازیی دەسڵاتی گرتەدەست.

كۆنترۆڵكردنی زۆرینەی دەوڵەتە شارەكانی گریك لەو ماوەیەدا لەلایەن سیستمە ئەرستۆكراتی‌و ئۆلیگارشی‌یەكانە نەیتوانی كاریگەرییەكی ئەوتۆ لەسەر سروشتی پەیوەندییەكانی ناو كۆمەڵگەی گریكی دروست بكات، ئەو پەیوەندیانەی كە لەسەر بنەمای هارمۆنیزمی كۆمەڵایەتی‌و هاوشێوەیی بەها سیاسی‌و خولقیەكان دروست بوبوون، بەڵام ئەوەندە هەیە لەو ماوەی كە تا سەدەی پانزەیەمی پێش زایین درێژە دەكێشێ لەناوچونی ئەم چینە (ئەرستۆكراتی)و پەرەسەندنی چینی بازرگانەكان بەخۆیەوە دەبینێت

---

[12]– بۆ زیاتر ئاشنابون بەپەرەسەندنە سیاسیەكانی وڵاتی گریك لەپێش ئەم قۆناغەدا.. بڕوانە: الدكتور. عبدالرضا الطعان: الافكار السیاسیة فی الشرق القدیم (العراق القدیم و المصر القدیمة)، مكتب النصر للطباعة.. لا ٩١.

ئەو چینەی کە بەلایەنەکانی فەرمانڕەوایی ئەرستۆکراتەکان و بارودۆخەکەیان قایل نەبوو، تا بووە هۆی دەرکەوتنی چەندین چەوسێنەر Tyrants و زەوتکار کە لەمیانەی گفتوگۆکردن لەگەڵ و بەپشت بەستن بەبەجەماوەر گشتی بوونە خاوەن دەسڵاتی فراوان.[١٣]

کاتێك مانەوە لەدەسڵاتدا بەرێگەی نایاسایی‌و دژ بەدادوەریی، وەك چۆن خەڵکی لەنەریتەکانی خۆیدا پێ ئاشنابوون، بووە حاڵەتێکی بەرچاو ئیتر بیری سیاسی کەوتە گفتوگۆکردن لەسەر دیاردەکەو رێوشوێنەکانی روبەڕبونەوەی ئەو ئارەزوە، بۆ ئەم مەبەستەش چەندین قوتابخانەی بیری هاتنە ئاراوە کە هەندێکیان لەهەوڵی ئەوەدا بوون بیانوو بۆ قۆرخکردنی کورسی دەسڵات و مانەوە لەدەسڵاتدا بهێننەوە، هەندەکەی تریش لەمیانەی بەیاننکردنی شێوە جیاجیاکانی سێستمی فەرمانڕەوایی‌و ئالییەتەکانی‌و مەوداکانی وەرگرتنی ئەم دەسڵاتە یان ئەوی تریان هێرشیان دەکردە سەر ئەم رێڕەوە .[١٤]

---

[13]– پێدەچێت ئەم جۆرەی فەرمانڕەوایی چەوسێنەر لەژێر کاریگەری دوو کارەکتەردا دامەزرابن، ئەوانیش: یەکەم بریتییە لەگەشەسەندنی تێبینکراو و ڕو لەزیادبونی دەوڵەتە شارو بەرفراوانبونی بازرگانی‌و پێگەیشتنی بیرەکانی، بەجۆرێك بووە هۆی سەرهەڵدانی بانگەشە بۆ کۆکردنەوەی دەسڵات لەدەستی تاکەکەسداو ئەو تاکەکەسە ببێتە جێبەجێکارو ئاراستەکاری کاروبارەکانی ئەو دەوڵەتە.. دووەمیان: رووەکانی کورتبڕی‌و لاوازیی کە لەخودی فەرمانڕەوایی حکومەتی ئەریستۆکراتیدا هاتەکایەوە، رێگەیان بۆ تاکەکەسی بەهێز خۆشکرد تا ئەوانیتر لەناوبەرێت و دەسڵات بخاتە ژێر رکێفی خۆیەوە.. بڕوانە: الدکتور. علی عبدالمعطی محمد: الفکر السیاسی الغربی، دار الجامعات المصریة، القاهرة– ١٩٧٥.. ل ٢١.

[14]– الدکتور احمد عبدالقادر: تطور الفکر السیاسی (الاغریق الاقدمون) مکتبة نهضة الشرق، القاهرة– ١٩٧٠ .. ل ٧–٨ . ئنجا بەراوردی بکە لەگەڵ:

ئـەم توندوتیژییـەی کـە فـەرمانڕەوا چەوسـێنەرەکان دەرهـەق بەهاوڵاتیان ئـەنجامیان دەدا، بووە هۆی یەکخستنی سەرجەم چین و توێـژە کۆمەڵایەتییـەکان لـەپێناو نەهێشـتن و لـەناوبردنی ئـەو فەرمانڕەوایانـە لەدەوڵەتـە شارەکانی گریکدا، کاتێکیش ئـەم ئامانجـە بـدیهات ئەرسـتۆکراتەکان هـەوڵی بەدەسـتهێنانەوەی دەسـڵاتەکەی جارانیـان دەداو لـەئاکامی ئەمەشـدا ململانێیـەکی نـوێ لـەنێوان ئەرسـتۆکراتەکان و تـەواوی ئـەو هاوڵاتیانـەدا دروسـت بـوو کـە دەیانویست بـەناوی گەلـەوە پارێزگاری لـەم دەسڵاتە بکـەن، لەمیانـەی ئەم ململانێیەوە بیری سیاسی گریکی هاتە ئاراوە.

ئەو بیرە سیاسیەی لەئـەنجامی ئـەو ململانێ توندەوە دەرکـەوت، بەدوو ئاراستەی جیاواز جیادەکرێتـەوە: یەکـەم: ئاراسـتیەیەکی رونـی کردایی‌یـە، دووەم: ئاراستـەیەکە بۆ گـەڕان بەشوێن دەوڵـەتی نمونـەیی کامڵدا.

لەروانگـە کرداریيەکـەوە گریکـەکان بەشـوێن پێناسـەی دەوڵـەت و بنـەماکانی دروسـتبونیو بنچینەی دەسـڵات لـەو دەوڵەتـەدا نەگـەڕان، بـەڵکو لـەبارەی باشـترین شـێوازەکانی فـەرمانڕەواییو پەیوەنـدیی فەرمانڕەوا لەگەڵ ژێردەستەکانیدا وتوێـژیان کـرد، هـەروەها سـەبارەت بـەوەی کـە کـێ فـەرمانڕەوا بێـت و کـێش ژێردەسـتەو، ئایـا باشـترین دەستور کامەیە.

وەك دەردەکـەوێت ئاراسـتەی گـەڕان بەشوێن دەوڵـەتی نمونـەیی لـەی گریکـەکان تـەواو پێچـەوانەیە لەگـەڵ ئاراسـتەی کردارییەکەیانـدا،

---

- Gettell Raymod, G.History of Political thought op., cit.. p 36.

بەڵام ئەم پێچەوانەی‌یە نامێنێت کاتێك دەبینین بارودۆخی دروستبونی شارەکانی یۆنان پاساو بۆ هەردوو ئاراستەکە دەهێنێتەوە.[15]

ئەم دەوڵەتی شارە چۆن دروست بووە؟.. مەرجەکانی دامەزراندنی چین؟.. ئەو نمونانە کامانەن کە دەتوانرێت دیراسە بکرێن ولەم بوارەدا پشتیان پێببەسرێت؟

---

15- الدكتور، ثروت بدوي: اصول الفكر السياسي و النظريات و المذاهب السياسية الكبرى (١) دار النهضة العربية، القاهرة-١٩٧٠ .. ل٣٩.

# بەشی یەکەم

## City States – دەوڵەتی شار

ئەگەر ئەوە لەبەرچاو بگیرێت کە تاکەکان دەرئەنجامی ئەو ژینگە نیزامییەن کە تێیدا دەژین، ئەوا تێگەیشتن لەوێناکردنی تایبەت بەگەورە فەیلەسوفانی گریکی هاوشێوەی سۆکرات و ئەفلاتۆن و ئەرستۆ بەبێ لێکۆڵینەوە لەو ژینگەیەی ئەوان تێیدا ژیاون کارێکی ئاڵۆزو قورس دەبێت.

ئەمە تەنیا لایەن نییە کە دیراسەکردنی ئەم دەوڵەتی شارمان بەسەردا دەسەپێنێت کە ژمارەیان نزیکەی هەزارو پێنج سەد دەوڵەتێك دەبوو لەیۆنان، بەڵکو لەبەرئەوەش ئەم دەوڵەتە تەنیا بارەگای چالاکییە سیاسیو کۆمەڵاتییەکانی تاکەکەس بووە[16].. هەروەها لەبەرئەوەی گشت تێڕامانەکانی یۆنان لەسەر ناوەڕۆکی ئەو شارانە چڕ بوەتەوە، بەجۆرێك یۆنانییەکان بێجگە لەمە هیچ چەشنە شارستانییەتێکان نەبووە .[17]

زۆرینەی چەمکە سیاسییە باڵا نوێیەکانی هاوشێوەی دادوەرییو ئازادییو حکومەتی دەستورییو سەروەریی یاسا لەو سەردەمانەدا دەستی پێکردوە یان هەرهیچ نەبێت سەرەتای دیاریکردنی دەلالەتەکانی بۆ ئەو قۆناغە دەگەڕێتەوە کە بەهۆی تێڕامانی فەیلەسوفانی گریکەوە هەڵهێنجراون سەبارەت

16– الدکتور. حسن شحاتة سعفان: اساطین الفکر السیاسیو المدارس السیاسیة، مکتبة النهضة المصریة، القاهرة-١٩٥٩.. لا ٤١.

17– الدکتور عبدالرضا الطعان: سەرچاوەی پێشوو.. لا١٠٩.

بەسیستمەکانی دەوڵەت لەم شارانەدا کە هەمیشە لەبەرچاویان بووە ١٨.

دەوڵەتی شار بەهۆگەلێکی زۆرەوە هاتە ئاراوە، هەندێك لەو هۆیانە ماکی ئابوریی‌و هەندەکەی تریان خاوەن ماکێکی جوگرافی یان مێژویی بەسەریاندا زاڵە، بەرزبونەوەی رێژەی دانیشتوان یان کەمبونەوەی خواردەمەنی یان ململانێ لەسەر دەسەڵاتی سیاسی لەشارێکی دیاریکراودا تا ئەو کاتەی هاوڵاتییەکانی بەجێدەهڵن و لەناو خۆیاندا کۆدەبونەوەو یەکێکیان وەك سەرۆك دەست نیشاندەکەن و دەڕۆشتن تاکو شارێکی نوێ پێکبهێنن، هەروەها سروشتی شاخاوی یۆنان و زۆری روبارەکانی کە بووەتە هۆی پەرتەوازەبونی وڵات، سەختی پەیوەندیکردن لەنێوان ناوچەکانی وڵاتدا، دواجار خولقاندی بارودۆخی گونجاو بۆ دامەزراندنی دەوڵەتە شاری سەربەخۆ، لەمبارەوە بارودۆخە مێژوییەکانی دروستبونی گەلی گریك بەفاکتەرێکی یاریدەدەر دادەنرێت، بەدرێژایی قۆناغە مێژوییەکان هۆزو تایفەکان هاتونەتە وڵاتی گریك و هەریەك لەم هۆزانە دابونەریت و رەوشت و شێوەزاری تایبەت بەخۆی هەبووە کە یارمەتیدەری بووە لەوەی یەکەیەکی سەربەخۆی تایبەت بەخۆی هەبێت .

وەك چۆن ناکرێت لەم روانگەوە لایەنە کەسییەکانی تاکی یۆنانیش لەبەرچاو نەگیرێت، کە هەمیشە ئارەزوی ئازادیی‌و

---

18 – جورج سباین: تطور الفكر السياسى (الكتاب الاول) ترجمة: حسن جلال العروسى، دار المعارف، القاهرة-١٩٧١.. ل١.

جێبەجێکردنی لەشارە بچوکەکەیدا کردوەوپەیوەست لەگەڵ بیرۆکەی سەربەخۆبونی تەواوی ئەم شارە.[19]

لەکاتی پرسیارکردن لەبارەی ئەو پرەنسیپانەی کە دەبێت لەدروستبونی ئەم شارانەدا فەراهەمبکرێن، پێویستە هەریەك لەم رەگەزانەی خوارەوە دەستەبەرکرابن:

### ١. روبەرێکی دیاریکراو

پێویستە شارەکە روبەرەکەی بەئەندازەیەك بێت کە بتوانرێت سەربەخۆ بەرێوەببرێت و هەروەها ئەوەندە گەورە نەبێت هاوڵاتییەکانی یەکتریی نەناسن، بۆنمونە شاری ئەتیکا Atica کە بریتییە لەو زەوییانەی موڵکدارێتییەکەی بۆ ئەتینا دەگەرێتەوە روبەرەکەی هەزارو شەست میلی دوجا بووە، لەکاتێکدا روبەری زۆرێك لەشارەکانی تر زۆر لەو قەبارە بچوکتر بوون.

### ٢. سەربەخۆیی ئابوریی

پێویستە بەروبومی کێڵگەی هەرێمەکانی ئەو شارە ئەوەندە بێت کە پێداویستی خواردن بۆ دانیشتوانی شارەکە دابین بکەن.

### ٣. سەربەخۆیی سیاسی

گرنگترین پایەکانی دەوڵەتی شارە، شار لەروانگەی گریکە کۆنەکانەوە نەدەبوو بەهیچ شێوەیەك ملکەچی هێزی دەرەکی بێت ئیتر ئەگەر سەرچاوەی هێزە یان سایەی شارێکی دیکەیەو یان دەسڵاتدارێکی بیانییە.. وابەستەیی یونانییەکان بەم بیرۆکەوە

---

19– الدکتور ثروت بدوی: سەرچاوەی پێشوو.. ل ٤٠-٤٢.

گەیشتوەتە ئاستی دەمارگیریی،[20].. هاوڵاتیانی ئەتینا بۆ نمونە شارەکەی خۆیان لەپێشەنگی شارەکانی تری یۆناندا دادەنا، چونکە ملکەچی هیچ هێزو لایەنێکی دیکە نییەو لەمبارەوە ئەسخیلۆس لەدرامای "ئەسپ"دا دەڵێت: هاوڵاتیانی ئەتینا سەرداریان نییە.[21]

دەوڵەتی شار بەو واقیعەی باسکرا تەواو جیاوازە لەچەمکی دەوڵەتی هاوچەرخ چ لەروی روبەرەوە بێت یان لەروی ژمارەی دانیشتوانەوە: روبەری دەوڵەتێکی شار سنوری شارێکی هاوچەرخ تێنەپەڕاندوەو ژمارەی دانیشتوان تیایدا لەباشترین باریدا نەدەگەشتە نیو ملیۆن کەس، کەمی رێژەی دانیشتوان لەدەوڵەتی شاردا یارمەتیدەرە بۆ ئەوەی بەئاسانی هاوشارییەکان یەکتری بناسن .

وەك چۆن ئەو کێشەو گرفتانەی لەڕوی سروشت و پلەوە روبەڕوی ئەو دەوڵەتەش دەبونەوە دیسانەوە زۆر جیاواز بون لەو کێشەو گرفتانەی کە لەئێستادا توشی دەوڵەت دەبنەوە، دەوڵەتی شار بەچەندین قۆناغی مێژوییدا تێپەڕیوەو گۆڕانی بەسەردا هاتوە، ئەمەش لەئەنجامی گۆڕانی فەرمانڕەواکان و ئەو بارودۆخە ئابورییانەی کە دەرئەنجامی کۆمەڵە ئیعتیباراتێکی جوگرافی دیاریکراوە، کاتێکیش ژیانی سیاسی لەهەندێك لەشارەکانی گریکدا سیمایەکی دیموکراسی بەسەریاندا زاڵبوو، دەبینین هەندێك شاری تر لایداوەو بەرەو ئەرستۆکراتیو ئۆلیگارشیەی خاوەن مۆرکی سەربازیی هەندێکجار رۆیشتوە.. دەتوانین لەم روانگەوە دوو نمونە بهێنینەوە کە ئەوانیش دەوڵەتی ئەتیناو دەوڵەتی سپارتەیە.

---

20– سەرچاوەی پێشوو.. ل٤٠- ٤١.

21– دليل بيرنز: المثل السياسية، ترجمة: لويس اسكندر، مؤسسة سجل العرب، القاهرة–١٩٦٤.. ل ٤٤.

بەندی یەکەم

# دەوڵەتی ئەتینا

ئەگەر بمانەوێت لەژینگەی سیاسی فەلسەفەی یۆنانی تێبگەین، پێویستە پێش هەر شتێك وێناکردنێکی دروست لەبارەی ژیانی سیاسی لەدەوڵەتە شاری ئەتینا پێشکەش بکەین و ئەمەش لەپێناو کۆمەڵە ئیعتیباراتێکی زۆردا، لەگرنگترینی ئەو ئیعتیباراتانە: ئەتینا جوانترین ئەزمونی لەبارەی مومارەسەکردنی ژیانی سیاسی بەخۆیەوە بینیوەو جیاواز لەشارەکانی تری یۆنان خاوەنی زۆرترینی چەمکەکانی دیموکراسییەت و ئازادیی سیاسیو سەروەریی یاسا بووە، لەبەرئەوەی زانیاری مێژویی لەلا کەڵەکە بووە، وەك چۆن ژیانی هەریەك لەسۆکرات و ئەفلاتۆن و ئەرستۆ وێناکردنێکی ژیانی سیاسییە لەئەتینا یان کاردانەوەو رەخنەیە لەو دەوڵەتەو یان هەوڵی گەیشتنە لەباشترینی ئەو شتانەی کە دەشێت بونەوەرێکی پێبگات.[22]

بێگومان گشت ئەم لێکەوتانە لەوەوە سەرچاوە دەگرێت کە وێنەی دێرینی ئەتینا بووەتە مایەی گرنگیپدانێکی بێوێنەی هەموو مرۆڤێکی ژیر، ئەمەش لەبەرئەوەی وێنەی رۆشنبیری گەلێکە، نەك وێنەی چینێکی ئەرستۆکراتی کە لەرۆحی پیرۆزی خۆیەوە رەونەقێك بدات بەروی ئەو جەماوەرەی کە فەرمانڕەوایی دەکات و ئنجا بەبێ پێکهاتنێکی تەندروست بەجێی دەهێڵێت.. وەك چۆن بریتیش نییە

---

22- الدكتور. ابراهيم درويش: النظرية السياسية في العصر الذهبي، دار النهضة العربية، القاهرة-١٩٧٣.. ل ٦.

لەوێنەیەکی دیموکراسی توندڕەوی خاوەن چالاکیی زۆر، بەڵام دیموکراسی‌یەك کە هیچ هەستێکی نییەو بیری تەسکەو خاوەن هیچ چاکی‌و مەردایەتییەکیش نییە.. بەڵکو وێنەی چینەکانی خوارو ناوەڕاستە کە مرۆڤایەتی خۆیان بەرزبکەنەوە بۆ بەرزترین ئاستێك کە ئەو چین و توێژانە پێی گەیشتن.

هەر لەم پێناوەدا ئایزوکرات Isocrates پێش دوو هەزار ساڵ لەبارەی ئەم شارەوە نوسیویەتی:

ئەتینا پێشکەوت و جیهان لەقۆناغەکانی بیرو گوزارشتکردندا دوای ئەو کەوت، تەنانەت فێرخوازەکانی ئەتینا بوونە مامۆستاکانی جیهان و ناوی یۆنان زەقبوویەوە نەك لەبەر نەژادێك لەنەژادەکان، بەڵکو بەهۆی توانای ژیریانەوە وەك چۆن ناوی یۆنان بووەتە ئاماژەیەك بۆ زانست نەك بەڵگەیەك لەسەر بنەڕەتی نەژادیی هاوبەش.[٢٣]

ئەتینا، پاش ئەوەش شارێکی بچوکەو ژمارەی دانیشتوانی چوارسەد هەزار کەس تێناپەڕێنی‌و دورترین شاری خۆرهەڵاتە کە لەناو شارەکانی تری یۆناندا پێگەیەکی باشی هەبێت، ئەو دەروازە بووە هاوڵاتیانی یۆنان لێوەی بەرەو شارەکانی ئاسیای بچوك دەردەچوون، هەروها لەرێگەیەوە شارە گەورەکان پرشنگەکانی شارستانی خۆیان پەخشدەکردەوەو رەوانەی وڵاتی یۆنانی پێگەیشتویان دەکرد.[٢٤]

---

23– دلیل بیرنز: سەرچاوەی پێشوو.. ل ٥٢–٥٣.

24– ولیم دیورانت: قصة الفلسفة من افلاطون الى جون دیوی" حیاة و آراء اعاظم رجال الفلسفة فی العالم، ترجمة الدکتور. فتح الله المشعشع، مکتبة المعارف، بیروت–١٩٧٢.. ل ٦.

دانیشتوانی ئەتینا بەسەر سێ چیندا دابەش دەبن، هەریەك لەو چینانە لەروی یاسایی‌و سیاسی‌و كۆمەڵاتییەوە لەچینەكانی تر جیاوازە كە ئەوانیش:[٢٥]

## ١. چینی كۆیلە

ئەم چینە بنەڕەتی ستراكتۆری كۆمەڵایەتی شاری ئەتینای پێكدەهێنا، رێژەی ئەم چینە سێیەكی كۆی دانیشتوانی ئەتینا پێكدەهێنێت و لەگەڵ ئەوەی هەر لەكۆنەوە لەناو هاوڵاتیانی وڵاتی یۆناندا سیستمی كۆیلایەتی بەسیفەتی ئەوەی كۆڵەكەیەكی ئابوریی گرنكە شتێكی دانپێدانراو بوو، كۆیلەكان لەمافی بەشداریی سیاسیش بێبەش بوون و ئەوان شتی بێگیان بوون و گشت مامەڵەیەكی كڕین و فرۆشتن و دواجار ئاڵوگۆڕو بەسوڕ وەرگرتنیان پێوە دەكرا.. سەرباری ئەمانەش كۆیلە خاوەنی كەسێتی یاسایی نییەو مافی ژنهێنان و خاوەندارێتی لێزەوتكراوەو دادگایش ناكرێت چونكە دادگایكردن لەگەڵ خاوەنەكەیدا دەكرێت و ئەمەش لەبەرئەوەی خاوەنەكەی بێجگە لەمافی ژیان" سەرپەرشتی گشت بوارەكانی ژیانی كۆیلە دەكات و بەرپرسە لەهەموو هەڵسوكەوتەكانی.[٢٦]

---

25– بڕوانە سباین: سەرچاوەی پێشوو.. ل ٢–٥ .
بارگر لەبەر رۆشنایی تێكڕای دانیشتوانی *ئەتینا* ژمارەی كۆیلەكانی بەهەشتا هەزار كۆیلە داناوەو بەم پێیە ئەگەر ژمارەی دانیشتوانی ئەتینا (بەگریمانە) سەدو شەست هەزار كەس بێت، ئەوا بەدوو كەس كۆیلەیەكیان بەر دەكەوێت..
بڕوانە:
- Barker,Ernest,Greek political theory. Methuenand Co, Ltd, Landon- 1960..P,, 35.

26– الدكتور ابراهیم احمد شلبی: سەرچاوەی پێشوو.. ل ٨.

سەرباری هەمو ئەمانەش ئەو بەرهەمەی لەرێگەی بازرگانیکردن و کارکردن بەکۆیلە بەدیدەهات بەچەشنێك بووە، کۆمەڵگای ئەتینای نەیتوانیوە دەستبەرداری بێت و هیچ شتێکیش نەبووە قەرەبوی ئەو زیانەی بۆ بکاتەوە.. تەنانەت ئەرستۆ بەکۆشش یان ئەو ماددەیان دەشوبهێنێت کە پەیوەستە بەکۆنترۆلکردنی رۆح و بەرهەم و بزاوتەکانیەوە.

کەواتە تیۆری سیاسی لەلای گریکەکان، دان بەسیستمی کۆیلایەتی‌دا دەنێت و خۆی تەسلیمی ئەنجامەکانی دەکات، ئەم مەسەلە هاوشێوەیە لەگەڵ ناوەڕۆکی سیستمی فیودالی کە بەڕاشکاویی دان بەدامەزراندنی چینە دەرەبەگایەتییەکان و دەرکەوتنی کۆیلەی زەوییدا دەنێت.

دەمێنێتەوە ئەوەش بڵێین" پرۆسەی بەکۆیلەکردن دەشێت بەیەکێك لەم فاکتەرانە کۆتایی پێ بهێنرێت:

مرۆڤی کۆیلە ئەگەر بتوانێت خۆی لەخاوەنەکەی بکرێتەوە، یان ئەو راسپاردانەی خاوەنەکەی جێبەجێبکات کە وەك مەرج بۆ ئازادکردنی دایناوە، یان خاوەنی کۆیلەکە لەژیانیدا ئارەزومەندانە کۆیلەکە ئازادبکات ویان دەوڵەت لەبەرامبەر خزمەت و کارێکی مرۆڤی کۆیلەدا ئەو ئەرکە لەئەستۆ بگرێت.[27]

## ٢. چینی بێگانە

ئەم چینە گشت ئەو هاوڵاتییە ئەتینایانە دەگرێتەوە کە نەخۆیان و نەباوکیان لەئەتینا لەدایك نەبون، پەروەردەی میتۆدە

---

27– هەمان سەرچاوەی پێشوو.. ل ٨٠.

زانستیی‌و پەروەردەییەکانی ئەتینا نین، تەنانەت ئەو کەسانەش کە بەرەچەڵەك دەگەڕێنەوە سەر ئەم چینە بەبێ هیچ جیاوازییەك چەمکی هەمان ئەو دابەشکرنە چینایەتییە دەیانگرێتەوەو بەپێی یاسا بەهاوڵاتی ئەتینا دانانرێن، سەرباری مافی بازرگانیکردن و ئازادییان هێشتا ئەندامەکانی ئەم چینە هاوشێوەی کۆیلەکان مافی بەشداریکردنی دیاردە سیاسیەکانی شاریان نەبووە، بەبێ ئەوەی ئەم بێبەشکردنە هیچ زیانێك بەپێگەی کۆمەڵایەتییان بگەیەنێت.

ژمارەی ئەندامەکانی ئەم چینە بە بەراورد لەگەڵ ژمارەی دانیشتوانی ئەتینا رێژەیەکی زۆری دانیشتوانی پێکهێناوە بەهۆی ئەو جموجۆڵە بازرگانییە گەورەی لەئەتینا هەبووە.[٢٨]

### ٣. چینی هاوڵاتیانی ئازاد

تەنیا چینێکە مافی بەشداریکردنی هەیە لەژیانی سیاسی گشتیی شاردا، ئەندامەکانی ئەهلییەتی ئەوەیان هەبووە پۆستە گشتییەکان لەئەستۆ بگرن و شەرەفی ئەوەشیان هەبووە بەشداریی لەسوپاو سەرکردایەتی کردنیدا بکەن، وەرگرتنی پۆستە گشتییەکان و بەشداریی لەوەرگرتنی ئەرکەکانی دەوڵەت جۆرێك بووە لەرێزو شەرەف بەهاوڵاتی ئەتینا بڕاوە کە نەدەگەڕا بەدوای مافە یاسایی و

---

28- ژمارەی بێگانەکان لەئەتینا بەنزیکەی چل و پێنج هەزار گەنج دادەنرێت و ئەگەر منداڵەکانیانیشی بچێتەسەر ژمارەکە دەگاتە (٩٠) هەزار کەس، بڕوانە:
- Barkre,op.cit p35

بۆ زانینی بیروڕای پێچەوانە بڕوانە:
- أ. هـ. م، جونز: الديموقراطية الاثينية، ترجمة الدكتور عبدالمحسن الخشاب، الهيئة المصرية العامة للكتاب، القاهرة-١٩٧٦.. لا ١١٨.

دەستورییەکانی خۆیدا، بەئەندازەی ئەوەی مەبەستی بووە شەرەفی جێبەجێکردنی ئەرکەکانی کۆمەڵگاکەی پێ ببڕێت.[٢٩]

بەمشێوە نازناوی هاوڵاتی ئیمتیاز بووە کە ئەندامێتی بەخاوەنەکەی لەشاردا دەبەخشێت و سازیدەکات بۆ بەشداریکردن لەچالاکی سیاسیو ژیانی گشتیدا، ئەم ئەندازەیە لەبەشدار بوون هەندێکجار ئامادە بوونی کۆبونەوەکانی شاری تێنەپەڕاندوە، بەتەنیا ئامادەبونی هاوڵاتی لەکۆبونەوەی شاردا" کۆبونەوەیەك کە گرنگییەکەی بەگوێرەی ئاستی دیموکراسی پراکتیزەکراوی ناو ئەو کۆمەڵگە دەگۆڕێت و هەندێکجار دەسڵاتی لەئەستۆگرتنی پۆستە گشتییەکانی لەخۆگرتوە، بۆیە ئەرستۆ لەو بڕوادایە دەسڵاتەی لەئەستۆگرتنی ئەرکەکانی سوێندخۆران باشترین پێوەری خەسڵەتی هاوڵاتی بوونەو تێبینی دەکرێت ژمارەی ئەو پۆستانەی کە دەشێ هاوڵاتی لەئەستۆیان بگرێت بەگوێرەی ئاستی دیمکراتییەتی پیادەکراو گۆڕانکاریی بەسەردا هاتوە.

پێویستە ئەوەش لەبەرەچاو بگیرێت" نازناوی هاوڵاتیبون سەبارەت بەکەسێکی گریکی مانای بەشداری نەکردن و پشك نەبوون (بەئەندازەیەکی دیاریکراو) نییە لەژیانی گشتیدا، لەکاتێکدا هاوڵاتیبون لەسەردەمی نوێدا بەمجۆرە نییەو دەوڵەتی نوێ هاوڵاتی دەکاتە کەسێك کەبەگوێرەی یاسا کۆمەڵە مافێکی بنەڕەتی هەیە، ئەم بارودۆخە بەلای رۆمانەکانەوە بە بەراورد لەگەڵ گریکەکان ئەگەری قبوڵکردنی زیاتر بووە کە بەلایانەوە گرنگ نەبووە تاك چۆن مافە

---

29- الدكتور. علی احمد عبدالقادر: تطور الفكر السياسي: سەرچاوەی پێشوو.. ل ١٣.

کەسییەکانی خۆی دەستەبەردەکات، بەڵکو چۆن مرۆڤ بتوانێت پێگەیەکی چاك بۆ خۆی مسۆگەر بکات.[30]

نازناوی هاوڵاتیبون بەشێوەیەکی گشتی لەئەتینا بەدەستەبەربونی دوو مەرج دەدرایە هەر کەسێکی ناو شارەکە:

١. باوك و دایکی بەرەچەڵەك خەڵکی ئەتینا بن.

٢. تەمەنی گەیشتبێتە هەژدە ساڵ، وناوەکانیان لەتۆماری ئامادەکراو بۆ ئەو مەبەستە لەیەکەم ساڵی لەدایکبونیاندا تۆمار کرابێت، هاوکات لەگەڵ گەیشتن بەتەمەنی شانزە ساڵ لێکۆڵینەوە لەسەر ئەو تۆمارکردنە دەکرێت و بەپێی ئەم یاسایە ئەو کەسانە کە لەدایك و باوکی ئەتینایی نین بەهاوڵاتی دانانرێن، هەروەها ئەوانەش لەدایك و باوکی ئەتینایین بەڵام لەساڵی یەکەمی لەداکبونیاندا لەو تۆمارەدا تۆمار نەکراون یان بەهەر هۆیەکەوە بێت ناوەکەی لەتۆمارەکە کەوتبێت و نەیتوانی بێت  بیسەلمێنێت لەگەڵ ئەو کەسانەی کە لەدایکێکی بێگانە یان بەبێ هاوسەرگیری لەدایکبووە.[31]

لەگەڵ ئەوەشدا مەرجەکانی هاوڵاتیبون هەندێکجار چاوپۆشی لێکراوە" بۆ نمونە سۆلۆن بڕیاریدا ناسنامە بەهەموو ئەو بێگانانە بدرێت کە کۆمەڵە مەرجێکی دیاریکراویان تێدا فەراهەم بووە، بەڵام ئەم ڕێوشوێنانە پاش ماوەیەکی کەم هەڵدەوەشێنرایەوەو، لەسەدەی پینجەمی پێش زایین بەهۆکاری کەسی یان وەك پاداشت لەبەرامبەر خزمەتی سەربازیی یان ئابوریی هەندێکی حاڵەتی ناسنامەی

---

30- بڕوانە سباین: سەرچاوەی پێشوو.. لا٥.

31- بڕوانە: الدكتور. ابراهيم احمد شلبى: سەرچاوەی پێشوو.. لا ٧٨.

هاوڵاتی پێبەخشین رویداوە، لەم حاڵەتانەدا ئەوانەی کە ناسنامە نوێیەکەیان وەرگرتبوو جگە لەخاوەنداریێتی ناسنامەیەکی نوێ، ناسنامە کۆنەکانی خۆشیان بۆ دەمایەوە.[٣٢]

ئەم رونکردنەوەیەی دابەشبونی چینایەتی کە لەئەتینا باو بووە، هانمان دەدات لەوەی پرسیار لەبارەی رێکخستنە سیاسیەکانی شارەکە بکەین، بەواتایەکیتر" ئەو دامەزراوە سیاسیانەی لەناو ئەو کۆمەڵگەدا هەبوون.

لەم بوارەدا دەشێت بوترێت دامەزراوە سیاسیەکان، ئەوانەی مۆرکیان بەسەر ژیانی سیاسیانەی ئەتیناوە هەبووە بریتیی بون لە:

**١. کۆمەڵە . کۆنگرەی گشتیی** – Assembly or Ecclesia

دیموکراسییەتی ئەتینایی پێکهاتەکانی خۆی لەناو رێکخستنە حکومەتییە ناوازەکاندا دەبینێتەوە ، لەوانە: کۆمەڵە یان کۆنگرەی گشتی، ئەم کۆمەڵە یان کۆنگرەی گشتیی ئەو هاوڵاتیانەی ئەتینا دەگرێتەوە کە نێرینەن و تەمەنیان لەنێوان هەژدە بۆ بیست ساڵیدایەو بریتییە لەکۆبونەوەیەکی گشتیی لانی کەم ساڵانە دە جار سازدەدرێت.[٣٣]

هەروەها کۆبونەوەی نائاسایی لەسەر داوای ئەندامانی کۆمەڵەکە بۆ بۆنە تایبەتەکان سازکراوە.

بڕیارەکانی ئەم کۆمەڵە بەتەواوی لەو بڕیارە نوێیانە دەچێت کە لەلایەن دەسڵاتی گشتییەوە دەردەچوێنرێن و ئەو بڕیارانەی بونی

---

32– هەمان سەرچاوەی پێشوو.. ل ٧٩.

33– بۆ زانینی بیروڕای بەرامبەر بڕوانە: جونز: سەرچاوەی پێشوو.. ١٦٣.

سیاسی خۆیان لەگەڵەوە وەردەگرن، بەڵام بەمانای ئەوە نا ئەم کۆنگرە بەکرداریی کاروبارە یاساییە گشتییەکانی بەڕێوەبردبێت یان دەبوو بەو ئەرکانە هەستێت یان لەلایەن و هۆیەکانی بکۆڵێتەوە.. دیموکراسی راستەوخۆ بەواتای فەرمانڕەوای لەڕێگەی گشت گەل ئەفسانەیەکی سیاسییە وەك لەوەی جۆرێك بێت لەسیستمەکانی حوکمڕانی، سیستمی کۆمەڵە یان کۆنگرەی گشتی لەسەرجەم شارەکانی یۆناندا پەیڕەوی لێکراوە: ئیتر شارە دیموکراتەکان بێت یان ئەرستۆکراتەکان و رێژەیەکی کەم لەدەسەڵاتی کرداریی بەدەستەوە بووە.[٣٤]

خەسڵەتەکانی کۆمەڵە یان کۆنگرەی گشتی بریتی بوو لە: دانانی یاساو دامەزراندنی دادوەرو لێپرسینەوەی بەرامبەر کردەوەکانیو چاودێریکردنی فەرمانبەران و بڕیاردان لەمەسەلەکانی شەڕو ئاشتیو گرێدانی رێکەوتننامەو چاودێری خەرجکردنی بودجەو دانانی باج و هەموو ئەو بابەتانەی تایبەت بوون بەکاروباری گشتییەوە، بەواتایە کە زۆرینەی دەسەڵاتە باڵاکانی دەوڵەت بەشێوەیەکی دەستوریی لەناو ئەو کۆمەڵەیەدا کۆبونەتەوە لەوانە: دەسەڵاتی یاسادانان، چاودێریکردنی سیاسەتی دەرەوەو چاودێریکردنی دەسەڵاتی جێبەجێکردن،[٣٥] کەچی ئەم دەسەڵاتانە لەشارە نادیموکراتەکاندا بەرەو پوکانەوە دەڕۆشتن وکۆبونەوەکانی رێکخراوەکەش لەو شارانەدا دەگمەن بووەو بڕیارەکانیشی زیاتر مۆرکی راوێژکاریی پێوەدیار بوو.

---

34- بڕوانە سباین: سەرچاوەی پێشوو.. لا ٦.

35- Harmon. Op, cti.. p 21.

چاودێریکردنی فەرمانبەران لەلایەن کۆمەڵە یان کۆنگرەی گشتییەوە چۆنێتی ئەو ڕێگایانەمان بۆ ڕوندەکاتەوە کە تیایدا بۆ ئەو پۆستانە هەڵبژێردراون: هەر پۆستێك لەئەتینا دراوەتە دەست دەستەیەکی (١٠) کەسی کە هەریەکەیان نوێنەرایەتی هۆزێکی ناو دە هۆزەکەی ئەتینای دەکردو ئەمانە لەلایەن بەشی بەڕێوەبردنی سەد کەس Demes یەوە دیاریدەکران کە شاری ئەتینای لێ پێکهاتبوو، لەڕێگەی دەنگدانەوە چاکترینیان دیاریدەکراو لێرەدا خەسڵەتی بیری سیاسی یۆنانی تێبینی دەکەین: لەئەستۆگرتنی پیشەو ئەرك شەرەفە بۆ گشت هاوڵاتییەکی ئەتینایی‌و بۆئەوەی هەل لەبەردەم گشت هاوڵاتیانی وڵاتدا بڕەخسێت" هاوڵاتی لەهەموو ژیانیدا تەنیا یەکجار مافی لەئەستۆگرتنی ئەرکی گشتی هەبوو، بەڵام ئەم خاڵە دە پۆستەکەی جەنەراڵە سەربازییەکان نەدەگرتەوە کە بەئەنجومەنی سەرکردایەتی ناسراوەو ئەو کەسانەی کە خاوەن لێهاتویی‌و لێوەشاوەیی دیاریکراون ڕێگە دەدرێت بۆ ماوەیەکی زیاتر لەپۆستەکانی خۆیاندا بمێننەوە،[36] لەدیارترین نمونەکانی ئەتینا لەسەر ئەم حاڵەتە لێوەشاوەیی‌و کارامەیی سەرکردەی ئەتینایی پێریکلیس Periclesە کە کارامەیی ئەو لەبواری سەرکردایەتیکردندا جێگەی متمانەو ڕێزی هەموان بووە.

---

[36]– سەبارەت بە(دە) سەرکردە سەربازییەکە بڕوانە: سباین: سەرچاوەی پێشوو.. لا ٧.. هەروەها:

- Barkar, op, cty..p 41.

## ٢. ئەنجومەنی پێنج سەدی

-The Council of five hunderd

ئەنجومەنی پێنج سەدی بەلیژنەی مەرکەزیی کۆمەڵە یان کۆنگرەی گشتی دادەنرێت و بریتییە لەدەزگای حکومەتی هەمیشەیی کە لەنێوان خولەکانی کۆبونەوەی کۆمەڵەکەدا کاردەکات و لەکاتی سازدانی دانیشتنەکانیدا چالاکییەکانی ئەو جەستە سیاسییە بەڕێوەدەبات، ئەنجومەنی پێنج سەدی لەپێنج سەد کەس پێکدێت کە ئەوانیش نوێنەراتی هەر دە هۆزی شاری ئەتینا دەکەن و ماوەی ئەندامێتی تیایدا تەنیا یەك ساڵە.

لەبەر قورسی پێسپاردنی سەرپەرشتیکردنی دەزگا ئیدارییو جێبەجێکارییەکانی دەوڵەت لەلایەن گشت ئەندامەکانی ئەنجومەنەوە، هاوڵاتیانی ئەتینا لەسەر ئەوە رێکەوتون سەرپەریشتیکردنەکە لەنێوان ئەندامانی ئەنجومەنەکەدا بەنۆرە بێت و بۆ هەر نۆرەیەك کۆمەڵێك کە لەوانەیە پەنجا کەس بێت ئەو ئەرکە لەبری دە هۆزەکەی ئەتیناو بۆ ماوەیەکی دیاریکراو کە دەکاتە سیو شەش رۆژ بۆ هەر هۆزێك، لەئەستۆ دەگرن و لەنۆرەی هەر هۆزێکدا نوێنەری هۆزەکانی تریش بەشداریی پرۆسەکە دەکەن، بەمەش ژمارەی لیژنەکە دەگاتە پەنجاو نۆ کەس و لەناو ئەم کۆمەڵەدا ئەندامێك وەك سەرۆکی لیژنەکە دیاریدەکرێت کە تەنیا یەك رۆژ فەرمانڕەوایی ئەتینا دەکات و ئەو رۆژە هەرگیز دوبارە نابێتەوە.

لێپرسراوێتییەکانی ئەنجومەنی پێنج سەدی لەدەسڵاتی یاسادانانندا کورت دەبێتەوە، بەجۆرێك پێشنیاری یاساکانی دەکردو دەیخستنە بەردەم کۆنگرەو سەرپەرشتی دەسڵاتی جێبەجێکردنیشی

دەکرد کە بریتییە لەچاودێریکردنی جێبەجێکردنی پرۆژەکانی دەوڵەت و یاساکانیو کارە کارگێڕییە ڕۆتینییەکانی، هەروەها ئەنجومەنەکە ئەرکی پەیوەندیکردن بەدەزگا سیاسییە بیانیەکان و جێبەجێکردنی فەرمانی دادگا لەئەستۆ دەگرت، ئەگەرچی لەهەندێك لەکێشە تایبەتەکاندا خۆی دادگا پێکدەهێنێت و لەیەککاتدا بڕیاردەرو جێبەجێکاریش دەبێت،[٣٧] .. هەروەها ئەنجومەنەکە سەرپەرشتی کۆکردنەوەی باج و چاودێری کارگێڕی دارایی دەوڵەت دەکات، ئەنجومەن بەگوێرەی ئەم واقیعە" تێکەڵەیەك لەهەرسێ دەسڵاتی یاسادانان و جێبەجێکردن و دادوەریی دروست دەکات و زۆر بەکارایی بەکاریان دەهێنێت.[٣٨]

سەرباری ئەم دەسڵاتە فراوانە، هێشتا ئەنجومەنە پێنج سەدییەکە لەژێر ڕکێفی کۆمەڵە یان کۆنگرەی گشتیدا دەبوو:

کۆمەڵەکە دەیتوانی پێشنیازەکانی ڕەتبکاتەوەو مەسەلەکانی یاسادانان و جێبەجێکردن و دادوەرییە گرنگەکان پێویست بوو بخرێتە بەردەم کۆمەڵە، هیچ شتێك نەبوو بەر لەکۆمەڵە بگرێت لەهەر گۆڕانکارییەك کە بەسەر پێشنیار یان پرۆژەکانی ئەنجومەنی پێنج سەدیدا دەیهێنا، سەرباری هەموو ئەمانەش مەسەلەکانی تایبەت بەسەلامەتی دەوڵەت: ڕاگەیاندنی شەڕ، کاروبارەکانی ئاشتی، درێژکردنەوەی یاساکان و سەپاندنی باجی نوێ دەچوونە ڕێزبەندی دەسڵاتەکانی کۆمەڵەوەو لانی کەم لەلایەنی شکلیەوە.[٣٩]

---

37- بڕوانە" جونز: سەرچاوەی پێشوو.. لا ٨.

38- Harmon, op, cti.. p 23.

39- بڕوانە: الدکتور. علی احمد عبدالقادر: سەرچاوەی پێشوو.. لا ٢٠.

## ٣. دادگاکان

دادگاکانی ئەتینا لەرێگەی هەڵبژاردنی هەر یەکەیەك لەناو سەد یەکە کارگێڕییەکەی ئەتینا بۆ شەست کاندید کە نوێنەرایەتی دەکەن لەدەزگا دادەوەرییەکاندا، دادەمەزرێت و لەنێوان شەش هەزار ئەندامدا لەرێگەی ناوپراکێشانەوە ئەو جێگایانە دیاریدەکرێت کە ئەندامەکان کاری تێدا دەکەن و ئەو مەسەلانەش کە دەچنە بواری پسپۆڕی ئەو ئەندامەوە، ژمارەی ئەندامانی دادگا لەنێوان ٢٠١ بۆ ٥٠١ ئەندام دایە، ئەو کەسەی دەبێتە ئەندامی دادگا پێویستە کەسێکی دانا و بەناوبانگ و تەمەنی لەخوار سی ساڵییەوە نەبێت.

ئەندامەکانی دادگا دوو خەسڵەتیان هەبوو: خەسڵەتی سوێندخۆران و خەسڵەتی دادوەر **Jude and Juries** ئەگەر دەستەکە بەسیفەتی سوێندخواردن کۆبوۆوەو بڕیاری بێتاوانی تۆمەتبارێکی دا مەسەلەکە بەکۆتایهاتوو دادەنرێت، بەڵام ئەگەر حوکمەکەی سوێندخۆران تاوانباری کەسی تۆمەتباری سەلماند لەم بارەیاندا دەستە بەسیفەتی دەستەی دادوەران کۆبونەوەکەی ئەنجام دەداو حوکمی دادگا حوکمێکی بنەبڕی بێ بواری تانەلێدان یان تێهەڵچونەوە دەبێت.[٤٠]

---

40- شتێکی لۆژیکییە مادام دادگاکانی یۆنان بەناوی گشت گەلەوە کارو دادوەریی دەکەن، هەرگیز وەک دەزگایەکی دادوەریی کارییانەکردوە، بەڵکو هەمیشە وەک گوزارشتکەر لەگشت گەلی ئەتینا مامەڵەی لەگەڵ مەسەلەکاندا کردووەو بەمەش فەرمانی دادگا بۆ دادگایەکی تر باڵا پایەبڵند نەبوو، لەبەرئەوەی هەردووکیان لەکارەکانیاندا هاوشێوەی ئەنجومەنی گەل نوێنەرایەتی گەل دەکەن و هەریەکەیان خۆی بەگەل دەزانێتو لێرەوە دادگاکان بوونەتە ئامرازی پتەوکردنی چاودێری گەل و سەرپەشتیکارانی بەسەر کارمەندو خودی یاساشەوە، بڕوانە: سباین: سەرچاوەی پێشوو.. ل ١٠-١١.

دادگاکانی یۆنان مافی ئەوەیان هەبووە دەست لەکاروباری فەرمانبەرانی کارگێڕی وەربدەن و سەرپەرشتی هەڵسوکەوتەکانیان لەرێگەی پێداچونەوەی کارەکان و مامەڵە داراییەکانیان پاش تەواوبونی ماوەی خزمەتیان بکەن، هەروەها دەیتوانی هاوکات لەگەڵ دامەزراندنی فەرمانبەراندا بڕیاری لەسەر لێوەشاوەییان بدات، ئەوەندە هەیە ئەم هەڵسەنگاندن و چاودێرییە جەنەڕاڵەکانی سوپا ناگرێتەوە چونکە ئەمان سەرلەنوێ بواری هەڵبژاردنەوەیان هەیەز ئازاد بوون لەچاودێریی هەر هیچ نا بۆ ماوەیەکی زیاتر لەماوەی چاودێری فەرمانبەری ئاسایی.

چاودێریی دادگاکان فراوان دەبێت و یاساو بڕیارەکانی ناو دادگاش لەخۆدەگرێت، بەجۆرێك هاوڵاتی ئەتینا مافی ئەوەی هەیە خودی یاساش دادگایی بکات و تانە لە بەتاڵکردنی یاسایەکی دیاریکراو بدات و ئەم تانەیە لەتوانایدا بووە کارکردن بەو یاسایە رابگرێت تا دەرچونی بڕیاری کۆتایی دادگا لەوبارەوە.

چەسپاندنی ئەم مافە بەشێوەیەکی ناراستەوخۆ دەسڵاتێکی تر بۆ دادگاکان زیاد دەکات کە دەسڵاتی یاسادانانە، ئەم دادگایە لەتوانایدایە کارکردن بەبەیاسایەك رابگرێت یان هەمواری بکات، ئەو دادگایە مافی چاودێری دەستوریی یاسا تێدەپەڕێنێت و لەجێگەیدا دەسڵاتی یاسادانانی دەکەوێتە دەست.. لەوانەیە ئەم دیاردەیە لەهیچ یەکێك لەدەوڵەتە شارەکانی تری گریکدا دوبارە نەبوبێتەوە.

بەرفراوانبونی دەسڵاتی دادگاکان، بەمانای ئەوە دێت دەسڵاتی خۆیان تێپەڕاندوە، کە بریتییە لەمامەڵکردن لەگەڵ کێشەی تاکەکسدا، جا ئەو کێشەیە مەدەنی بێت یان تاوانکاریی، بۆ مومارەسەکردنی کۆمەڵە دەسڵاتێکی تر کە زیاتر لەدەسڵاتەکانی یاسادانان و

جێبەجێکردنەوە نزیکترن وەك لەدەسڵاتی دادوەرییەوە: ئەم دامەزراوانە سەرباری ئەوەی دیاردەیەکی درێژکراوەی چادێری گەلن بەسەر دادوەرو یاساکانەوە، کەچی گەیشتونەتە پێگەیەکی ئەوتۆ کەهیچ دامەزراوەیەکی دادوەریی لەئێستادا ناتوانێ بگاتە ئەو پلەوپایەو تەنانەت لەهیچ حکومەتێکی شارستانیدا.[41]

بەمشێوە بەشداریی راستەقینەی ژیانی سیاسی لەدەوڵەتی ئەتینا رێگەخۆشکەر بووە تاکو دەستێوەردانێکی وەزیفی لەدەزگاو دامەزراوەکانیدا بکات، بەچەشنێك هیچ یەکێك لەسێ دامەزراوەکە: کۆمەڵە، ئەنجومەنی پێنج سەدی، دادگاکان، قۆرخ نەبون بۆ یەکێك لەدەسڵاتەکانی: یاسادانان، جێبەجێکردن یان دەسڵاتی دادوەریی.. بەڵکو بەچەندین شێوەو لەچەندین رووە تێکەڵ بەیەکتر بوبون، خۆ ئەگەر رۆشنبیری گشتیو خێرخوازیی لەژیانی هاوڵاتیدا تەنیا دوو مەرجی بەشداریی ئەوانیش لەژیانی گشتی دەوڵەتداو بەبێ پسپۆڕییو مەشقکردن و فێربونی وەزیفەیەکی دیاریکراو، دەبینی ئەو تێکەڵییە شتێکی ئاساییە، لەئەتینا گرنگ ئەوەیە رەگەزی بەشداریی لەگشت چالاکییەکانی دەوڵەتدا بهێنرێتەدیو لەسەر بنەمای ئەو بەشدارییە هەڵسەنگاندن بۆ هاوڵاتی و مافەکانی لەبونیاتنانی کۆمەڵگەی هاوڵاتیاندا دەکرێت.[42]

---

41– هەمان سەرچاوەی پێشوو.. ل ١٠.

42– دکتور. علی احمد عبدالقادر: سەرچاوەی پێشوو.. ل ٢٢.

# سپارتە

بۆ ئەوەی زیاتر لەبارەی ئەفلاتۆنەوە بزانین، بەڵکو بۆئەوەی زیاتر لەگشت فەیلەسوفەکانی تری یۆنانی تێبگەین، پێویستە لەپێشدا شتێك لەبارەی سپارتەوە بزانین، ئەم شارە کاریگەری دوو لایەنەی لەسەر بیری یۆنانی هەبوە" کاریگەرییەك کە زادەی راستییەکانە و کاریگەرییەکی تر کە لێکەوتەی وێنە خەیاڵییەکانە.. هەر کاریگەرییەکیان مەترسی خۆی هەیە: راستییەکان ئەوەیە کە یارمەتی سپارتەی دا تاکو تواني لەشەڕدا بەسەر ئەتینادا سەربکەوێت، هەرچی وێنە خەیاڵییەکانە هێندە کاریگەری لەسەر ئەفلاتۆن دروستکردبوو هانیدا تیۆرە سیاسیەکانی خۆی بنوسێتەوەو دواتر کاریگەریی لەسەر ژمارەیەکی بێپایان لەنوسەران بەجێهێشت، کاتێك تیۆرە سیاسیەکانی خۆیان دارشتوەتەوە.[٤٣]

سپارتە لەنەریتی کۆمەڵگەکانی یۆنانی کۆنی سەبارەت بەپەیوەست بوون بەیاساکانی نوێنەرایەتیکردن لەرێکخستنە سیاسیەکان دەرنەچوو، ئەو رێکخستنە سیاسیانەی کەوا کاروبارەکانی فەرمانرەوایی‌و کارگێڕییان لەئەستۆ دەگرت، دەستوری شار تێکەڵەیەك بوو لەنێوان ئەو گیانە سەربازییەی کە بارودۆخی

43- برتراند راسل: تاریخ الفلسفة الغربیة، کتاب الاول" الفلسفة القدیمة، ترجمة: الدکتور. زکی نجیب محمود، لجنة التألیف و الترجمة و النشر، القاهرة-١٩٦٧.. ل١٦٠..

هەروەها دەتوانی بەراوردی بکەیت لەگەڵ:

-Barker, Sir Ernest: The political tought of plato and Aristotle, Dovre Publications, INC., N.Y., 1956, P. 14.

سیاسی سپارتەو مامەڵەکردنی لەگەڵ دراوسێکانیدا دەیخواست و لەنێوان هەوڵی بەدیهاتنی پشتگیریی‌و رەزامەندنی لەلای گەلێکی جەنگاوەری جدیی.

**کۆمەڵگەی سپارتە هاوشێوەی کۆمەڵگای ئەتینا بەسەر سێ چینی بنەڕەتیدا دابەشدەکرێت:**[٤٤]

کۆیلەکان Helots ستراکتۆری پێکهاتەی کۆمەڵایەتی لەروی پێگەو شوێنەوە، ئەوانەی گشت کارە دەستییەکان بەئەنجام دەگەیەنن، بێ ئەوەی لەمەدەنیەت یان لەمومارەسەکردنی کاری سیاسیی بەهرەمەند بن.. چینی بازرگانی مامناوەند Perioiko کە خاوەنی مافە مەدەنییەکان بوون، بەڵام لەمافە سیاسییەکان بێبەش کرابوون.. هاوڵاتیانی سپارتە partiansor Dorians کە بەرەچەڵەك دەگەڕێنەوە سەر جەنگاوەرە تاڵانبەرەکان و گشت ژیانی سیاسی‌و چالاکییە سەربازیی‌و سیاسییەکانیان بۆ خۆیان قۆرخ کردبوو، جگە لەو کارانە هیچ کارو پیشەیەکی تریان نەبوو.

سەبارەت بەسیستمی فەرمانڕەوایی، سیستمی فەرمانڕەوایی سپارتە سیستمێکی جیاوازەو سەرەتاکانی دەگەڕێتەوە بۆ ناوەڕاستی سەدەی پێنجەمی پێش زایین و لەسەر بنەمای: دوو پاشاو ئەنجومەنی پیران و کۆمەڵەی گشتی گەل و ژمارەیەك

---

44- لەمەڕ ئەم بوارانەوە بڕوانە: الدکتور. علی احمد عبدالقادر: سەرچاوەی پێشوو.. ل ٢٤-٢٦. هەروەها تەماشای ئەم سەرچاوەش بکە:

-Gettell, Raymond G, op. cit, p.37.

لەراوێژکاران بەندبوو،[45] بەکورتی لەبارەی ئەم دامەزراوە سیاسیانەوە دەدوێین:

### ١. سیستمی دوو پاشا

ئەم سیستمە بەتەنیا لەسپارتە پیادەکراوە، تیایدا دوو پاشا کە بەرەچەڵەك لەدوو خانەوادەی جیاوازن و بەمیرات پاشایەتیان بۆ ماوەتەوە، بەشێوەیەکی یەکسان فەرمانڕەوایی وڵات دەکەن" هەردوو پاشا لەکاتی جەنگدا سەرکردایەتی سوپا دەکەن و لەڕایکردنی کارەکانی جەنگەکەو ڕێوشوێنەکانی دانوستان پشت بەکۆمەڵێك راوێژکاریان دەبەستن، وەك چۆن هەردوو پاشا رابەرایەتی سروتە ئاینییە فەرمییەکانی دەوڵەت دەکەن و پێکەوە چارەسەری ئەو کێشەو گرفتانە دەکەن کە دەکەوێتە نێوان میرو نۆبەلاکانەوە، بەڵام لەکاتی ئاشتیدا دەسڵاتی هەریەکەیان سنوردار دەبێت.

### ٢. ئەنجومەنی پیران - The Senate

ئەم ئەنجومەنە سەرباری هەردوو پاشاکە بیست و هەشت ئەندامی تری چینە ئەرستۆکراتەکان لەخۆدەگرێت کە لەلایەن گەلەوە بۆ هەتاهەتایە هەڵدەبژێردرێن، ئەندامەکانی ئەم ئەنجومەنە نابێت تەمەنیان لەخوار شەستساڵەوە بێت و ئەرکەکانی ئەنجومەنەکە بریتییە لەیەکلاکردنەوەی مەسەلەکانی تاوان و ئامادەکردنی کارنامەو پرۆژەکانی کۆمەڵەی گشتیو تاوتوێکردنی ئەو پرۆژانەی دەخرێنە بەردەم ئەو کۆمەڵەیەو ئەنجامدانی ئەرکە کارگێڕییە

45- Ibid.

رۆتینەکان لەڕایکردنی کاروبارەکانی دەوڵەت و سەرپەرشتیکردنی چالاکی بازرگانی.

### ٣. کۆمەڵەی گشتی گەل - Assembly

ئەم ئەنجومەنە لەگشت هاوڵاتیانی شاری ئەسبەرتە پێکدێت، بەشێوەیەکی بەردەوام هەموو مانگێك کۆدەبێتەوەو هەروەها لەحاڵەتە کتوپڕو نالەبارەکانیشدا لەسەر بانگێشتی ئەو راوێژکارانەی کە دەسڵاتی سەرۆکایەتیکردنی ئەو کۆمەڵەیەیان هەیە کۆدەبێتەوە، کۆمەڵەی گشتی گەل لەبری هەمو گەل هەڵدەستێت بەکاندیدکردنی هەموو ئەو کەسانەی کە پۆستە گشتییەکانی دەوڵەت وەردەگرن و هەروەها پەسەندکردنی بڕیاری جەنگ و بەرقەرابونی ئاشتیو یەکلاکردنەوەی ئەو کێشانەی روبەڕوی مەسەلەی سەرۆکایەتی دەبنەوە.

### ٤. راوێژکاران Ephors

بەتەنیشت سێ دامەزراوەکەی ترەوە لەفەرمانڕەوایی دەوڵەتە شاری سپارتە دامەزراوەی چوارەمیش هەبووە کە تایبەت بووە بەم دەوڵەتە، راوێژکاران کە لەپێنج راوێژکار پێکدێت پاش کاندیدکردنیان لەلایەن ئەنجومەنی پیرانەوە بەدەنگدانی راستەوخۆ بۆ ئەو پۆستە هەڵدەبژێردران.

دامەزراوەی راوێژکاران دامەزراوەیەك بووە مەبەست لێی پاراستنی دروستکردنی هاوسەنگیی بووە لەگەڵ دەسڵاتەکانی هەردوو پاشادا.[٤٦]

---

46- بوتراند راسل: سەرچاوەی پێشوو.. لا ٦٥.

هەموو مانگێك هەردوو پاشا سوێندی یاسایییان دەخوارد کە پارێزگاری لەدەستور بکەن و لەبەرامبەریشدا راوێژکارەکان سوێندیان دەخوارد کە لایەنگرو پشتیوانی هەردوو پاشا بن مادام ئەوان سوێندیان خواردوە پابەندی دەستور بن و پارێزگاری لێبکەن.

دامەزراوەی راوێژکاران وەك دادگایەکی مەدەنی باڵا دەسڵاتی ئەوەی هەیە لەروی تاوانکارییەوە دادگایی پاشاکان بکات و بانگێشتی کۆمەڵەی گشتی گەل بکات بۆ کۆبونەوەو بەدواداچونی بڕیارەکانی بەمەبەستی دڵنیابونەوە لەجێبەجێکردنی ئەو بڕیارانە، وەك ئامادەبون لەکۆبونەوەکانی ئەنجومەنی پیران و هەندێکجار سەرۆکایەتی کردنی دانیشتنەکانی.

بەکورتی پێویستە راوێژکاران لەناوخۆو دەرەوەی وڵات پارێزگاری لەسیستمی دەوڵەت بکەن، لەدەوڵەتی سپارتە دەسڵاتی راوێژکاران گەشتبووە ئەو ئاستەی پۆلیسی نهێنی دابمەزرێنن بۆ چاودێریکردنی فەرمانبەرەکان و جێبەجێکردنی بڕیارەکانی دەوڵەت، لەلایەکی دیکەوە سیخوڕەکانیان دەنارده شارەکانی دەوروبەر بۆ وەرگرتنی هەواڵ و زانیاری و پاراستنی سپارتە لەهەر هێرش و پەلامارێکی دەرەکی.

سەبارەت بەژیانی گشتی لەسپارتەدا وەك ژیانی سەربازیی بووەو، هاوڵاتی سپارتە جگە پیشەی جەنگاوەریی بۆ ئەو جەنگانەی کە هەر لەمنداڵیەوە خۆی بۆ ئامادە دەکرد هیچ پیشەیەکی تری نەبووە، ئەمەش لەبەرئەوەی سەرەك هۆزەکان بەشوێنی بەرواری لەدایکبونی ئەندامانی هۆزەکەی خۆیاندا دەگەڕان، تا ئەوانەی کەمئەندامن یان دوچاری نەخۆشی بوون فڕێبدرێنە بیابان.

ئـەو كەسـەی بـەهێز نەبوایـە لەناویانـدا جێگـەی نەدەبویـەوە، کوڕەکـان بەکۆمـەڵ لەقوتابخانەیـەکی هاوبەشـدا تـا تەمـەنی بیسـت ساڵی پێکەوە دەژیان، ئامانج لێی ئامادەکردنی پیاوی بەهێز بووە کە گـوێ بـەئازارەکان نـادات و ملکەچـی ڕێسـاکانی حکومـەت دەبێـت، تاتەمەنی سی ساڵی خزمەتی سەربازیی ڕاستەقینە دەستپێدەکات و بوونـە ئەنـدام لەیانـە یـان لەسـەربازگە Dining Messes or lubs دەبووە کارێکی زۆرەملێ، بەڵام پاش تەمەنی سی ساڵی ئەو کوڕانە دەبوونـە هاوڵـاتی تـەواو لێهـاتو، بـەو پێیـەی ئەمانـە ناسـنامەی سپارتەیان هەیـەو بـەپێی پرۆگرامـەکانی دەوڵـەت مەشـقیان کـردوەو فێرکراون و پلەی ئەندامێتیان لەیانەو سەربازگەکانیدا وەرگرتوە.

بـەگوێرەی یاسـاکانی سـپارتە هاوڵـاتی مـافی بازرگـانیکردن و فێربـونی هـیچ پیشـەیەکی نـەبووە.. هاوڵـاتی دەبـوو لەسـەر کەرتـە زەویەکـەی خـۆی‌و ئـەوەی بەرهـەمی دەهێنـا بـژی‌و وەك چـۆن بـوار بەکـەس نـەدراوە ئـاڵتون یـان زیـوی هـەبێت و، دراو لەسپارتە لەئاسن دروسـت دەکـرا، تەنانـەت پەنـدەکان باسـیان لەسـادەیی گوزەرانی‌هاونیشتمانیانی سپارتە کردوە.[٤٧]

بە بـەراوردکردنی پرۆگرامـەکانی خوێنـدن لەهەریـەك لەسپارتەو ئـەتینا بۆمـان دەردەکـەوێت ئامـانجی ئـەو پرۆگرامـە لەهەریەکەیانـدا لەئـەویتریان جیـاواز بـووە، لەکاتێکـدا پرۆسـەی فێرکـردن لەئـەتینا مەبەست لێی پێگەیانـدنێکی کـامڵی هاوڵـاتی بـووە کـە لـەپاڵ بـەهرە سەربازیی‌و وەرزشـییەکاندا، وانـەی میوزك و ڕەوانبێـژی گوتاربێـژانی

47- Gettes history of political, by Lawrence, c.wanlass, London, 1956, p. 35.

دەخوێنند تاکو لەمیانەی متمانە بونی بەخۆی‌و زانستەکەی توانای رازیکردنی هەبێت، ئامانجی پرۆسەی فێرکردنی سپارتە بریتی بووە لەبەرهەمهێنانی سەربازێکی جەنگاوەری زبری خاوەن ئیرادەی بەهێزە کە لەتوانایدایە لەهەموو روبەڕبونەوەکاندا دوژمن تێک بشکێنێت.[٤٨]

هەموو شتێك لە وڵاتی سپارتەدا بۆ پێگەیاندنی خەڵکانی جەنگاوەر، وەرزشێکی جەستەیی چڕ، مەشقی سەربازیی، نانخوانی بەکۆمەڵ و دسپلینکردنی گشت ساتەوەختەکان تەرخانکرابوو، لەئاکامدا سپارتە دەبێتە سەربازگەیەکی بەهێزی سەربەخۆو ئارەزومەند بۆ سەپاندنی سایەی لەسەر ئەرزی واقیع.[٤٩]

بەو مانایەی فەلسەفەی هەردوو شارەکە لەروی سیاسی‌و کۆمەڵایەتیەوە جیاواز بووە، هەر بۆیە رودانی لێکخشان لەنێوانیاندا مەسەلەیەکی چاوەڕوانکراو بووەو بەکردەوە ململانێیەکی سەخت لەشێوەی جەنگی درێژخایەندا لەنێوان هەردوو لادا رویداو ئەو جەنگانەی بەجەنگەکانی پێلۆپۆنیز Peloponnesian Wars ناسرا بوون، ئاشکرا سەرکەوتن لەم شەڕانەدا بۆ ئەو دەوڵەتە بووە کە هەموو بایەخێکی خۆی لەبەها سەربازیەکاندا چڕکردوەتەوە کە کۆمەڵگەی سپارتەیە، نەك کۆمەڵگای ئەتینا کە گشت هەوڵێکی بۆ پێگەیاندنی هاوڵاتی کامڵ بەبێ جەختکردنەوە لەسەر لایەنی سەربازیی دەخستەگەڕ، بەگوێرەی ئەم هاوکێشە کارە نمونەیی‌یەکان بەرامبەر بەهێزی چەك و مەشق و کارامەیی و زبریی نەیتوانی

---

48- الدکتور. علی احمد عبدالقادر: سەرچاوەی پێشوو.. ل ٢٨-٢٩.

49- بڕوانە: اندریة کریسون: سقراط .، تعریب: الدکتور بشارة صارجی، المؤسسة العربیة للدراسات و النشر، بیروت-١٩٨٠ .. ل ٣٤.

لەبەدەستهێنانی سەرکەوتن و یەکلاکردنەوەی جەنگەکاندا شتێکی ئەوتۆ بکات.

ئەم بیروباوەڕانەو ئەو ڕێکخستنە سیاسیانەی کە لەشارەکانی یۆناندا تەشەنەیان کردبوو، دەمانگەیەنێتە ئەو بڕوایەی بڵێین: شارستانیەتی یۆنانی خەسڵەتگەلێکی تایبەت بەخۆی هەیە کە لەشارستانێتیەکانی تر جیادەکاتەوە، لەو خەسڵەتانە:[50]

یەکەم: نەتوانایی کۆمەڵی یۆنانی لەگوزارشتکردن لەهیچ یەکەی نیزامی، ئەم کۆمەڵە کە لەژمارەیەکی لەبن نەهاتوو شاری یۆنانی پێکهاتبوو کە هەریەکەیان بونێکی خۆیی‌و سەربەخۆییەکی ڕەهای هەیە، لەگەڵ ئەمەشدا گشت ئەم شارانە ئینتیمایان بۆ یەك شارستانیەت هەیەو تەنانەت ناکۆکی هەندێکجار لەڕوی سیستمی فەرمانڕواییەوە دەگاتە ئاستێك کە ئەستەمە وێنای هیچ یەکەیەکی شارستانی بکرێت، لەگەڵ ئەمەشداو تەنانەت لەم بارانەشدا یەکێتی شارستانیەتی مەسەلەیەکە بواری وتوێژی نییە، لەم ڕوانگەوە ئەوەندە بەسە هەردوو شاری ئەتیناو سپارتە بەنمونە بهێنینەوە.

دووەم: فرەدیمەنی سیستمەکانی فەرمانڕەوایی لەشارەکانی یۆناندا بوارێکی فراوانی بۆ تێبینی‌و تەماشاکردن ڕەخساندوە کە بەدەگمەن پێش سەدەی نۆزدەیەم لەهیچ کۆمەڵێکی سیاسی تردا بەدیدەکرێت، ئەم فرەییە لەسیستمەکانی فەرمانڕەواییدا بووەتە سەرچاوەی دوو جۆر لەتوێژینەوەی سیاسی: سەرچاوەی ڕێبازێکی بەراوردکارییە، ئەمەش سەبارەت بەتوێژەرێکی سیاسی دابڕاو لەهەقیقەتی سیاسی کە هیچ بەشداری لەڕوداوەکاندا ناکات و

---

50- الدكتور. حامد ربيع: ابحاث في النظرية السياسية، سەرچاوەی پێشوو.. ل ١٣٣.

نایەوێت پێوەی پەیوەست بێت (ئەرستۆ). هەروەها سەرچاوەی پرسیارکردنە بەڵام لەجۆرێکیتر" زۆربوونی ژمارەی سیستەمەکان لەسایەی یەك شارستانیەتدا لەپای چی؟.. بەواتایەکیتر" بۆچی یەکێتی شارستانییەتی یۆنان درێژ نەبوەتەوە تاکو گوزارشت لەیەك یەکەی نیزامی بکات؟.. ئەم حاڵی ئایزۆکراتە Isocrat لەتوێژینەوەی لەمەڕ بونی سیاسی.[٥١]

سێیەم: شارەزایی یۆنانییەکان فرەلایەن و ڕێبازەکانیان تێکئاڵاو بوون و ئەو مێژونوسەی کە دەیەوێت شرۆڤەی مێژوی سیاسی یۆنان بکات، ناتوانێت تەنیا خۆی لەچوارچێوەی ئەو گەشەسەندنانەدا قەتیس بکات کە فەیلەسوفەکانی یۆنان لەپێشخستنی بیری سیاسیدا پێشکەشیان کردوە، هاوشان لەگەڵ بیری سیاسیدا خودی سێستمە سیاسییەکە ڕۆڵی بەرچاوی هەیە لەستراکتۆری شارەزایی‌و کارامەیی سیاسیدا، چونکە فەیلەسوفی سیاسەت کاتێك بەشێوەیەکی دیاریکراو حوکمی چاکە یان گەندەڵی بەسەر دیمەنێکی دیاریکراودا دەدات، ئەوا بەرێگەی هەست یان نەست گوزارشت لەشارەزاییەکی ئەزمونگەرایی دیاریکراو دەکات کە لەچوارچێوەیەکی دیاریکراوی تیۆریی ئەبستراکدا دایدەڕێژێتەوەو هەڵویستی ستایشکردن یان هێرشکردنەسەر ئەو دیمەنەی سێستمی فەرمانڕەوایی.

گرنگی ئەم بیرۆکەیە بەلای بیریارێکەوە زیاترە کە بەکردەوە بەشداری لەژیانی سیاسیدا دەکات. بەمجۆرە، قوتابخانەی یۆنانی شتێکیتر بۆ بیری سیاسی و سێستمی سیاسی زیاد دەکات کە بریتییە لەپەیوەندیی دوو قۆڵیی نێوان هەردوو چەمکەکە: چۆن بیری

---

51– برتراند راسل: سەرچاوەی پێشوو.. ل٦٥.

سیاسی کاریگەری لەسەر سێستمی سیاسی دروستکردوەو بووەتە سەرچاوەی سێستمە چاکەکان؟.. وچۆن بیری سیاسی لەنێوان سێستمە سیاسییەکاندا لەروی ئەو چوارچێوە نیزامیەی کە تێڕامانە فەلسەفییەکانی لەسەر بونیادنراوە، دیاریدەکرێت؟..

ئەگەر هاتو لەگشتاندنەوە بەرەو تایبەتکردن کردن بڕۆین ئەوەمان بۆ دەلوێت کە بڵێین: ئەو پرەنسیپانەی کە لەناو کۆمەڵگای یۆنانیدا تەشەنەیکردوەو بەشێکی زۆری لەشاری ئەتینا (بەدیاریکراوی) چووەتە بواری پراکتیزەکردنەوە، ئەو پرەنسیپانەیە کە لەسەر بنەمای دیموکراسی دروست بوون.

ئەوەندە هەیە دیموکراسیەتی گریك ئەگەرچی لەهەندێك لایەنەوە لەدیموکراسیەتی هاوچەرخ دەچێت، لەزۆر لایەنیشەوە لێی جیاوازە.. دیموکراسیەتی ئەتینا هاوڕایە لەگەڵ دیموکراسیەتی هاوچەرخدا کاتێك دەسڵات دەدرێتە دەست تێکرای هاوڵاتیان و مافی گوزارشتکردنی سیاسییان بۆ دەستبەردەکرێت، لەگەڵ پەسەندکردنی پرەنسیپی یەکسانی هاوڵاتیان و دەستەبەربونی ئازادیی بیروڕا بۆ هاوڵاتیان و کارکردن بەحوکمی زۆرینەو داننان بەسەروەریی یاساو پرەنسیپی رازیکردن و باوەڕپێهێنان.

دیموکراسیەتی ئەتینا لەدیموکراسیەتی هاوچەرخ جیاوازە بەوەی دیموکراسیەتی ئەتینا چوارچێوەی کۆمەڵی سیاسی تەواو بەرتەسك کردوەتەوە بێجگە لەکەمینەیەك کە ناکاتە دەیەکی هاوڵاتیان بەشداری بزاوتی سیاسی پێناکرێت و نازناوی هاوڵاتی پێنابەخشرێت، ئەوەی دەمێنێتەوە دەخرێتە لیستی بێگانەو

کۆیلەکانەوە،[52].. لەبەرئەوەی دیموکراسیەتێکی زۆردارانەی نائازادەو بەرواڵەت نەک کرۆک دیموکراسییەو دەسڵات دەکەوێتە دەست چەند تاکەکەسێك ودان بەهیچ ماف و ئازادییەکی تاکە کەس بەر لەکۆمەڵ نانرێت.. ئازادیی لەئەتینا بەتەنیا بریتی بووە لەئازادیی بەشداریکردن لەبەڕێوەبردنی کاروبارەکانی شارداو هیچ یەکێك لەئازادییە مەدەنییەکانی هاوشێوەی ئازادیی شەخسیو ئازادیی خاوەنداریێتیو ئازادیی بیروباوەڕ و ئازادیی شوێنی نیشتەجێبون بۆ هاوڵاتیانی شاری ئەتینا دەستەبەر نەکراوە، دیموکراسیەتی یۆنانی بەوپێیەی باسکرا پێشەنگی بیرۆکەی مافە سیاسییەکان بووە، نەك ئەوانەی تایبەتن بەمافەکانی تاکە کەسەوە.[53]

---

52– ئەو کۆیلانە هیچ مافێکی سیاسیان نەبوە، سەرباری ئەوەی زۆربەی چالاکییە ئابوریی‌و ڕێژەیەک لەچالاکییە کۆمەڵایەتییەکان لەئەستۆی ئەواندا بوە، لەوانەیە زیادەڕوی نەبێت ئەگەر بوترێت بەهۆی ئەو کۆیلانەوە هاونیشتمانیانی ئەتینا توانیویانە مومارەسەی دیموکراسی بکەن.. بەجۆرێک لەجیاتی ئەوان کاروباری گوزەرانیان لەئەستۆ دەگرت، بەکورتی مەسەلەی کۆیلە لەروی تیۆرەوە لەگرنگترنین بابەتەکانی دیموکراسییەتی ئەتینایەو هەروەها بیری سیاسی‌وتەنانەت بیری سیاسی فەلسەفی یۆنانی کە ئەم مەسەلانەی نەوروژاندوەو وەک یەکێک لەدیاردەکانی سروشت لێی روانیوە.
الدکتور. احمد شلبی: سەرچاوەی پێشوو.. لا ۹۹.

53- بڕوانە: ثروت بدوی: سەرچاوەی پێشوو.. لا ٤۹ .. هەروەها:
-Gettell,op, cit..p 40.
ئنجا بەراوردیان بکە لەگەڵ: دلیل بیرنز، سەرچاوەی پێشوو.. لا ۳۷ بەهەمانشێوە لەگەڵ الدکتور. ابراهیم درویش: النظریة السیاسیة فی العصر الذهبی، دار النهضة العربیة، القاهرة-۱۹۷۲.. لا ۲۳-۲٤.

بەندی سێیەم

## سۆفیستەکان -Sophists

جەنگەکانی پۆلۆپۆنیز بەتەواوی کۆمەڵگای ئەتینا کە بانگەشەی نمونەیی‌و کامڵبونی دەکرد، دوچاری شکستێکی گەورە کرد، پەیتا پەیتا گەنجەکانی ئەتینا پرسیاریان لەبەهای ئەو ئیدیاڵیەت و فەلسەفانە دەکرد کە فێرکرابون و دەربارەی بەهای دیموکراسی‌و دادوەریی کە لەسایەیدا گەورە بوبون.

سەرکەوتنی سپارتە بەسەر ئەتینادا کاریگەرییەکی رونی بەجێهێشت کە لەمەدا پوخت دەبێتەوە: هێزی ماددی زۆر بەکەڵکترە لە قسەکردن و رەوانبێژی‌و، پێوەری راستەقینەی سەرکەوتن واقیعە نەك ئەندێشە، ئنجا گەنجەکان کەوتنە گەڕان بەشوێن ئەو سەرکەوتنەدا کە بەساناترین رێگە دەستەبەر دەبوو، تەنانەت ئەگەر لەپێناو ئەو سەرکەوتنەدا قوربانیان بەماناکانی ئەخلاق و دادوەریی‌و ئیدیاڵیش بدەن.

ئەم وەرچەرخانە ریشەییە لەتێگەیشتنی گەنجەکانی گریکدا (لەدەوروبەری ناوەڕاستی سەدەی پێنجەمی پێش زایین) زەمینەسازی بۆ کۆمەڵێك پیشە کرد لەوانە: هونەرەکانی بەیان، وتاربێژیی‌و دیالەکتیك، واتە هونەرەکانی کاریگەری دروستکردن لەسەر خەڵکی کە بەسۆفیستەکان ناسرا بوون.[٥٤]

---

54- عبدالرحمن بدوی: ربیع الفکر الیونانی، مکتبة النهضة العربیة، القاهرة-١٩٥٨.. ل ١٦٨.

وشەی سۆفیست Sophist بەمانا زارەکییەکەی پیاوی دانا دەگەیەنێت و بێژەیەکە یۆنانییە کۆنەکان بۆ یەکەمجار بەکاریان هێناوە بەمەبەستی دەلالەتکردن لەجۆرێکی دیاریکراوی ئەو مامۆستا گەڕۆکانەی کە لەناو کۆمەڵگەی یۆناندا بڵاو بوبونەوە، وێنەی ئەو بیانییەی کە لەشارە دورەکانی ئەو پەڕی یۆنانەوە هاتبوو تاکو لەشەقامەکانی ئەتینادا رۆڵەکانی بەدانایی‌و رێگەکانی بەختەوەریی ئاشنا بکات.[55]

ئەمە دەمانگەیەنێتە ئەو بڕوایەی بڵێین کە سەرەتا وشەی سەفسەتە بەهیچ جۆرێك دەلالەتی لەشتی خراپ نەدەکرد، بەڵکو ماناکەی لەو چەمکەوە نزیك بوو کە ئێستاوشەی مامۆستا هەیەتی.

پارکەر کۆمەڵە خەسڵەتێکی دیکە دەداتە پاڵ سۆفیستەکان و دەڵێت: خاوەنی رۆشنبیری هەمەچەشن بون: لەناویاندا خەڵکانی رۆمانسی مێژویی، رۆحانی‌و گومانگەرا، پسۆڕ لەزانستی ئەرکی ئەندامەکاندا هەبوو، گرنگی سۆفیستەکان بۆ ئەو بایەخی ئەو بابەتانە ناگەڕێتەوە کە بەخەڵکیان وتوتەوە، بەڵکو لەبەرئەوەی سۆفیستەکان یەکەمین مامۆستا پیشەوەری یۆنان بوون و لەبەرئەوەی فێرکردنەکەیان ئامانج لێی ئەوە بوو ببێتە هاریکاریی پراکیتکی لەمەیدانی سیاسەتدا، ئەو کەسەی سەردانی دەکردن وەك ئەوە وابوو سەردانی زانکۆ بکات" زانکۆیەك کە پیاوان بۆ ژیانی داهاتویان ئامادە بکات و لەبەرئەوەی ئەو ژیانە سیاسی بووە، زانکۆکەش ئامادەی دەکردن تاکو سیاسەتمەدار بەتەواوی وەك

---

55– الدكتور حامد ربيع: ابحاث فى النضرية السياسية، سەرچاوەی پێشوو.. هەروەها بڕوانە:

-Gettell.op, cit..p 42.

ئـەوەی ئـەفلاتۆن لـەپلانی فێرکاریـدا خوازیـاریی بـووەو، لـەکتێبی (کۆمار)دا ئاماژەی پێکردوە، فەرمانڕەوا پێدەگەیەنێت.[٥٦]

لـەنێوان دیـارترین ئـەو ناوانـەی کـە پەیوەسـتی دیـاردەی سۆفیسـتەکان بـوون، کەسـایەتی: پرۆتـاگۆراس Protagoras کـە لەئەبادیراوە هـاتبوو، گۆرجیـاس Gorgias کە خـەڵکی صقلیە بـوو، تراسـیماخۆس Thrasymachus کـە لـە"جـادلۆن"ی کـەنارەکانی بسـفۆرەوە هـاتبوو، هیپیـاس Hippias لـە ئـەلیس و لەگـەڵ هەریـەك لەئەنتیفۆن Antiphon و کالکلێز Cullicles.

ئەم کەسایەتیانە قوتابخانەیەکی تایبـەتیان پێکنەهێنابوو، بەڵکو مامۆسـتای کۆمەڵـە بابـەتێکی هەمەچەشـنە بـوون کـە فێرخـوازە دەوڵەمەنـدەکانی شـاری ئـەتینا ئامـادەبون لـەپێناو فێربونیـدا کـرێ بـدەن و بـەم پێیـە ئـەرکی سەرشـانیان خـۆی لـەفێرکردنی بابەتـەکانی هونـەری دیـالۆگ و ئـەو چەشـنانەی مەعریفـەدا دەبینییـەوە کـە لەچەسپاندنیدا کاریگـەر بـوو، سۆفیسـتەکان بەتـەواوی ئامـادە بـوون بەشـێوەیەکی گشـتی ئـەوە بـۆ فێرخوازەکانیـان رونبکەنـەوە کـە چـۆن لەتواناکانیانـدا دەبێـت بـەرگری لـەبیروڕاکانی خۆیـان بکـەن، ئەمـەش جۆرێـك لەشـۆکی بـۆ ئـەو کەسـانە دروسـتکرد کـە فەلسـەفەیان وەك رێبازێك بۆ ژیان و زۆر پەیوەست بەئایینەوە وەرگرتبوو.[٥٧]

---

[56] - Barker. Op, cit.. p 66.

[57]برتراند راسل: سەرچاوەی پێشوو.. لا ١٣٥.. لەگەڵ

- Barker. Op, cit.. p68.

– هـەروەها بڕوانـە: مارکریـت تیلـور: الفلسـفة اليونانيـة، مقدمـة، ترجمـة: عبدالمجيـد عبدالحكيم، مكتبة النهضة العربية، القاهرة-١٩٥٨..لا ٦٧-٦٨.

سەرەڕای ئەمانە ناکرێت ئەوەشمان لەیادبچێت هەندێك لەسۆفیستەکان تێڕوانینی نوێی ئەوتۆیان هێناوەتە ئاراوە کە ئەو دەمانە جێگە بایەخی فەیلەسوفان بووە. بنەڕەتی ئەو تێڕاونین نوێیانە خۆی لەوەدا دەبینییەوە کەوا: مرۆڤ، بەشێوەیەکی وردتر تاك" میحوەریی مەعریفەیە: تاك پێوەری گشت شتەکانە Man is the measure of all things و پێوەری بونی ئەو شتانەیە کە بونیان هەیەو نەبونی ئەو شتانەش کە بونیان نییەو، لەئاکامی ئەم لۆژیکەوە گیانی تاگەرایی لەکۆمەڵگەی یۆنانیدا تەشەنەی کرد.

تاك نکۆڵی لەکۆمەڵ کردو بەم پێیە جەختی لەسەر سەلماندنی زاتی خۆی کردەوە بەبێ خۆبەستنەوە بەیاساکانی کۆمەڵگەو بەهاکانی، بەمەش سۆفستەکان نازناووی مامۆستا تاکگەرا یەکەمەکانیان بەبەردا بڕا.[58]

ئەگەر بمانەوێت پرسیار لەبارەی ئەم تێڕوانینە نوێیانەوە بکەین راستەوخۆ ناوی هەردوو کەسایەتی ئەنتیفۆن و پرۆتاگۆراس دێتە پێش چاومان.

بەگوێرەی بیروڕا سیاسییەکانی ئەنتیفۆن،[59].. یاسا تەنیا بریتییە یەکترناسین یان رێکەوتن و دواجار کارێکە دژ بەسروشت، و هاوکات باشترین شت ئەوەیە تاك لەبەردەمی خەڵکیدا رێز لەیاسا بگرێت، ئەگەر چاودێرێکی نەبێت شوێن سروشت دەکەوێت کە مەبەست لێی هەرکەسە بەئارەزوی خۆیو بەگوێرەی بەرژەوەندی تاکەکەسی

---

59– بۆ زانیاری زیاتر لەبارەی بیروبۆچونەکانی ئەنتیفۆن بڕوانە:
- Barker. Op, cit.. p76-79.

بجولێتەوە، سەرپێچی کردنی یاسا هیچ زیانێك بەتاك ناگەیەنێت مەگەر ئەو کاتانە نەبێت بەسەر سەرپێچیکردنەکەوە دەگیرێت، لێرەدا مەسەلەکە بیروڕا تێناپەڕێنێت، بەڵام دژایەتیکردنی سروشت ماڵوێرانی لێدەکەوێتەوە کە خۆ لێدەربازکردنی مەحاڵە، ئەو کەسانەی لەتوانایاندا نییە خۆیان سازبکەن زیاتر لەوەی کە دەستیان دەکەوێت لەکیسیان دەچێت و دادوەریی بەو شێوەی یاسا دەیبینێت بێکەڵکە سەبارەت بەوانەی کە پێوەی پەیوەستن، لەکاتێکدا یاسا بەر لەرودانی زیانەکان دەگرێت و پاش رودانی کار بۆ چاککردنەوەی ناکات، سروشت لەتێڕوانینی ئەنتیفۆنەوە زۆر بەسادەیی بریتییە لەخودپەرستیو خۆشویستنی بەرژەوەندی خۆیی، لێرەوە تێبینی دەکرێت ئەنتیفۆن ئەم بەرژەوەندییە خۆیی‌یە وەك پرەنسیپێکی ئەخلاقی پێچەوانەی ئەوەی کە بەئەخلاق ناودەبرێن، دادەنێت.[60]

بەمجۆرە ئەنتیفۆن شەقێکی گەورە لەنێوان یاسای دانراو و یاسای سروشت دروست دەکات.

---

60- هۆکاری پشت هێرشکردنە سەر یاساکانی ئەخلاق لەلایەن سۆفستاییەکانەوە بۆ ئاشکراکردنی پەیوەندی نێوان ئەخلاق و سیاسەت دەگەڕێتەوە لەلایەن ئەم گروپەوە، ئەوان راستی و تەندروستی بنەماکانی هەڵسوکەوتیان رەتدەکردەوەو پێیانوابو سودمەند نییە هەمیشە مرۆڤ خراپە بەچاکە وەڵامبداتەوەو راستگۆ و دەست پاك بێت.. تەنیا یاسایەکی سلوك کە پێویستە رەچاوبکرێت و تاکەکەس لەگوفتارو کردەوەکانیدا رێنوێنی پێبکات بریتییە لەپاراستنی ئەو بەرژەوەندیە تایبەتەی پاڵ بەخەڵکییەوە دەنێت بۆ کارکردن و هەوڵی بەدیهاتنی دەدەن وەك ئامانجێکی ئەو کارکردنە.. بڕوانە: الدکتور. علی احمد عبدالقادر: سەرچاوەی پێشوو.. ل ٣٧.

یاسای دانراو بەسودە بەڵام یاسای سروشت خۆلێدەربازکردنی نییە، یەکەمیان رێکەوتنەکان دروستی دەکەن و دووەمیان دروستکراوی سروشتە، بەم پێیە نابێت لە دەوڵەتە/شاردا رێز لەیاسای دانراوی دەستی مرۆڤ بگیرێت، لەگەڵ ئەوەشدا بەرپاکردنی شۆرش لەدژی ئەم یاسایە کاردانەوەی نەگەتیفی دەبێت، بەواتای ئەوەی مرۆڤی یاخیبو لەیاسا روبەروی تۆڵە لێکردنەوە دەکات، بۆ ئەوەی لەتۆڵەی یاسا بەدوربێت پێویستە بەروکەش رێز لەیاسا دەگرێت.[61]

بەرێنوێنی ئەم بیربۆچونانە سۆفیستەکان رایانگەیاند: سەرکەوتن لەرێگەی هێزەوە تەنیا رێگەی یاسایی پیادەکردنی دەسڵاتە، لەبەرئەوەی دادوەریی هیچ بنەمایەکی نەبووە کە بتوانرێت بەدیبهێنرێت و ئەگەر بەرژەوەندی تاکە کەسی تەنیا پاڵنەری رەفتاری مرۆڤ بێت ئەوا مافی سیاسی ئاسایی پشت بەبنەمایەکی زۆر ئاسان دەبەستێت، ئەویش بنەمای هێزی زاڵە، واتە دادوەریی هەمیشە ماکی بەهێزی گوزارشتکەردنە لەبەرژەوەندییەکانی.

The Justice is mean whilse than the interest of stronger. /لۆژیکی بەهێز هەمیشە دادوەرە.

---

61- بڕوانە: الدكتور. ملحم قربان: قضايا الفكر السياسي" القانون الطبيعي، المؤسسة الجامعية للدراسات و النشر و التوزيع، بيروت- ١٩٨٢.. ل ٢٨-٢٩.

پیاوی بەهێزی ژێر خۆی لەکارکردن بەو یاسا دروستکراوانە دوردەخاتەوە کە جگە لەمپەرگەلێکی ناسروشتی لەرێگەی گەیشتنی ئەو بەخواستە سروشتییەکانیدا هیچی دیکە نییە.[٦٢]

بەڵام پرۆتاگۆراس،[٦٣] ئەوەی رونکردوەتەوە" ئامانجی ئیجتیهادی بیری مەبەست لێی گەشتن نییە بەهەقیقەت یان دانایی کە هەرگیز رێگەیەك نییە بۆ گەشتن پێیان، بەڵکو لەئیمتیازە. ئەو وانەی ئارەزوی وتنەوەی دەکەم "بەگوێرەی وتەکانی پرۆتۆگراس" بریتییە لەوانەی بیرتیژیو باش قسەکردن لەکاروبارە ناوخۆییەکانداو بۆئەوەی پیاو بتوانێت کاروبارەکانیماڵی خۆی و ژیان بەچاکی بەرپوەبەرێت، تاکو ئەو پیاوە بەقسەو بەکردەوە شیاوی بەشداریکردنی کاروبارەکانی دەوڵەت بێت، بەکورتی وا لەمرۆڤەکان بکرێت هاوڵاتی چاك Good citizenship یان لێدەربچێت.

وەك چۆن بیروبۆچونەکانی پرۆتاگۆراس سیماکانی پەیمانی کۆمەڵایەتی لەخۆدەگرێت ، ئەوانەی پەیوەستن بەپتەوکردنی پایەکانی دەوڵەت لەسەر بنەمای رۆحی/ میتافیزیکی، دەوڵەت وەك

---

62- الدکتور علی احمد عبدالقادر: سەرچاوەی پێشوو.. ل ٣٦-٣٧ هەروەها بڕوانە: شارل فرنز: الفلسفة الیونانیة، ترجمة تیسیر شیخ الارض، دار الانوار، بیروت-١٩٦٨.. ل ٦٥-٦٦.

63- کتێبی "کۆمار" هاوشێوەی کتێبەکەی ئەفلاتۆنە،یەکێکە لەگەورەترین فیلەسوفەکانی سەفسەتە، لەبەرئەوەی فەیلەسوفێکی سیاسیو مامۆستای زمانپاراوی بوە، یەکەم هاونیشتمانی یۆنانە وانەی جەدەل فێری خەڵکی بکات و ئەو ئەرکەی لەئەستۆ گرتبو کە مەسەلەیەکی بچوک بگۆرێت بۆ مەسەلەیەکی گەورە، لەمبارەوە بڕوانە:

-Barker. Op, cit.. p 72.

پێویستییەکی خەڵکی بۆ ڕێکخستنی ژیانێك هاتوەتە کایەوە کەتیایدا ئاسایش سەقامگیریی باڵادەستەو لەئاژەڵی دڕندە پارێزراون، بەڵام ژیانی شار بەمۆرکە ماتریالەکەی بەهۆی کورتبینی لەتێگەیشتن وهونەرەکانی بەڕێوەبردن و سیاسەتدا بەتەواوی بەختەوەریی چاوەڕوانکراوی بۆ فەراهەم نەکردن، هەر ئەمەش بەرەو ماڵوێرانیو پەرتەوازەیی بردن و لەم کاتەدا خواوەند زیوۆس خواوەند هرمزی بۆ ڕەوانە کردن، تاکو پرەنسیپەکانی دادوەریی لەناویاندا بڵاوبکاتەوەو بۆ ئەوەی ببێتە بنچینەی یاساو پێکەوەژیان لەکۆمەڵگە هاوچەرخەکانی شاردا، بەهێنانە ئارای کارەکتەری ڕۆحی پرۆتاگۆراس کارەکتەرێکی نوێی بۆ بیری سۆفیستەکان پێش و دوای خۆی زیادکرد، کارەکتەرێکی نوێ کە تەنیا لە"ماتریالی تاکگەرا"دا کوت نابینێتەوە کە زۆر بەتوندی لەڕێکخستنی ئەخلاقیو سیاسی دەوڵەتدا بانگەشەیان بۆ دەکرد.[٦٤]

ئەگەر ئەنتیفۆن و پرۆتاگۆراس هەڵوێستێکی پارێزکاریان بەرامبەر بەتاکگەرایی ڕەهای پەیوەندی نێوان تاك و دەسڵاتدا هەبێت کە خۆی لەنەریت و یاساکانی کۆمەڵگەدا دەبینێتەوە، ئەوا کالکلێز Callicles و تراسیماخوس Thrasymachus بانگەشەی تاکگەراییەکی توندڕەوانە یان دەکرد کە دروست نەبونی دۆستایەتی لەنێوان سروشت و یاساکاندا پەسەند دەکات.

یاسا لەتێڕوانینی کالکلێزەوە لەبەرئەوەی دروستکراوی مرۆڤە لاوازەکانە بۆ زەوتکردنی مافی ڕەوای مرۆڤە بەهێزەکان کە بەهۆی هێزەوە توانیویانە دەستەبەری بکەن، ڕەتدەکرێتەوەو لەبەرئەوەی"

64- الدكتور. على احمد عبدالقادر: سەرچاوەی پێشوو.. ل ٣٩.

لەلایەکی دیکەوە یاسا ئاستێکی ئەخلاقی ئەوتۆ دێنێتە ئاراوە کە تەنیا بۆ کۆیلەکان دەست بدات.[٦٥]

بەواتایەکیتر یاسا دەستکردی مرۆڤە لاوازەکانە لەرێگەیەوە فرتوفێڵ و رێگرییی لەو توانایە دەکەن کە سروشت بەمرۆڤە بەهێزەکانی بەخشیوە بۆ بەدیهێنانی خودی خۆیان و بەرژەوەندییە تایبەتەکانیان، پیاوی بەهێز هەمیشە لەتوانایدایە ئیرادەی خۆی بۆ هەقیقەتێکی کارا بگۆڕێت.

بەڵام تراسیماخوس پێیوایە شتێك نییە بەناوی مافی سروشتییەوە، ماف ئەوەیە گەورەترین هێز لەدەوڵەتداو بەپێی بەرژەوەندییە تایبەتەکانی جێبەجێی دەکات، ماف هەر ئەوەیە ئەم هێزە دەیچەسپێنێت بەچاوپۆشی لەدەوڵەت و ئەو سروشتەی لێوەی سەرچاوەی گرتوە، دادوەریی ئەوەیە مرۆڤە بەهێزەکان لەمرۆڤە لاوازەکان زیاتریان دەستبکەوێت، سەبارەت بەدەسەڵاتدارانی کۆمەڵگەش دادوەریی ئەوەیە لەبەرامبەر بەڕێوەبردنی کاروبارەکانی دەوڵەتدا گشت ئەو دەسکەوتانە بەرن کە بۆ تێرکردنی ئارەزووەکانیان پێویستە، ئەو ئارەزووانەی کە بەسروشتی حاڵ لەئارەزووەکانی خەڵکی رەشۆك زیاترە.[٦٦]

بەمجۆرەو لەو ماوەدا بیری فەلسەفی سەبارەت بەپەیوەندی تاك بەدەسەڵاتەوە تێکچڕژاوی لەنێوان میانڕەوو توندڕەوەکاندا بەخۆوە دەبینێت، ئەگەرچی مۆرکی گشتی ئەم تێکچڕژاوییە بریتی بووە لەپەسەندکردنی سەرداریی تاکی بەهێز، بەبێ جیاوازی لەنێوان ئەوەی

---

65- Barker. Op, cit.. p 81.

66- الدکتور. علی احمد عبدالقادر: سەرچاوەی پێشوو.. لا ٤١. هەروەها بڕوانە: عبدالرحمن بدوی: ربیع الفکر الیونانی، سەرچاوەی پێشوو.. لا ١٧٤.

که ئەم پەسەنکردنە پشت بەمافە سروشتییەکان دەبەستێت یان بەهێزە رەهاکان، تاك بونەوەرێکی سەربەخۆو خاوەن زاتی خۆیەتی کە ناکرێت لەناو سێستمی سیاسی کۆمەڵگەدا هەرچەندە بەدرێژایی مێژوو پەیوەست بکرێت بەدابونەریتەکانەوە، بتوێتەوە، بەم پێیە زۆربەی بۆچونەکانی سۆفیستەکان جەخت لەسەر بیرۆکەی ناکۆکی سروشت و عورف و لەنێوان ئەوەی تاك بەرهەمی سروشت و دەوڵەت بەرهەمی دەوڵەتە، دەکاتەوە.[٦٧]

بێگومان جەختکردنەوە لەسەر ناوەڕۆکی ئەم بیربۆچونانە نەك تەنیا کاریگەریی لەسەر دروستکردنی بیربۆچونی روخێنەرانەی دەوڵەتی هێنایە کایەوە، بەڵکو لەپاڵ ئەمەشدا بیربۆچونی ئەوتۆی خوڵقاندوە کە زۆرێك لەسێستم و بیروباوەڕەکان تێك دەشکێنێت، لەبەرئەوەی ئەگەر سروشت بکرێتە شتێك دژی دابونەریتەکان ئەو کولتورە لەناودەبرێت نەوە یەك لەدوای یەکەکان دروستیان کردوە.[٦٨]

67- الدكتور علی احمد عبدالقادر: سەرچاوەی پێشوو.. ل ٤٢.

68- Ibid.,

# نمونە لەبیری سیاسی پێش ئەفلاتۆن

## یەکەم: هیپۆدام - Hippodam

هیپۆدام نوسەرێکی سیاسی راستەقینەو یەکەمین دامەزرێنەری قوتابخانەی سیاسییە بەواتای وشەکە، ئەرستۆ دەیناسێنێ بەوەی یەکەمین کەسە بیرۆکەیەکی رونی سەبارەت بەچاکترین شێوەکانی دەستورەوە خستبێتە ڕو.[٦٩]

هیپۆدام ئەندازیارێکی شارستانی کارامەی پلاندانەری شار بوو، Atown Planner هاوکات لەگەڵ بایەخدانی بەمەسەلە گشتییەکانی شاری ئەتینا، بەشداری لەحکومەت یان بەڕێوەچونی کاروبارەکانی نەکردەوە، لەبەرئەوەی هیپۆدام بێگانەیەو لەهاوڵاتیانی ئەتینا نییەو لەشاری میلیتۆسەوە هاتوە، هیپۆدام بەیەکەم کەسی ناسیاسی دادەنرێت کە هەوڵیداوە دەوڵەتی ئیدیاڵمان پێ بناسێنێت.[٧٠]

لەدابەشکردنە گشتییەکانیدا، هیپۆدام پۆلێنکردنێکی دانسقەو نایابمان پێشکەشدەکات: گشت شتەکانی بەسەر سێ بەشدا

---

69- Mcdonald, Lee Cameron, Westen political theory from its origin to the Present, Harcourt, Bracemd world, LNC, N.Y 1968.. p 54.
70- Barker. Op, cit.. p 93.

پـۆلێنكردوه: چـینەكان سـێ چـینن و یاسـاكان سـێ یاسـان و سێستمەكانی فەرمانڕەوایش سێ سێستم و بەمجۆره.. تاد.[71]

بـەڵام فەلسـەفە گشـتییەكەی لەسـەر بنەمایـەكی تیـۆری بەنـدەو لەخیاڵدانیدا شارێك دروست دەكات كە ئەندامەكانی دە هـەزار كەسـەو بەسەر سێ چیندا دابەشدەبێت:

### ١. چینی دەستەبژێری نایاب:

كاروبارەكـانی شـارەكە بەڕیوەدەبـەن و بەچـینی رۆشـنبیران یـان بەچینی فەرمانڕەوا ناویان دەبات.

### ٢. چینی پیاوە توندو بەهێزەكان:

ئـەركی پارێزگـاریكردن و بـەرگریكردن لەشـاریان دەكەوێتـە ئەسـتۆو ناوی چینی سەربازەكانیان لێدەنێت.

### ٣. چینی پیاوانی كارگەر

كە ئەركی بەرهەمهێنانی ماددە پێویستەكانیان لەئەستۆدا بوەو نـاوی چینی كارگەریان لێنراوه.

هەریـەك لـەم چینە كۆمەڵایەتیانـە بەسەر سێ یەكـەی سـەرەكیدا دابـەش دەبێـت: چـینی فـەرمانڕەوا لـە: لیژنـەی ئامادەكـاریی‌و ئەنجومـەنی پـیران و دەسـڵاتی جێبـەجێكردن پێكهـاتوه.. چـینی سـەربازەكان لـە: سـەركردەكان" یـان ئەفسـەرەكان " و سـوپای جەنگاوەرو خەڵكی رەشۆك ئەوانەی توانـای هـەڵگرتنی چەكیان هەیە

---

71- Mcdonald, op. cit.. p 54.

پێکدێت و.. چینی کارگەریشە جوتیارو پیشەسازو بازرگانەکان لەخۆدەگرێت.[72]

سەبارەت بەو مەسەلانەش کە پەیوەندییان بەکشتوکاڵەوە هەیە، جۆرێك لەدابەشکردنی زەویی لەئارادایە: زەویی پیرۆز کە بۆ مەبەستی ئایینی بەکاردەهێنرێت، زەویی گشتی کە تایبەتە بەجەنگاوەران و زەویی تایبەت کە جوتیارەکان بەکاری دەهێنن.

گومانی تێدا نییە دانانی زەویی سەربازەکان بەزەویی گشتی.. نەخشەکەی ئەفلاتۆنمان بیردەخاتەوە، ئەگەرچی ئەفلاتۆن پلانێکی جیاوازیی گرتوەتە بەرو گشت زەوییەکانی بۆ چینی بەرهەمهێنەر تەرخانکردەوە بەرامبەر دانی جۆرێك لەباجی زەوییانە کە سەربازو فەرمانڕەواکان بەفراوانی بەکاری دەهێنن.

بەپشت بەستن بەپێشنیازەکەی هیپۆدام" لەبونی چینێکی تایبەت لەجەنگاوەر کە موڵکەکانی موڵکی دەوڵەت بێت، دەتوانرێت بوترێت: ئامانج لێی دامەزراندنی حکومەتێکە دەستی چاکسازیی پێگەیشتوەو هیچ گەندەڵییەکی سەردەمی تێکەڵ نەبووە، حکومەتێك کە لەرێگەی پسپۆڕیی‌و بێگەردی لەگەندەڵی سیاسی لەرێگەی هاوبەشییەوە، خۆی لەشکستی سیاسی دەربازکردەوە.

هەرچی یاساکانە بەهەمانشێوە بۆ سێ جۆر لەیاسا دابەشیکردوە: هەندێکیان تایبەتن بەو تاوانانەی دژی ئابڕو ئەنجام دەدرێن و بەشێکی تریان پەیوەستە بەلایەنەکانی خاوەندارێتی‌و جۆری سێیەم بۆ ئەو تاوانانە تەرخانکراوە کە بەرامبەر بەگیانی مرۆڤەکان دەکرێن.. هیپۆدام بەرێوەبردنیشی بەپێی ئەو بابەتانەی کەدەچنە

72- الدكتور. نزار الطبقجلي: سەرچاوەی پێشوو.. لا ٣٧-٣٨.

بـواری کـارکردنی هەریەکـە لـەو بەشـانەوە بـۆ سـێ بـەش پـۆلێنکردوە: هەندێکیان تایبەتن بەگەل و هەندێکی تر تەرخانە بۆ ئەو بیانیانەی کە نیشتەجێی شارەکەن و جۆری سێیەم تایبەتە بەکاروباری بێگانەکان.

سەرباری ئەو پۆلێنکردنەی چینەکان، هیپـۆدام مـافی قـۆرخکردنی دەسـەڵاتی سیاسـی بـۆ هـیچ چـینێك بـەڕەوا نـەزانیوە، بـەڵکو مـافی بەشـداریکردنی لـەکاروبارەکانی فەرمانڕەواییـدا بەهـەر هاوڵاتییـەك داوە کە لەلایەن گەلەوە هەڵدەبژێردرێت.

لێـرەوە تێبینـی ئـەوە دەکرێـت هیپـۆدام سێسـتمی هەڵبـژاردنی وەك هۆیەك بۆ دیـاریکردنی فـەرمانڕەوا بەرێگەی رەوا زانیـوە، کە لایـەنگرانی دیموکراسـی لـەگریکی کۆنـدا پەسـەندیان نـەکردوە، بـەبڕوای ئـەوان هەڵبــژاردن هۆیــەکی ئەرەســتۆکراتیانەی دیــاریکردنی فەرمانڕەوایــەو هەڵبـژاردن بـەهۆی ناوڕاکێشـانەوە هۆیـەکی دیموکراسـییە، لەبەرئـەوەی تەنیا شێوازە کە مافی یەکسانی بۆ هەموو لایەك دەسەلمێنێت.[٧٣]

**بەڵام ئایا باشترین ئەو سێستمە سیاسییە کامەیـە کـە هیپـۆدام ئـارەزوی دەکات؟**

لێـرەدا تێبینـی ئـەوە دەکـەین" هیپـۆدام لـەدیاریکردنی سێسـتمی سیاسـیدا خوازیـاری ئــەو سێســتمە تێکەڵەیــە کــە لەتێکــەڵکردنی سێستمەکانی: ئەرستۆکراتیو پاشاییو دیموکراسی هەڵهێنجراوە.

بۆئـەوەی پاشـا دەسـەڵاتەکەی بـۆ سـەرکوتکردن بەکارنـەهێنێت، هیپـۆدام بـەئامانجی بەرژەونـدی گشـتییو پاراسـتنی هاوسـەنگی ئـەو دەسـەڵاتانە بانگەشـەی دیـاریکردنی ئـەم دەسڵاتانەوسـنوردارکردنیان دەکـات، لەمیانــەی کۆمەڵــە رەگەزێکــەوە کــە لەهــەردوو سێســتمی

---

73- الدکتور. ثروت بدوی: سەرچاوەی پێشوو.. ل٥٢

ئەرستۆكراتیو دیموكراتییەوە هەڵهێنجراون، هیپۆدام بانگەشەی سیستمێك دەكات هاوشێوەی سیستمی بەریتانیا، مۆنتیسكۆ لەسەدەی هەڤدەیەم لەكتێبی رۆحی یاساكان دەربارەی ئەو سیستمە نوسیویەتی: پاشایەتییەكی سنوردار لەلایەن چینی ئەرستۆكراتەوە هاوكاریی دەكرێت و ركابەری یەكتری دەكەن بۆ ئەوەی بەهرەكانی خۆیان نیشاندەن و گشت ئەمانە لەژێر چاودێری ئەو هاوڵاتیانەدایە كە رۆڵی بەشداریكردن لەراییكردنی كاروبارە گشتییەكاندا دەبینن.

لەروانگەی سیستمی كۆمەڵایەتییەوە دەبینین هیپۆدام هەڵوێستێكی دیاریكراوی هەیە: ئەو بانگەشەی سۆسیالزمی رەها كە شتەكان دەخاتە ژێر ركێڤی كۆمەڵ و نەهێشتنی جیاوازی لەنێوان سامانەكاندا دەكات و فێركردن بەر بواری تایبەتمەندی حكومەت بكەوێت، كە لەسەروی ئەمەوە چاودێریكردنی ئەخلاق و پاراستنی نەریتە جوانەكان لەئەستۆ دەگرێت.[٧٤]

---

74– هەمان سەرچاوەی پێشوو.. ل ٥٣. و بەراوردی بكە لەگەڵ بیروبۆچونەكانی: الدكتور نزار الطبقجلي: سەرچاوەی پێشوو.. ل ٤٢-٤٣.

## دووەم: سۆكرات[٧٥] – Socrats

بابەتی سۆكرات ئاڵۆزییەكی زۆری بۆ مێژونوس دروستكردوە، ئەگەر خەڵكانێك هەبن دڵنیابین لەوەی شتێكی كەم لەبارەیانەوە دەزانین و خەڵكانێكیش هەبن بێگومان بین لەوەی شتێكی زۆریان لەبارەوە دەزانین.. ئەوە كاتێك قسەكردن دێتە سەر سۆكرات نازانین كە ئایا ئەوەی لەبارەیەوە دەیزانین كەمە یان زۆر.

گومان لەوەدا نییە" سۆكرات لەنەوەكانی شاری ئەتینایەو زۆربەی كاتەكانی بۆ وتوێژو فێركردنی گەنجەكان بەفەلەسەفە تەرخانكردبوو، بەڵام ئەم وەك سۆفیستەكان بەرامبەر بەكرێ فێری نەدەكردن، گومانمان لەوەش نییە كە سزای مردنی بەسەردا سەپێنراو ساڵی ٣٩٩ ی پێش زایین ولەتەمەنی هەفتا ساڵیدا سزای لەسێدارەدانی بەسەردا جێبەجێكراوو پیاوێكی دیاری شاری ئەتینا بووە، لەمانە بترازێت قسە لەسەر كۆمەڵە داتایەك دەكەین كە جێگەی

---

75– سۆكرات لەئەتینا ساڵی (٤٦٩ پێش زایین) لەباوكێكی پەیكەرتاش و دایكێكی مامان لەدایك بووە، لەئەتینا ئەو كاتانەی پاش جەنگ لەگەڵ فارسەكاندا لەلوتكەی هێزو سەركەوتنەكانیدا بوە پێگەیشتووە وەك سەربازێك بەشداری لەشەڕەكانی پلۆپۆنیزی كردوەو بەئەركی سیاسی سەرشانی هەستاوە ئەو كاتەی ساڵی (٤٠٦ پێش زایین) پۆستی ئەنجومەنی پێنج سەد كەسی لەئەستۆگرتوە، هەرگیز سۆكرات هەوڵی بەدەستهێنانی پۆستێكی گرنگی دەوڵەت یان پێگەیەكی لەسوپادا نەداوە.. سۆكرات ماوەی داڕوخانی ئەتیناو كارەساتەكانی (٤٠٥ پێش زایین) بەچاوی خۆی بینیو دژایەتی (كریتاس) سەرۆكی چەوسێنەرە (سی)یەكانی دەكرد، پاش ئەوەی ئەتینا لەكۆتاییەكانی شەڕی پلۆپۆنیز لەلایەن ئۆلیگارشییەوە حوكمڕانی دەكرا.. بڕوانە: كارل یاسبرس: فلاسفة انسانيون، ترجمة: الدكتور. عادل عوا، منشورات عويدات، بيروت– ١٩٧٥ .. ل ٨ . هەروەها: الموسوعة الفلسفية المختصرة، نقلها عن الانكليزية: فؤاد كامل و أخرون، مكتبة الانجلو مصرية، القاهرة–١٩٦٣ .. ل ١٨٦–١٨٧ .

متمانەی رەها نین، چونکە دووان لەقوتابییەکانی کە بریتیین لەئەکزینفۆن Xenophon و ئەفلاتۆن Plato قسەیان لێگێڕاوەتەوەو لەگێڕانەوەکانیاندا جیاوازی گەورە هەیەو تەنانەت کاتێك لەسەر گێڕانەوەیەك رێکەوتون، ئەوا ئەکزینفۆن لەئەفلاتۆنی وەرگرتوەو ئەو کاتەش جیاوازی دەکەوێتە نێوان گێڕانەوەکانەوە" هەندێك باوەڕ بەئەمیان و هەندێکی دیکە باوەڕ بەئەویان دەکەن، ئەوانەشی دەمێننەوە نەباوەڕ بەئەویان و نەباوەڕ بەئەمیان ناکەن.[٧٦]

سۆکرات هاوچەرخی سۆفستەکان بووەو تۆمەتبارکردن کەوتوەتە نێوانیانەوە، سۆکرات بنەڕەتی فەلسەفەکەیان کە لەسەر بنەمای بڕوا بوون بەفەرمانڕەوایی بەهێزترین و ملکەچ نەبوون بۆ حوکمەکانی یاسا دامەزراوە، رەتدەکاتەوەو توانیویەتی ئاراستە بیرییە پچڕ پچڕو جیاجیاکانی سەردەمی خۆی کۆبکاتەوەو لەچوارچێوەیەکی فەلسەفی دیاریکراودا دایبڕێژێتەوە، بەجۆرێك چاکەی ئەو گەشەسەندنانە کە دواجار فەلسەفەی هێنایە کایەوە بۆ ئەم دەگەڕێتەوە.

روداوەکان ئەوە دەردەخەن کە سۆکرات هیچ شوێنەوارێکی فەلسەفی نوسراو یان کتێبی تایبەت بەخۆی جێنەهێشتوەو، فێرگەی فەلسەفی سەربەخۆو تایبەت بەخۆی نەبووە.[٧٧]

---

76– برتراند راسل: سەرچاوەی پێشوو.. ل ١٤٣.

77– الدكتور. احمد فؤاد الاهواني: المدارس الفلسفية، دار القومية للتأليف و الترجمة، القاهرة–١٩٦٥.. ل٢٨.

ماکدۆناڵد سۆکرات وەسفدەکات بەوەی کە هاوشێوەی مەسیحە بەوەی ئەمیش کتێبێکی تایبەتی بەجێنەهێشتوە، دوای خۆی یادی بکرێتەوە، کاریگەری سۆکرات راستەوخۆ و هەمیشە روبەڕو بووە، بڕوانە:

**کەواتـە دەکرێـت بپرسـین سـۆکرات لـەکوێوە بـووە ئـەم کەسـایەتییە مەزنەو ئەو پێگە دیارەی لەبیری فەلسەفییدا بەرکەوت؟**

بێگومـان وەڵـامی پرسـیارێکی لـۆژیکی هاوشـێوە پێویسـتی بەدەرخسـتنی زۆر راسـتی هەیـە: پێویستە یەکـەمجار ئاشـنای لۆژیـك و میتۆدی سۆکراتی بین و، دووەمجار پێویستە لـەو بیروڕایانـە بکۆڵینـەوە کە لەم میتۆدەوە بەرهەم هاتوون.

سـەبارەت بـەمیتۆدی سـۆکرات، لەسـەر دوو پایـەی سـەرەکیی راوەستاوە:

یەکەم: **گومانکردن و گەڕەلاوژەیی**

سـۆکرات بەرامبەرەکـەی بەکۆمـەڵێك پرسـیاری زۆر دادەگرتـەوەو بەئەنقەسـت خۆی وەك کەسێکی نـەزان لـەبارەی بابەتـەکانی باسـەکەوە نیشـان دەدا[78].. تـا ئـەو جێگـەی لـەژێر فشـاری رەخنـە لۆژیکییـدا کـە بـۆی دەردەبـڕی قـەبارەی بەرامبەرەکـەی (کـە وایـدەزانی شـارەزایی فراوانی لەبابەتەکەدا هەیە) بچوکدەکردەوە، ئەو کاتـەی بەرامبـەر دانـی بەنـەزانینی‌و بـەردەوام نـەبونی دیالۆگەکـەدا دەنـاو ئامـادەیی بـۆ وەرگرتنـی بـیروڕای تەندروسـت دەردەبـڕی، سـۆکرات گشـت چـەمکە هەڵـەکانی لـەبیری بەرامبەرەکەیـدا سـڕی بـووەو، ئـەم شـێوازە دوژمنگـەلێکی سەرسـەختی بـۆ سـۆکرات هێنایـە کایـەوە، ئەوانـەی کـە وایانـدەزانی دەزانــن و ناچـاردەکرێن نەزانییەکـەی خۆیـان تـاقی

- Mcdonald, op. cit.. p8.

78 – هاوشێوەی بەختەوەریی‌و دانایی، میانڕەویی‌و ئازایەتی‌و خۆپاراستن و هاوڕێتی‌و جوانی‌و بەهای یاساو گرنگی دەوڵەت و رێگەکانی ئیدارەکردنی.. کێ هەیە خۆی بەپسپۆڕی ئەم بوارانە نەزانێت.

بکەنەوە هەرگیز ئەم مەسەلەیان بەدڵ نەبوو، بۆیە رقیان لەو کەسە دەبووە کە لەئاکامدا بەرەو بارودۆخێکی گاڵتەجاڕی دەبردن.

دووەم: **هەڵهێنجان و بەرهەمهێنان**

پایەی دووەمی میتۆدەکەی سۆکرات هەڵهێنجان و بەرهەم هێنانە: سۆکرات لەرێگەی پرسیارکردن و بەدوای ئەویشدا رونکردنەوەوە یارمەتی بەرامبەرەکەی دەدا تاکو هەقیقەت دەردەکەوێت و بەپێی توانا بیرۆکەی راست لەهزری بەرامبەرەکەیدا لەدایك دەبێت، لەسەریەتی بێ بەزەییانە پرسیارو ئەوەی لەناخدا حەشاردراوە ئاشکرای بکات وداوای باوەڕ هێنان بەهیچ مەسەلەیەك لەمەسەلەکان ناکات، بەڵکو لەرێگەی پرسیارو پشکنینەوە داوای بیر دەکات.[٧٩]

بەڵگەنەویستە سۆکرات لەم وتووێژانەیدا ئەو بیروبۆچون روانگە بیریانەش دەهێنێتە سەرخوان کە بڕوای بەڕاست و دروستیان هەیەو لەم بوارەدا دەتوانین جیاوازی لەنێوان زیاتر لەیەك بیرۆکەدا بکەین:

١. سۆکرات رەخنەی لەدیموکراسی لەشارە کۆنەکانی یۆنان و بەتایبەتی لەشاری ئەتیناو ئەو تیۆرەش کە ئەم دیموکراسییەی لەسەر دامەزراوە ( یەکسانی هاوڵاتیان ودیاریکردنی ئەوانەی کە کاروبارەکانی دەوڵەت لەئەستۆ دەگرن) لەبەرامبەردا سۆکرات پێیوایە کە دەبێت فەرمانڕەوایی لەدەست زانایان و داناکاندا بێت، هەمیشە فەرمانڕەوایی راستەقینە ئەو فەرمانڕواییییە دەبێت کە

---

79- کارل یاسبرز: فلاسفة انسانیون، سەرچاوەی پێشوو.. هەروەها بڕوانە:
-Michale B.Masters of political Foster, thought Gorg, G.Harrop and co. LTD., London., 1942.. p 31.

سەرچاوەکەی زانست و مەعریفەیە نەك تەنیا دەنگدان و پرۆسەی دەنگپێدان.

سۆکرات دژ بەپرۆسەی دەنگدان بوو، لەبەرئەوەی هەل بۆ شکست هێنان و بەهرە دەرەخسێنێت و رەخنەی ئاراستەی فەرمانڕەوایی کۆمەڵەی نیشتمانی خاوەن سەروەری کردوە کە تیایدا ناشارەزاکان بەهونەری سیاسەت و ئەوانەش یەکسان دەبن کە شارەزاییان لەو هونەرەدا هەیەو هەر یەکەیان هەمان دەنگی بەرامبەرەکەی لەبڕیاردا لەمەڕ کاروبارە گشتییەکاندا هەیە.

٢. فەزیلەت لەسەر بنەمای مەعریفەی باڵا بەندە کە لەماناو بەها رەوشتییە جێگیرو سەقامگیرەکاندا پوخت دەبێتەوە[٨٠]، سروشتی مرۆڤ لەبنەڕەتدا چاکەخوازەو ئەگەر لەخۆبایبون و نەزانینەوە نەبێت ستەم و خراپەو هیچ رویەك لەروەکانی ریسوایی لێناوەشێتەوە، ئنجا پێداویستی فێربون هاتوەتە ئاراوە بۆ ئەوەی فەزیلە کە بنچینەی چاکسازیی کۆمەڵگاو سیستمی حوکمڕانیەکەیەتی لێبەهەرم بێت،[٨١].. سیاسەتمەداری چاك ئەو کەسە نییە لەرێگەی سندوقەکانی

---

80– راسل لەمبارەوە دەڵێت: پەیوەندی بەتینی نێوان مەعریفەو فەزیلە کە سۆکرات و ئەفلاتۆنی پێدەناسرێتەوە، دیاردەیەکە "تا ئەندازەیەك" لەبیری یۆنانی بەبەراورد لەگەڵ مەسیحییەتدا" ئەخلاقی مەسیحی دڵی بێگەرد دەکاتە بنەرەتێکی گەوهەری و دڵی بێگەرد کەمتر لەنەزاندا هەیە وەك لەلای زانایان.. ئەم جیاوازییەی نێوان ئەخلاقی یۆنانیو ئەخلاقی مەسیحی تا ئەمڕۆش بەردەوامی هەیە.. بڕوانە: برتراند راسل: سەرچاوەی پێشوو.. ل ١٥٧.

81– مەعریفە بەلای سۆکراتەوە دوو چەشنە: چەشنێکی رواڵەتی ناجێگیر کە هەمیشەیی نییەو چەشنی دووەم" مەعریفەی راستەقینەیە کە بەهەمیشەییو بەردەوامییو راستەقینەی وسایەی بەسەر عەقڵدا دەناسرێتەوە. سۆکرات پێی وابووە پێویستە هەموو مرۆڤێك بەشوێن ئەم چەشنە راستییەدا بگەرێت چونکە ئەگەر مرۆڤ بەباشی خۆی ناسی، ئەوا بۆی دەلوێت بەئاسانی ئەم راستییەش

دەنگدانەوە هەڵبژاردنەکان دەباتەوە یان لەناو ڕاکێشاندا بەخت یاوەری دەبێت، وەك ئەوەی لەئەتینا پەیڕەوی لێکراوە، بەڵکو ئەو دانا زانا ژیرەیە کە زانست و داناییەکانی دەبنە مایەی بڵاوبونەوەی دادوەریی لەنێوان هاوڵاتیانیدا،[٨٢]

لێرەوە دەتوانین بڵێین: ئەو بیروڕایانەی ئەفلاتۆن ، کە دواتر پێشکەشی کردون" لەوەی فەرمانڕەوایی هونەرێکی تایبەتەو کەسانی پسپۆڕی دەوێت و پێویستە ئەو کەسانە زانستپەروەر یان فەیلەسوف بن، لەبیروڕاکانی سۆکراتی مامۆستای وەرگرتوە.

لەواقیعدا بانگەشە بۆ ئەم پرەنسیپی سەروەری مەعریفە دەکرێت زۆر بەئاسانی لەجێبەجێکردنی سیاسیدا ببێتە پرەنسیپ بۆ حوکمڕانی ڕۆشنگەری ڕەها، بۆیە دەتوانین بڵێین: فەلسەفەی سێستمی پاشایەتیو تەنانەت فەلەسەفەی حوکمڕانی ڕەهاش دەشێت سروش لەسۆکراتەوە وەربگرێت، ئەگەر بەم واتا بێت سۆکرات دوژمنی دیموکراسییەت بووە.[٨٣]

٣. دادوەریی پابەندی نەریتەکانی گریکی تایبەت بەبانگەشەی ڕێزگرتن لەیاسایە، ئیتر ئەم یاسانە دەستکردی دانایان بن یان یاسای ئیلاهی بن هیچ جیاوازییەکیان نییە، پابەندبون بەیاساکانەوە گوزارشت لەئاستی چاکەخوازی کۆمەڵ و پێوەری فەزیلەکانی

---

بدۆزێتەوە.. بڕوانە: الدکتور. ابراهیم درویش: سەرچاوەی پێشوو.. ل ٤٧ و هەروەها:

- Barker. Op, cit.. p 101

82- الدکتور. عبدالرحمن بدوی: افلاطون، مکتبة النهضة المصرية، القاهرة-١٩٤٣ .. ل ٥٢-٥٤.

83- Barker. Op, cit.. p 104.

دەکــات.[٨٤].. لــەو بــڕوادا بــوو ڕێزگــرتن لەیاســاکان چەشــنێکە لەملکەچکردنی خواستە دنیاییەکانی ناخی مرۆڤ لەبەردەم شتێکی باڵاتردا کە عەقڵەو، سوکرات ژیانی خۆی لەپێناو پابەند بوون بەبڕیاری یاساوە بەخشی، تەنانەت ئەگەر ئەو یاسانە ستەمکاریش بن.[٨٥]

٤. ڕێزگرتنی کۆمەڵ لەیاساکانی پرەنسیپێکی دیکەی لێدەبێتەوە کە خۆی لەپەیوەست بوون بەباڵا دەستی بڕیارەکانی یاسادا دەبینێتەوە: واتە ملکەچ بوونی تاکەکانی کۆمەڵ بەفەرمانڕەواو ژێردەستەو سەرجەم دامەزراوەکانی لەبەردەم ئەو یاسا گشتییانەی دەستور یان یاسای بنەڕەتی ئەو کۆمەڵگایە دیاریکردون، نەك ملکەچ بوون لەبەردەم ئارەزو یان خواستە ناجێگیرەکانی فەرمانڕەواکان.[٨٦]

ئەمە هاندەرمان دەبێت بەکورتی باس لەو نەهامەتییە بکەین کە ئەم فەیلەسوفە لەدوا ساڵەکانی ژیانیدا دوچاری بووە کە ئەویش داگایکردنیەتی:

بەگوێرەی ئەو دیالۆگەی کە ئەفلاتۆن لەوتوێژی بیانوهێناوە The Apoloy پێشکەشی کردوە" ناوەڕۆکی ئەو تۆمەتەی کە هەریەك لەمێلێتیوس Meletus شاعیری تراژیدیای مەغموریو ئەنتیوس Anytus سیاسەتمەداری دیموکراسیخواز سۆکراتیان پێتاوانبارکرد بریتییە لەوەی کە سۆکرات کەسێکی تەڵەکەبازو

---

84- الدكتور. عبدالحميد متولى: الوجيز فى النظريات و الانظمة السياسية و مبادئها الدستورية، دار المعارف، القاهرة-١٩٥٩.. ل ٤٠.

85- بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: اندرية كريسون: سقراط: سەرچاوەی پێشوو.. ل ٥٢.

86- الدكتور. عبدالحميد متولى: سەرچاوەی پێشوو.. ل ٢٠-٢١.

خاوەن هەڵسوکەتی نامۆو بەشوێن شتە خراپەکانی ئاسمان و ژێر زەویدا دەگەڕێت و ناڕەوا بەرواڵەت دەکاتە ڕەواو بەناو خەڵکدا بڵاویدەکاتەوە، بەواتایەکیتر دەستی لەپەرستنی خواوەندەکانی دەوڵەت هەڵگرتووەو لەجێگەیاندا خواوەندێکی نوێی داناوەو گەنجەکان بەپەروەردە کردنیان لەسەر پرەنسیپەکانی خۆی لە ڕێگە لادەدا.[٨٧]

لەم سەروبەندەدا، ئەو تۆمەتانەی ئاراستەی سۆکرات دەکران، دوو تۆمەتی سەرەکین:

یەکەم: تۆمەتی ئایینی" کە خۆی لەنکوڵیکردنی سۆکرات لەخواوەندەکانی دەوڵەتدا دەبینێتەوە.

دووەم: تۆمەتی ئەخلاقی" کە پەیوەستە بەدیاردەی گەندەڵکردنی گەلی ئەتینا.[٨٨]

## سۆکرات چۆن ئەم تۆمەتانە ڕەتدەکاتەوە؟

سۆکرات سەرەتا دەستدەکات بەوتوێژ کردن لەگەڵ میلێتیوس کە خۆی بەپیاوچاك دادەنێت گوایە ڕاستگۆیانە نیشتمانی خۆی خۆش دەوێت و، پرسیاری لێدەکات: کێن ئەوانەی لاوەکان چاکدەکەن؟.. میلێتیوس لەوەڵامدا یەکەمجار ئاماژە بەدادوەرەکان دەکات.. ئنجا دەست بەقسەکردن دەکات و دەڵێت:

87- برتراند راسل: سەرچاوەی پێشوو.. ل ٤٧. بەراوردی بکە لەگەڵ
- Mcdonald, op. cit.. p 9.
88- الدكتور. ابراهيم شلبي: سەرچاوەی پێشوو.. ل ٤٣. هەروەها بڕوانە:
- Barker. Op, cit.. p 107.

**(( گشت هاونیشتمانیانی ئەتینا جگە لەسۆکرات گەنجەکان بەرەو چاکە دەبەن.))**

سۆکرات پیرۆزبایی لەئەتینا دەکات کە لەپەروەردەکردنی گەنجەکاندا بەخت یاوەری بووە و دەڵێت:

**(( مرۆڤ لەناو خەڵکانێکی چاکەخوازو خاوەن فەزیلەدا بژی زۆر باشترە لەوەی لەناو میللەتێکی خراپدا بژی، بۆیە ئەستەمە بگاتە ئەو ئەندازەیە لەگێلی کە بەئەنقەست نەوەکانی شارەکەی بەرەو هەڵدێر ببات، خۆ ئەگەر لەنەزانییەوە لەخشتەی بردبن ئەوا ئەرکی سەرشانی میلێتیوس ئەوەیە رێنوێنی بکات نەك تۆمەتی ئاراستە بکات.))**

ئنجا رودەکاتە ئەتینییەکان ودرێژەی بەوەڵامەکەی دەدا:

**(( خواوەند فەرمانی پێکردوم کە پەیامی فەیلەسوف بگەیەنم کە بریتییە لەگەڕان لەناخی خۆم و لەناخی گشت خەڵکیدا.. تا ئەو دەمەی زیندوبم و توانام تێدابێت دەستبەرداری پیادەکردنی فەلسەفەو بنەماکانی نابم، هەرکەسێك ببینم بانگێشتی دەکەم، بزانن ئەمە فەرمانی خواوەندەو لەو بڕوادام دەوڵەت هەرگیز خزمەتێك لەو خزمەتە باشتری دەست ناکەوێت کە من پێشکەشی خواوەندی دەکەم.))[٨٩]**

ئنجا هێرش دەکاتە سەر دادوەرەکان و دەڵێت:

**(( ئەگەر بڕیاری مەرگتان بەسەر مندا سەپاند، زیانێ بەخۆتان دەگەنن زیاتر لەو زیانەی لەمن دەکەوێت.. بەئاسانی کەسێکی هاوشێوەی من نادۆزنەوەو ئەگەر بکرێت ئەم لێکچواندنە گاڵتەجاڕەییەتان بۆ بگێڕمەوەو، دەموت: من جۆرێکم لەمێشولە پیسەی مانگا خواوەند بۆ نەتەوە رەوانەی کردوم**

---

89- برتراند راسل: سەرچاوەی پێشوو.. لا ١٤٩-١٥١.

**تاكو لارييەكانى راستبكەمەوە، ئێوەش لەو خەوتوە دەچن كەمێشولە بەخەبەرى هێناوە، تورە بوون و لێم دەدەن تاكو پاش ئەوە، بەدرێژايى ژيانتان بخەونەوە.))**[٩٠]

دوابەدواى ئەوەى دادگا بەزۆرينەى ٢٨١ دەنگ بەرامبەر بە٢٢٠ دەنگ تاوانباريكردو ئەو سزايەشى رەتكردەوە كە سۆكرات بۆ خۆى پێشنيارى كردبوو: بڕێك فديە يان غەرامەيەكى كەم بدات، دادگا سزاى مەرگى بەسەردا سەپاند، سۆكرات بەمجۆرە لەگەڵ دادوەرەكان هاتە گۆ:

(( **لەبەردەمتان رادەگەيەنم ئێوە، ئەوانەى بڕيارى لەناوبردنى منتان دەرچواند سزاكە بەخێرايى پاش مردنى من ئێوەش لەناودەبات، ژمارەى ئەوانەى روبەڕوتان دەبنەوە زۆر زياترو زۆر دڵڕاقانەترو ترسناكتر دەبن.. زۆر هەڵەن ئەگەر وابزانن بەسزاى لەسێدارەدان كەسێك لەناو دەبەن كە ژيانە بێ بەهاكەتان لێتێكدەدات.))**[٩١]

بەمجۆرە وتوێژى بيانوهێناوە وێنەيەكى رونمان لەبارەى كەسێكى بێوێنە دەداتێ:

كەسێك" متمانەيەكى زۆرى بەخۆى هەيەو بيرۆكەكانى دەگەيەنێتە بەرزترين لوتكە، گوێ بەسەركەوتن لەژيانى دنيايىدا نادات و لەو بڕوادايە لەلايەن دەنگى پيرۆزەوە رێنوێنى دەكرێت و بڕواى بەوەش هەيە" بيركردنەوەى رون گرنگترين رەگەزێكە لەژيانى تەندروستدا پێويستمان پێى ببێت.

---

90– كارل ياسبرس: سەرچاوەى پێشوو.. ل ٢٦.

91– هەمان سەرچاوەى پێشوو.. ل ٢٦.

دادگایکردنەکـــەی ســـۆکرات، لەراســـتیدا دادگـــایکردنێکی سیاسـیانە بـووەو نـاوەڕۆکی ئـەو تۆمەتانـەی درابونـە پـاڵی تۆمـەتی سیاسـین، ئـیتر ئەگـەر بەکەسـێکی بیریـار وەسـفبکرێت یـان نـە، لـەوە دڵنیاین لەپێناو بیرۆکە هزرییـەکانی لەمەڕسیاسـت بەشـەهیدی سـەری نایـەوەو، سـۆکرات لەچـەندین روانگـەوە رەخنـەی لەخەسـڵەتەکانی دیموکراسـیەتی ئـەتینا دەگـرت، لـەو خەسـڵەتانە: پەنابردنـە بـەر سـندوقەکانی دەنگـدان، دامەزرانـدنی کۆمـەڵی گشـتیو نـەزانی فەرمانڕەوایانی ئەتینا.. وادەردەکەوێت بانگەشەی ئەوەی کردوە کە چارەسـەری سیاسـی پێویسـتی بەفەلسـەفاندنی مەعریفـە هەیـە، بێگومان فێرکردنی لەم چەشنە لەدەوڵەتێکی دیموکراسیدا لەباشترین گریمانـەدا بـەئینتیما نـەبون بـۆ دەوڵـەت و لـەخراپترین گریمانـەدا بەخیانەتی مەزن دادەنرێت.[٩٢]

سـۆکرات لەبەرئـەوەی بەهەرەشـە لەسـەر سێسـتمی سیاسـی دەوڵـەت دادەنـرا بەمـەرگ گەیـەنرا، بەومانایـە کـە تۆمـەتی ئایینی وەك بیرۆکـەی دواتـر یـان دەرئـەنجامی تۆمەتـە سیاسـیەکە مامەڵـەی لەگـەڵ کـراوە، بۆیـە نـاوی بەنـەمری وەك یەکـەمین شـەهیدی ململانێـی نێـوان بیرو سیاسەت، نێوان ئازادییو سـەرکوتکردن، نێـوان بیرو هێز، نێوان هـزرو لـۆژیکی سـۆکرات و نێـوان دەسـڵات و گەنـدەڵی ماوەتـەوە، سـۆکرات بـووە ئەفسـانەی کۆششـی ئـەو مرۆڤـەی کـە خـاوەن هـزرو بیروبـاوەڕو رەوشـت و پرەنسـیپ و چاکەیە، ئەو مرۆڤـەی کـە دەبێـت مرۆڤایەتی وابێت.[٩٣]

---

92- Barker. Op, cit.. p 109.

93- الدكتور. ابراهيم درويش: سەرچاوەی پێشوو.. لا ٥١.

ئایا مەرگی سۆکرات کۆتایی بەو کاریگەرییە هێنا کە لەشێوازی گفتوگۆکانیدا بەکاری دەهێنا لەسەر کۆمەڵگەی ئەتیناو هەروەها لەسەر ئەو کۆمەڵگانەی تریش کە دوای کۆمەڵگەی ئەتینا هاتن؟

مەرگی سۆکرات راچەڵەکینێکی‌دا بەکۆمەڵگەی ئەتینا، هاورێکانی باسیان دەکردو شایەتی باشەیان بۆ دەداو ئەدەبیاتی سۆکراتی کە ئەفلاتۆن نمایندەی روە گەورەکەی دەکات، لەدایکبوو، هاورێکانی سۆکرات دەستەوەستان نەبوون، لەگەڵ ئەوەی سۆکرات هیچ شوێنەوارێکی لێبەجێنەماو مەزهەبێکی تایبەتی نەبوو، گەورەترین بزاوتی فەلەسەفی لەیۆنان سەریهەڵداو سۆکرات تەنیا یەکجۆر لەرەنگدانەوەی لەسەر خوێندکارەکانی نەبووە، لەبری تەنیا قوتابخانەیەك چەندین قوتابخانەی بەجێهێشتوە" لەوانە[٩٤]:

١. قوتابخانەی **میگاریەکان** Megriques کە بایەخی بەلۆژیك و زمانلوسی دەدا.

٢. قوتابخانەی **ئەلیس _ فیدۆن** کە پەرەی بە توێژنەوە جەدەلییەکان دەدا.

٣. قوتابخانەی **سینێکی** Cynique یەکان بەڕابەرایەتی ئەنتسێنێس Antisthenes رێبازی دڵنەوایی سەلبیو نکۆڵیکردن لەرۆڵی پەروەردەو رۆشنبیریی.

---

94- کارل یاسبرس: سەرچاوەی پێشوو.. ل ٤٢. هەروەها: مارکریت تیلور: سەرچاوەی پێشوو.. ل ٩٠-٩٢.

٤. قوتابخانەی **قۆریانییەکان** Gyreniaque کە بایەخی بەشیکردنەوەی ئەفراندنەکانی سروشت و مەرجەکانی چێژوەرگرتن دەدا.

ئەفلاتۆن لەبەرامبەر ئەم قوتابخانانەدا لەروی بیرفراوانیو قوڵبونەوەو توانای لەرونکردنەوەو خستەنەڕو هەڵوێستێکی رونی هەبووە، بەجۆرێك بەرەو ئایندەی تەوژمی بیری سۆکراتی بەرێت.

وەك چۆن سۆکرات کاریگەری زۆری لەسەر نەوەکانی دوای خۆی بەجێهێشتوە: زۆربەی فەیلەسوفەکانی سەردەمە کۆنەکان سۆکراتیان بەفەیلەسوفی هەقخوان داناوەو کەسایەتییەکەی لەسەردەمەکانی دواتریشدا پێگەیەکی باشی پێبڕاوە، پیاوانی کڵێسا بەپێشەنگی شەهیدە مەسیحیەتیان لەقەڵەمداوە، لەبەرئەوەی سۆکرات هاوشێوەی ئەوان خۆی لەپێناو بیروباوەڕەکەیدا بەختکردوەو تۆمەتی خیانەت لەئایینی باوی دراوەتەپاڵ، لەسەروی ئەمانەوە لەگەڵ مەسیح ناوی دەهێنن، ئەگەرچی لەسەدەکانی ناوەڕاست ناوی سۆکرات خامۆش بوو، سەردەمی رۆشنگەری جارێکیتر هاوکات لەگەڵ دەرکەوتنی بیری سیاسی سەربەخۆ ناوەکەی گەشاندەوەو بەنمونەی ئەو فیکرە تەماشادەکرا.. واقیعی سۆکرات ئەو کاتانەی ناسراوە یان بەتەواوی نکوڵی لێکراوە بەجۆرێك لەجۆرەکان بووەتە ئەو پێگەی کە سەدەکان و مرۆڤەکانیش کێشە تایبەتەکانی خۆیان بۆ زیادکردوە.[٩٥]

---

95- کارل یاسپرس: سەرچاوەی پێشوو.. ل ٤٤-٤٥.

## سێیەم: ئەكزینفۆن - Xenophon

ئەگەر بێتو ئەو بیروبۆچونە سیاسیەکانی پاش سۆکرات دیاریبکەین، ناوی ئەکزینفۆن وەك کەسێکی فەلسەفی دیار لەبەردەماندا زەقدەبێتەوە کە شوێنپێی سۆکراتی مامۆستای هەڵگرتوەو بەئەنجامگەلێك گەیشتوە، تەواو جیاواز لەو ئەنجامانەی کە دواتر ئەفلاتۆن پێی گەیشتوە.

ئەکزینفۆن هاوشێوەی ئەفلاتۆن بەرەنگاری دیموکراسیو شێوازی ژیانی ئابوریی ئەتینا بوەتەوەو رەخنەی لەو لایەنانەی کەموکورتی گرت کە رێگریان لەژیانی سیاسی ئەو شارە دەکرد، کاتێك بەشوێن چارەسەردا دەگەرێت هاوشێوەی ئەفلاتۆن لەحکومەتێکی ئەلتەرناتیڤی ئیدیاڵدا چارەسەر نابینێتەوە، بەڵکو لەو میانەوە کە فەرمانڕەوایی لەئەتینا بکاتە حوکمێکی نمونەیی سەربەخۆ کە لەروکاردا لەدەوڵەتی فارس و لەواقعیشدا لەسپارتە بچێ.[96]

پێدەچێت ئەم هەڵوێستەی ئەکزینفۆن لەچەندین فاکتەرەوە سەرچاوەی گرتبێت، لەوانە: ئینتیما خێزانیەکانیو کاریگەریی سۆکرات لەسەری لەگەڵ کاریگەری سیستمی باوی سپارتە" ئەکزینفۆن ئەندامی خانەوادەیەکی ئەرستۆکراتی دەوڵەمەندە، ئەمەش وایکرد هەوڵی بەدەستهێنانی پێگەیەکی بەرزو تایبەتی لەکۆمەڵگەدا بدات و هاوشێوەی وەك سۆکرات هێرش دەکاتە سەر دیموکراسی کە پشت ئەستور نییە بەمەعریفە بەسیستمێکی نەزان و

---

96- Barker. Ernest, The Political thought of plato and Aristotle, op cit., p. 55.

کوێرانە ناودەبات و چاکەی سێستمی ئەرستۆکراتی دەدا بەسەریداو، بەئەندازەیەك سەرسامە بەرامبەر بەسێستمی سیاسی سپارتە، هانیداوە پەیوەندی بەسوپاکەیەوە بکات و لەدژی دوژمنەکانی بجەنگێت.[٩٧]

لەکتێبەکانی ئەکزینفۆندا حوکمڕانی وەك یەکێك لەگرنگترین کارە مرۆییەکان باسی لێوەکراوە: دەوڵەت پێویستە وەك سوپا وابێت "ئەگەر گەیشتە هەمان لێهاتویی سوپا" ئەوا لەسەر سێستمێکی تایبەت و قبوڵکراو و گونجاو دادەمەزرێت بەبێ جیاوازی لەنێوان ئاستی تاکەکەسەکان و ئەوانەی پەیوەستن بەمەسەلەکانی ڕێکخستن و دابەشکردنی کارەوە، فەرمانڕەوایی پێویستە بۆ ئەو کەسە داناو ژیرە بێت کە لەژێر سەرکردایەتیدا تاکەکەسەکان ئەو کارانەی دەیزانن ئەنجامی‌دەدەن و ئەوانەش کە پێویستە ئەنجام بدرێن.[٩٨]

**ئەکزینفۆن شێوازەکانی سێستمی فەرمانڕەوایی بۆ پێنج سێستم و شێواز پۆلێن دەکات:**

١. **سێستمی پاشایی دەستوریی.**

٢. **سێستمی زۆرداریی** خاڵی هاوبەشی لەگەڵ پاشایەتی دەستوریدا" دەسڵات لەدەستی تەنیا تاکەکەسدایە.[٩٩]

---

97– الدكتور. نزار الطبقجلي: الوجيز في الفكر السياسي: سەرچاوەی پێشوو.. لا ٤٨-٤٩.

98 - Barker. Op, cit.. p 55.

99– تۆشار ئاماژەیکردوە بەوەی کە پادشایەتی وەک سێستمی فەرمانڕەوایی لەلایەن گریکەکانەوە خوازراو نەبووە بەدامەزراوەیەکی بەربەریان لەقەڵەمداوە، بەڵام زۆرداری یادگارییەکی تاڵی لای یۆنانییەکان بەجێهێشتوە.. ئەکزیفۆن جیاوازیکردوە لەنێوان پادشاو زۆرداردا: پادشا بەپێی دەستورو بەخواستی گەل

٣. **سێستمی ئەرستۆکراتی.**

٤. **سێستمی بلۆتۆکراتی**" واتە فەرمانڕەوایی دەوڵەمەندەکان، خاڵی هاوبەشی لەگەڵ سێستمی ئەرستۆکراتیدا: دەسڵات لەهەردوو سێستمەکەدا لەدەست خەڵکانێکی دیاریکراودایە.

٥. سێستمی دیموکراسی کە تێیدا دەسڵات لەدەستی زۆرینەی خەڵکدایە.[100]

کاتێک ئەکزینفۆن لەباسی سێستمەکاندا هێرش دەکاتە سەر سێستمەکانی: دیموکراسیو زۆرداریو بلۆتۆکراتیو، بانگەشەی تێکەڵکردنی هەردوو سێستمی ئەرستۆکراتیو پاشایەتی لەسێستمێکدا دەکات.

ئەکزینفۆن لەکتێبی بیرەوەرییەکان Memorabilia هەندێك وتەو بیربۆچونی کۆمارەکەی ئەفلاتۆن و سیاسەتەکەی ئەرستۆ دوبارە دەکاتەوە، بەتایبەت بیروڕاکانی ئەفلاتۆن سەبارەت بەفێرکردن کە بەگوێرەی ئەفلاتۆن و دوای ئەویش ئەکزینفۆن" نابێت یاساکان ئامانجیان تەنیا قەدەغەکردنی تاوان بێت، بەڵکو دەبێت ئەوە تێپەڕێنن بۆ دیاریکردنی رەفتارەکانی مرۆڤ لەناو کۆمەڵ و بەدیهاتنی دادوەریی.. وەك چۆن نابێت فێرکردن بۆ دامەزراوە تایبەتەکان بەجێ بهێڵرێت، بەڵکو پێویستە دەوڵەت ئەو کارە ئەنجام بدات تاکو

---

فەرمانڕەوایی دەکات لەکاتێکدا دەسڵاتی زۆردار پشت نەبەیاساکان و نە بەرەزامەندی گەل نابەستێت، بێگومان ئەم پۆلێنکردنە لەبەرژەوەندی پاشایەتییەو چاکەدانیەتی بەسەر گشت سێستمەکانی تردا..
لەمبارەوە بڕوانە: جان توشار: تاريخ الفكر السياسي، ترجمة: الدكتور علي مقلد، دار العالمية للطباعةو التوزيع، بيروت-١٩٨٣.. ل ٢٧-٢٨.

100- الدكتور. ثروت بدوی: سەرچاوەی پێشوو.. ل ٥٥.

لەمیانەیەوە هەندێك لەئامانجەكانی بەدیبهێنێت، تێبینی دەكرێت ئەكزینفۆن بایەخی بەفێربونی سەربازیی داوەو سەرسامی سێستمی كارپێكراو لەهەردوو وڵاتی فارس و شاری سپارتە بووە.[101]

لەبەر رۆشنایی ئەم روانگانەدا، ئەكزینفۆن تەبەنی بیرۆكەی گریكەكان سەبارەت بەدەوڵەت دەكاتو بەوەی دامەزراوەیەكی ئەخلاقی فێركارییەو لەسەریەتی بایەخ بەئەخلاق و فێركاریی بدات، دواجار تەرخانكردنی كۆششەكانی فەرمانڕەوا لەپێناو ناشتنی رەوشتی بەرزو دانایی لای تاكە كەسەكان.

101- Barker. Op, cit.. p 55

ئنجا بەراوردی بكە لەگەڵ: الدكتور. ابراهيم درويش: سەرچاوەی پێشوو.. ل ٥٣.

## بەشی دووەم

# فەلسەفەی سیاسی ئەفلاتۆن

ئــــەفلاتۆن[102] و ئەرســـــتۆ دوو گـــــەورەترین فەیلەســــوفن کــــە لەســەردەمەکانی کـۆن و نـاڤین ونوێـدا زۆرتـرین کاریگـەرییان لـەدوای خۆیان بەجێهێشتوە، ئەفلاتۆن زیاتر لەئەرستۆ لەسەر نـەوەکانی پاش خۆی کاریگەری هەبووە، لەبەر دوو هۆکاری سەرەکیی:

---

102- ئــەفلاتۆن لەنزیکــەی ســاڵی (٤٢٧ پــێش زایــین) لــەخێزانێکی ئــەتیناى ئەریستۆکراتی دێرین هاتوەتە دنیـاوەو لەساڵی (٣٤٨ پـێش زایـین) کۆچی دوایـی کـردوە، هاوچەرخی شەڕە کۆتاییەکانی پلۆپۆنیز بووەو پەیوەنـدی بـەتینی لەگـەڵ ژمارەیـەک لەئەنـدامانی حکومـەتی چەوسـێنەری سییەکاندا هـەبووە کـە پـاش شکستهێنانی لەبارەبەر سپارتەدا فەرمانڕەوایی ئـەتیناى کـردوە، ئـەم شکسـتە هاندەری هاتنەکایەو پتـەوبونی پێگـەی دیموکراسـی لێکـەوتـەوە کـە ئـەفلاتۆن بەهۆی پێگە کۆمەڵایەتی و پێوەندییە خێزانییەکەی رقی لێدەبووە.
قوتـابی بەردەسـتی سۆکرات بـووەو خۆشەویسـتی و ڕێزێکـی بێپایـانی لەسۆکرات گـرتـوەو کــاتێکیش بڕیـاری لەسـێدارەدانی بەسـەردا سـەپاندو بـەو چارەنوسـە داڵتەزێنەیان گەیاند، ڕوداوەکە کاریگەری لەسەر ئـەفلاتۆن هـەبو، بـیری پڕکـرد لەڕق و کینە بەرامبەر بەدیموکراسی و جەماوەرو ئەم ڕق و کـینەیـە هانیـدا داوای لـەناوبردن و گـۆڕینی دیموکراسـی بـدات بەدوکمڕانییـەکی عاقڵانـەترو چـاکتر لەفـەرمانڕەوایی کەسـەکان، بـۆ ئەمـەش چـاوی بڕیبـووە سپارتە بـۆ دۆزینـەوەی ڕەگەزگــەلێک کـــە پشـــتگیریی بـــن لـــەدیاریکردنی نمونـــە باڵاکـــانی دەوڵەتەکەیــدا، ئنجــا هەوڵــەکانی خســتەگەڕ لــەپێناو ئاشــنابون و گــەڕان بەمەبەستی زیاترکردنی مەعریفەو سەردانی هەریەک لەمیسرو بابـل و فەلەسـتین و سەقلیەو کەنارەکانی کەنجی کرد.. بڕوانە: سباین: سەرچاوەی پێشوو.. ل ٤٣-٤٥. لەگەڵ:
- Cokar, Francis., Reading in Political Philosophy, The Macmidan Co., N.Y., 1938 .. P 1.

یەکــــەم: ئەرسـتۆ خـودی خـۆی وەك دەرئـەنجامێك لەئـەفلاتۆن جیابوەتەوە.

دووەم: لاهـوتی مەسـیحی و فەلسـەفەی مەسـیحییەت "لانـی کـەم تاسـەدەی سـیانزەیەم" بەبـەراورد لەگـەڵ ئەرسـتۆ زیـاتر بـەمۆرکی ئـەفلاتۆنی رەنگرێـژ کـراوە، کەواتـە وادەخوازێـت لەمێـژوی بـیری سیاسـی سـەرەتا بچـینە لای ئـەفلاتۆن "و دواتـر ئەرسـتۆ" و بەتێروتەسـەلی چارەسـەری فەلسـەفەکەی بکـەین، تێروتەسـەلتر لەچارەسـەری فەلەسـەفەی هـەر فەیلەسـوفێکی پـێش یـان پاشـی خۆی.[١٠٣]

ئـەفلاتۆن بـەدیارترین قوتـابی سـۆکرات کـە بیرۆکـەی بنـەڕەتی فەلەسـەفەکەی لێوەرگرتـوە، دادەنرێـت.. ئـەو بیرۆکـەی هەمیشـە باڵـی بەسـەر فەلسـەفە سیاسـیەکەیدا کێشـاوە کـە بریتییـە" فەزیلـەت مەعریفەیـە، ئـەفلاتۆن بەشـوێنپیێ هـەڵگرتنی مامۆسـتاکەی بەرامبـەر وتنەوەی وانەکانی فەلسەفە کرێـی وەرنەگرتوە، کە پێیوابو" مەعریفە لەرێگەی فێربونەوە بەدەست نایەت، بەڵکو لەرێگەی نـاخی دەرونەوە بـۆ مـرۆڤ ئاشـکرا دەبێـت، یـان ئـەوەی زانـین بیرکەوتنـەوەو نـەزانین لەبیرچـونەوەیە، ئـیتر چـۆن مامۆسـتا لەبەرامبـەر شـتێکدا کـرێ وەردەگرێت کە نە هی ئەوەو نەئەویش دەیبەخشێت.

ئەفلاتۆن بەشێوازی مامۆستاکەی لەپرسیارو خۆگێلکردن و خۆ بەنـەزانکردن بـۆ گەیشـتن بەمەبەسـتەکەی، کاریگـەر بـووەو تەنانـەت سـۆکراتی کردوەتــە جەمسـەری وتوێـژەکان و خـاوەن وتـەی یەکلاکـەرەوە لەگشـت بابەتەکانـدا، لەراسـتی دورناکەوێنـەوە ئەگـەر

103- برتراند راسل: سەرچاوەی پێشوو.. ل ١٧٦.

بڵێین: وتوێژەکانی ئەفلاتۆن گەواهیدان بووە لەسەر مەزنی سۆکرات لەبەخەبەرهێنانی رۆح و حەماسی حەزبەزانین و چاکە لەدەرونی گەنجەکانی سەردەمەکەیدا، ئەفلاتۆن و نوسراوەکانی بەڵگەی تەواوی ئەم راستییەن.[١٠٤]

جەنگەکانی پۆلۆپۆنیزو کۆتایی درامی ژیانی سۆکرات کاریگەریی گەورەیان لەسەر دروستبونی بیری سیاسی ئەفلاتۆن هەبووە، ئەوەندە هەیە ئەم روداوانە نەیانتوانی بەر بەو بیروبارەی ئەفلاتۆن بگرن کە پێیوابوو" بەشداریکردن لەچاکی سیاسیدا ئەرکەو پێویستە بەئەنجامی بگەیەنێت، بۆیە هیچ دولێیەکی لەبەشداریکردن لەهەولەکانی دامەزراندنی ژیانی سیاسی لەدورگەی سیراکیۆز Syracuseدا دەرنەبڕیوە لەیارمەتدانی دیون Dionی هاوڕێی کە دەیوست لەرۆشنبیرکردن و ئامۆژگاریکردنی دیون یسیوسی دووەم Dionysiusll پاشا گەنجەکەی ئەو دورگەیەدا رۆڵی هەبێت، ئومێدی گەورەی هەبوو کە لەمیانەی جێبەجێکردنی بیرە فەلسەفییەکانەوە ببێتە پێشەنگ بۆ پاشاکانی تری جیهانی هێلینی، بەڵام ئەفلاتۆن دەستبەرداری ئەوە بوو کە دەوڵەتە ئیدیاڵەکەی لەژینگەیەکدا دابمەزرێنێ کە زەمینەسازیی ئەو دەوڵەتەی نییەو هەروەها لەبەرئەوەی دیون یسیوس پاشا گەنجەکە بڕوای بەسودو کاریگەریی حیکمەتە ئەبستراکەکان نەبو.[١٠٥]

---

104– الدكتور. على احمد عبدالقادر: سەرچاوەی پێشوو.. ل ٥٧.

105– ئەفلاتۆن ئەم کارەی خۆی بەم وتەیە پاساو دەدات و دەڵێت:... لەگەڵ خۆم کەوتمە گفتوگۆو راڕابوم لەرۆشتن.. تا لەکۆتایدا بڕوام بەبیروبۆچونەکەی (دیۆن) هێنا ئەویش ئەگەر بواری رەها بۆ فەیلەسوف بڕەخسێت بۆ بەجێگەیاندنی بیروباوەڕەکانی لەبارەی پاسادانان و فەرمانڕەوایی، ئەم بۆنەیە گونجاو بو بۆ

ئەم شکستە پاڵی بەئەفلاتۆنەوە نا بگەڕێتەوە بۆ ئەتیناو لەو شارەدا فێرگە فیکرییەکەی بەناوی ئەکادیمی Academy لەباخچەی ئەکادیمۆس لەنزیك ئەتیناوە دابمەزرێنێت.. ئەم قوتابخانەیە بەبنچینەی گشت ئەو زانکۆیانە دادەنرێت کە بەدرێژایی مێژوو دامەزراون.[١٠٦]

هەروەها فێرگەکەی ئەفلاتۆن ئەکادیمی بەیەکەمین پەیمانگا دادەنرێت کە گوزارشتی لەهەقیقەتی رێکخستنی رۆشنبیریی کردبێت، پرەنسیپەکە لەبنەڕەتدا خۆی لەجێبەجێکردنی ئەو بیرۆکەیەدا دەبینێتەوە کە دەڵێت: پێویستە پێکگەیشتنێك لەبارەی کەسێتی بیرکەرەوە هەبێت بەمەبەستی گەڕان بەدوای هەقیقەتدا، هەقیقەت لەبەرئەوەی بەدەوری بەهاکاندا دەخولێتەوە، هەمیشە شارستانییە، بەهاکان لەیۆناندا بەهایەکی سیاسین، لەبەرئەوەی لەشارەوە سەرچاوە دەگرێت و پەیوەستە بەشارەوە.

شار ناکرێت بێجگە لەکۆمەڵگایەکی سیاسی بەهیچ شێوەیەکی تر تەماشا بکرێت و ئەفلاتۆن خەسڵەتی رێکخستن بەواتای جێگریو سەقامگیری بەپێکگەیشتنی نێوان بیرمەندو قوتابییەکانی دەبەخشێت، لەوێدا نوسینگەو هۆڵی موحازەرات و شوێن بۆ مانەوە هەیەو خەڵکێك هەن کە خۆیان بۆ پیادەکردنی ئەو چالاکییە

---

تاقیکردنەوەی ئەزمونەکەی.. ئەم دەستەواژانە رێنویانکردم (نازایانە) لەدەرەوەی نیشتمانی خۆم رێنوێنیان کردم... لەژێر سەپاندنێکی ئەخلاقی بەهێزداو بۆ ئەوەی رێزی خۆم لەلای خۆم نەدۆڕێنم، لەبەرئەوەی روبەڕوی مەترسی لەدەستدانی ئەو رێزە دەبومەوە، کەواتە گەیشتمە ئەو بڕوایەی کە من تەنیا بریتیم لەدەنگی کەسێک کە هەرگیز بەهیچ کارێک هەڵنەساوە، تەنانەت ئەگەر بتوانێ لەدوری باڵێکیشەوە بێت..بڕوانە: هەمان سەرچاوەی پێشوو.. ل ٥٨.

106- Foster, op. cit.. p 33.

تەرخانکردوە.. ئەکادیمیای ئەفلاتۆن کە نزیکەی دە سەدە بەناوی خۆیەوە ماوەتەوە هۆی بڵاوبونەوەی رۆشنبیریی‌و مەعریفە بووە لەباشوری دەریای سپی ناوەڕاست.[١٠٧]

بەڵام ئایا سروشتی ئەو میتۆدەی لێکۆڵینەوەیە چییە کە لەئەکادیمیا کاری پێکراوە؟.. ئەو بابەتانە چین کە تیایدا جێی بایەخی ئەفلاتۆن بوون؟..

ئەفلاتۆن لەکارکردنی خۆیدا پشتی بەیەکێك لەشێوازەکانی توێژینەوەی سیاسی بەستووە: گەڕان بەشوێن چەمکە ئیدیاڵەکاندا لەرێگەی پشتبەستن بەشێوازی وتوویژی پەیوەست بەپابەندبونی سیاسییەوە: حکومەتی نمونەیی چییە؟.. باشترین سیستمەکانی فەرمانڕەوایی چین؟.. چۆن سەرکردەی سیاسی ئەرکەکانی سەرشانی جێبەجێدەکات؟.. مەودا کۆتاییەکانی کیانی سیاسی چییە" سیستم، سەربەخۆیی، ئاسایش، دادوەریی‌و یەکسانی؟.. ئەگەر ئەم چەمکانە تێکەڵ بەیەکتری بوون، چاکەو فەزڵ بۆ کامیان دەگەڕێتەوە؟.. چۆن لەو ساتەوەختەدا دیاریدەکرێت؟..[١٠٨]

ئەو مەعریفەو زانستانەی ئەکادیمیا بایەخی بەلێکۆڵینەوەیان دەدا، زۆرن و لەدیارترینیان: فەلسەفە. زانستە مرۆڤایەتییەکان، زانستی وەرزش، زانستی سروشتی و ژیانناسی.. لەگەڵ پێویستی ئاگابون لەوەی کە فەلسەفە تاجی سەری گشت ئەو زانستانەو ئەو ئامانجەیە لەرێگەی زانستەکانی ترەوە قوتابی دەیەوێت پێی بگات.

---

107- الدکتور. حامد ربیع: سەرچاوەی پێشوو.. لا ١٣٦

108- الدکتور. حامد ربیع: نظریة التحلیل السیاسی، المحاضرات التی ألقیت علی طلبة کلیة الاقتصادو العلوم السیاسیة، جامعة القاهرة، مکتبة القاهرة الحدیثة- القاهرة (١٩٧٠-١٩٧١).

لایەنی میتۆدو لایەنی فیکر کە بنەڕەتی فەلسەفەی سیاسی ئەفلاتۆنە وتوێژە زۆرەکانی لەخۆدەگرێت لەگەڵ کتێبەکانی، کە بەناوبانگترینیان بریتین لە[109]:

١. **کتێبی کۆمار**- Republic

٢. **کتێبی سیاسەتمەدار یان پیاوی دەوڵەت** – Statesman

٣. **کتێبی یاساکان** – Laws

لێرە بەدواوە تیشك دەخەینە سەر لایەنی سیاسی هەریەك لەم کتێبانە:

---

109– سباین سەبارەت بەم سێ کتێبە دەڵێت: ئەفلاتۆن (کۆمار)ەکەی لەگەنجیدا نوسیوە یان لەنۆبەرەی پیاوەتیدا یان لەوانەیە لەماوەی دامەزراندنی فێرگەکەیدا بووبێت، لەگەڵ ئەم هەوڵەدا ویستویەتی کارێکی سەربەخۆ بێت، بەڵام وادەردەکەوێت دانانی کتێبەکە چەندین ساڵی خایاندبێت و بەڵگەی شێوازیی هەیە کە دەریدەخات بەشی تایبەت بەوتوێژی دادوەریی لەناو کتێبی یەکەمدا لەمێژوییەکی زیاتردا نوسراوە بەبەراورد لەگەڵ وتوێژەکانی (یاساکان) کە بەرهەمی تافی پیرییەتی.. داشاهەڵنەگرە ئەفلاتۆن مردوەو هێشتا کاری بەردەوامی لەسەر دانانی ئەم کردوە، بۆیە دەتوانرێت بوترێت فاسیلەیەکی زەمەنی کە لەسەروی سی ساڵەوەیە کەوتوەتە نێوان دانانی هەردوو کتێبی (کۆمار) و ( یاساکان)" لەیەکەمیاندا تێبینی گەرموگوڕی گەنجانەی ئەفلاتۆن دەکرێت، کەچی لەکتێبی دووەمیاندا ئەو نائومێدییە دەگوێزێتەوە کە پاش بەساڵاچون هەستی پێکردوە، پێدەچێت ئەم نوشوستییە ڕۆڵی هەبووبێت لەشکستی سەرکەشییە بەناوبانگەکەی (سراکیۆز)دا، بەڵام کتێبی (سیاسەتمەدار) لەماوەیەکی نێوان هەردوو ماوەی دانانی ئەو دوو وتوێژەکەی تر نوسیوەو لەوانەیە لەڕوی مێژوییەوە زیاتر لە(یاساکان)ەوە نزیک بێت وەک لە(کۆمار).. بڕوانە سباین: سەرچاوەی پێشوو.. لا ٥٠ .

# ئەفلاتۆن _ کۆمار

"کۆمار" یەکێکە لەو کتێبانەی پۆلێن ناکرێت، کتێبێکە هەموو لایەنەکانی فەلسەفەی ئەفلاتۆنی لەخۆگرتوەو ناوەڕۆکەکەی لەژیانی مرۆڤایەتیدا شتێکی نەهێشتوەتەوە چارەسەری نەکردبێت،ئەم کتێبە تایبەت نییە بەلێکۆڵینەوە لەبوارێکی تایبەت (وەك سیاسەت، ئابوریی، سایکۆلۆژیاو یان لایەنی کۆمەڵایەتی) دیراسەی گشت بابەتەکان دەکات، سەرباری ئەمانە بابەتەکانی فێرکاریی‌و هونەرو فەلسەفەو میتافیزیکی‌تێدایەو، ئەمەش لەباوەڕبونی ئەفلاتۆنەوە دێت کە ژیانی چاك لەدەوڵەتی فازیلەدا پێویستە گشت لایەنەکانی ژیان بگرێتەوە.[110]

---

110- کتێبی (کۆمار) بریتییە لەکتێبێکی تەواوە کە تێیدا میتافۆری ئەفلاتۆنی‌ز زانستە لاهۆتییەکەی‌و فەلسەفە ئەخلاقی‌و هونەرە فێرکاریی‌و سیاسەتەکانی و تیۆرەکانی دەربارەی هونەر کۆکراوەتەوە، لەم کتێبەدا سەرجەم ئەو کێشانە تێبینی دەکەین کە ئەمڕۆ هەر لەهاوبەشییەوە تاکو سۆسیالزمی روبەڕوی جیهان دەبنەوە، لەگەڵ پرەنسیپی یەکسانی پیاو و ژن لەمافداو سنورداکردنی منداڵ خستنەوە و زانستی چاککردنی رەگەز و ئەو قەیرانانەی نیچە دەربارەی زانستی ئەخلاق و حکومەتی ئەریستۆکراتی وروژاندونی‌و هەروەها ئەو کێشانەی رۆسۆ دەربارەی گەڕانەوەی ژیانمان بۆ سروشت و ئازادیی فێربون قسەی لەسەر کردون، لێرەدا فەلسەفەی برجسۆن و فرۆید دەبینی، گشت شتێك لەم کتێبەدا هەیە، خوانی هەڵبژاردەیەکە کە میوانخوانێکی بەخشندە ئامادەی کردبێت.. بڕوانە: دیورانت: سەرچاوەی پێشوو.. ل ٢٢ . هەروەها:
- Wolin, Sheldons, plato: Political Philosophy ersus Politics, in Kramanick, op., cit, p 29.

لەگەڵ ئەوانەشدا هەمەڕەنگیو جیاوازیی لایەنە زانستییەکانی ناواخنی کتێبی"کۆمار" پەردەپۆشی بەها بەنرخەکانی بیری سیاسی ئەفلاتۆن ناکات، ئەو بیرەی مۆرکی سادەییو لۆژیکی بەسەردا زاڵەو هەموو بیروڕاکانی لەمیانەی ئەم بیرۆکەوە بەڕیوەدەچێت: چاکە مەعریفەیە irtue is Knowledge ئەم دروشمە لەناخیدا دوای ئەزمونێکی شکستخواردوی سیاسی تاکەکەسی جێگەی خۆی کردوەو دواتر لەدامەزراندنی ئەکادیمیادا دەرکەوت کە ئامانج لێی چاندنی رۆحی راستەقینەی مەعریفەیە بەپێودانگی ئەوەی بنچینەی فەلسەفیانەی هونەری فەرمانڕەواییە.

ئەو گریمانەیەی دەڵێت" فەزیلە مەعریفەیە، بەشێوەیەکی ناوەکی بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە سودێکی بابەتی لەئارادایەو پێویستە ئاشکرا بکرێت، بەئەنجامگیریی لۆژیکیانە نەك بەخت و پێشبینیو هەستکردن رێگەی گەشتن بەزانینی ئەو بەرژەوەندییە زۆر ئاسان دەبێت، چاکە هەقیقەتەو هەقیقەت بونەکەشی بابەتیانەیە، ئیتر بیربۆچونی خەڵکی لەبارەیەوە هەرچییەك بێت و مایەی بەدیهاتنە نەك لەبەرئەوەی کە خەڵکی دەیەوێت، بەڵکو لەبەرئەوەی چاکەیە.

بەواتایەکیتر، ئیرادەی تاکە کەس لەمەسەلەی بەدیهاتنی چاکەدا بێجگە کارەکتەرێکی لاوەکی هیچیتر نییەو ئەوەی خەڵکی دەیەوێت لەسەر ئەو برە چاکە بەندە کە تیایدا دەیبینن، بەڵام (چاکە) چاکە نییە تەنیا لەبەرئەوەی خەڵکی بەچاکەیان داناوە، هەر بەم رێتمە پیاوی خاوەن مەعریفە (فەیلەسوف یان مامۆستا یان زانا) پێویستە

لەدەروازەیەکی حکومەتەوە دەسەڵات بەدەست بهێنێت، تەنیا ئەهلیەتی ئەو بۆ ئەو دەسڵاتە ئەو مەعریفە بێت.[111]

ئەم بیروباوەڕە گشت شتێکی تری کتێبی "کۆمار" لەخۆدەگرێت، هەر ئەمەش ئەفلاتۆنی گەیاندوە ئەو باوەڕەی" قوربانی بدات بەگشت ئەو لایەن و دیاردانەی تری دەوڵەت کە ملکەچی ویستەکانی حوکمی رۆشنگەری رەها نابن.

جێبەجێکردنی ئەم پرەنسیپە واتە چڕبونەوەی دەسەڵاتی لەدەوڵەتی پێشنیازکراوی ئەفلاتۆن لەدەست فەیلەسوفە خاوەن مەعریفەکاندا ئەوانەی دەرك بەبنەماکانی کۆمەڵگای سیاسی دەکەن، بنەماکان بریتین لە:

١. زانینی ئەو ئیشوکارانەی کە دەوڵەتی نمونەیی دەیەوێت.

٢. زانینی ئەو شوێنەوارانەی کە لەرێگەی بۆماوەیی یان مەشقی پیشەیی بەرهەم دێن وهاوڵاتیان دەگەیەنێتە ئاستێك بتوانن ئەرکەکانی دەوڵەت لەئەستۆ بگرن.[112]

کەواتە ئەفلاتۆن لەو بڕوادایە زۆربەی خەڵکی نەزانن و ئەو کۆمەڵە خەڵکەی خاوەنی مەعریفەن کە ئەهلیەتی لەئەستۆگرتنی ئەرکەکانی دەوڵەتیان پێدەبەخشێت کەمینەن. سێستمی سەرکەوتوو ئەوەیە گشت دەسەڵاتەکان دەخاتە ژێر رکێفی ئەو کەمینەی هاوڵاتیانەوە مادامێکی خاوەن دانایی‌و مەعریفەیەکی ئەوتۆیە

---

111– فؤاد محمد شبل: سەرچاوەی پێشوو.. ل ٦٥.. و بەراوردی بکە لەگەڵ: سباین: سەرچاوەی پێشوو.. ل ٥٠.

112– الدکتور بطرس غالی و الدکتور محمود خیری عیسی: المدخل فی علم السیاسة، المطبعة الفنیة الحدیثة، القاهرة–١٩٦٦.. ل ٤٢.

دەیگەیەنێتە ئەو ئاستەی دەوڵەت و بەرزکردنەوەی ئاستەکەی لەئەستۆ بگرێت.

کتێبی"کۆمار" بەم تێزە فیکرییە دەبێتە لێکۆڵینەوەیەکی رەخنەیی دەوڵەتی شار وەك ئەوەی هەبووە، بەگشت ئەو کەموکورتییە کۆنکریتیانەوە کە ئەفلاتۆن لەو دەوڵەتانەدا بینیونی، بۆیە هێرش دەکاتە سەر سیستمی فەرمانڕەوایی دیموکراسی " لەبەرئەوەی گەل ناتوانێت فەرمانڕەوایی خۆی بکات" و بەهۆی نەزانیو کەمیانەوە هێرشی کردوەتە سەر سیاسەتمەدارانی ئەتیناو سیستمی دیموکراسی بە بەرپرسیاری ئەم لایەنە نەگەتیفانەی فەرمانڕەوایی دەزانێت لەبەرئەو فرەحزبییەی خاوەن بەرژەوەندی جیاواز دەیخوازێت.

پێکدانی بەرژەوەندی پارتە ئەرستۆکراتیو پارتە دیموکراتەکان راستییەکی واقعێکی بووەو ئەرستۆکراتەکان بەهەموو شێوەك هەوڵی پاراستنی بەرژەوەندییەکانیان دەداو تەنانەت ئەگەر بەزیانی چین و توێژەکانی تریش بکەوتایەتەوە، خەڵکی رەشۆك (هەژارەکان) یش دەیانویست لەرێگەی دانانی باج و سەرانە لەسەر دەوڵەمەندو خاوەن موڵکەکان، ئاستی گوزەران و بژێوی خۆیان بەرزبکەنەوە.[113]

ئەوەی جێگەی گومان نییە، سیستمی دیموکراسی بەتەواوی دەستەوەستانە لەئاست گونجاندنی ئەم خواستە دژیەکانەو ئنجا ناکۆکیو پەرتەوازەبونی کۆمەڵایەتی دەبێتە دیاردەی هەمیشەیی کە لاوازبونی کۆمەڵگاو لەئاکامدا هەڕەشەی لەناوچونی لێدەکەوێتەوە.

---

113 – سەبارەت بەم رووداوە بڕوانە: سباین: سەرچاوەی پێشوو.. ل ٥٥.

ئـــەفلاتۆن چارەســـەرمان نیشـــان دەداو خاوەنـــداریتی فـــەرمانڕەواکان رەتدەکاتـــەوەو داوادەکـــات دەوڵـــەت بـــەمیتۆدیکی سیاسـی دور لـەئیغراکردنی پارەو خاوەنداریتیو منداڵ پـەروەردەیان بکات.

**وەك چۆن لەمەودوا بۆمان روندەبیتەوە.**

ئـەم دەروازەیـە، وامـان لیـدەکات پرسـیار لـەبارەی ئـەو چـۆنیتییە بکـەین کـە ئـەفلاتۆن دامەزرانـدنی دەوڵەتـە نمونەییەکـەیو چـەمکی دادوەریـــیو کایـــەی خاوەنـــداریتیو پرۆســـەی فیرکـــاریی لەســـەر پیشـکەش کـردوە، سـەرباری ویناکردنەکانی تایبـەت بەسیستمەکانی فەرمانڕەوایییو سروشتی هەریەکەیان" بەجیا سەبارەت بەهەریەك لـەم بوارانە دەدویین:

## یەکەم: تیۆری دروستبونی دەوڵەت لای ئەفلاتۆن

ئامـانجی شـکڵی لـەکتیبی "کۆمـار" دیـاریکردنی مانـای چـەمکی دادوەرییـیـە، بـەڵام وتویژەکـە هـەر لـەقۆناغی یەکەمەکانییـەوە بـەم ئەنجامـــە کۆتـــایی هـــات: وەك چـــۆن تەماشـــاکردنی هـــەر شـــتیك بەگـەورەکراوی ئاسـانترە لەتەماشـاکردنی ئـەو شـتە بەبچـوکراوەیی، گـەڕان بـەدوای شـتیکدا کـە دەوڵـەتی دادوەر دادوەربکـات بەکـەڵکترە لەگـــەڕان بـــەدوای شـــتیکدا کـــە تاکەکەســـی دادوەر دادوەربکـــات، لەبەرئـــەوەی دادوەریـــی یەکیکـــە لەوخەســـڵەتانەی کـــە لەباشـــترین دەوڵەتـــدا کـــە دەشـــیت خـــەیاڵ ویـنـــای بکـــات، دەبیـــنین ئـــەفلاتۆن بـەویناکردنی ئـەو دەوڵەتـە ئیدیاڵـە دەسـت پیـدەکات و دواتـر لیـی

دەکۆڵێتەوە بۆ ئەوەی بزانێت کام لەلایەنەکانی دەشێت بەدادوەریی ناوببرێت.[114]

بابەتی سەرەکی کە لێرەدا ئەفلاتۆن چارەسەری دەکات" بریتییە لەسروشتی گشتی دەوڵەت وەك نمونەیەکی دیاریکراو لەفەرمانڕەوایی، نەك ئەوەی کە ئایا دەوڵەتی ئیدیاڵ ئەگەری دامەزراندنی لەئارادایە یان نە، ئەو هەوڵدەدا، باس لەو بنەمایانە بکات کەوا پێویستە وەك پرەنسیپ دەوڵەتی لەسەر دابمەزرێت و ئەگەر واقیع پێچەوانەی ئەم پرەنسیپانە بوو، پێویستی بەلێکۆڵینەوە نییە.

ئەو تیۆرەی ئەفلاتۆن کە دەڵێت پێویستە سیاسەتمەداری زانا پەندەکانی چاکە بزانێت، بواری لەبەردەمدا دەڕەخسێنێت تاکو رەخنە لەدەوڵەتە شاری سیاسی بگرێت و ئەو میتۆدەی پێبەخشی کە لەسەری رۆشتوەو گەیاندویەتە بیرۆکەی دەوڵەتی ئیدیاڵ، لەم دەروازەوە راستەوخۆ گۆاستییەوە بۆ لێکۆڵینەوەی دەوڵەتی نمونەیی.

دەوڵەت" لەمیانەی توێژینەوە بەراوردکارییەکانی لەنێوان سیاسەتمەدارو پیشەسازو کارێکاردا، لەئەنجامی پێداویستی مرۆڤایەتییەوە دێتەئاراوە کە تەنیا ئەو کاتانە پڕدەبێتەوە کە خەڵکی یەکتری تەواو دەکەن، خەڵکی پێداویستی زۆرو فرەجۆریان هەیەو کەس نییە لەسەر بنەمای خۆبژێوی بژیو ئنجا پێویستە هەر کەسێك هانا بۆ هاوکاریو ئاڵوگۆڕ لەگەڵ ئەوانیتر بەرێت، ئاسانترین نمونە لەمبارەوە: بەرهەمهێنانی خواردن و ئاڵوگۆڕ پێکردنیو

---

114- برتراند راسل: سەرچاوەی پێشوو.. ل ١٨١.

بەرهەمهێنانی هۆیە ماددییەکانی تری ژیان و گوزەران، لەهەر جێگەیەك کۆمەڵێك هەبێت جۆرێك لەتێرکردنی پێداویستییەکان و ئاڵوگۆڕی خزمەتەکانی بەمەبەستی بەدیهاتنی ئەم ئامانجە دێتەئاراوە.[115]

ئەم بنەمای ئاڵوگۆڕکردنی خزمەتگوزاریانە پرەنسیپێکی‌تر لەخۆدەگرێت کە بریتییە لە پرەنسیپی دابەشکردنی کارو پسپۆڕی‌و ئەنجامدانی ئیشوکارەکان، ئەمەش لەبەرئەوەی ئەگەر پێداویستییەکان بەرێگەکانی ئاڵوگۆڕکردن تێرکران ئەوا هەر تاکێك پێویستە زیادەیەکی لەو شتانەی دەیبەخشێت و کەمییەك لەو شتانەی کە وەریدەگرێت لەلا هەبێت و لێرەوە زەرورەتی پەیدابونی جۆرێك لەپسپۆڕی دێتەکایەوە: جوتیار زیاتر لەپێداویستی خۆی دەغلودان بەرهەم دەهێنی‌و کەوش دروستکەر زیاد لەوەی لەپێی دەکات پێڵاو دروستدەکات، بەرژەوەندی هەردوولا وادەخوازێت هەریەکەیان کار بۆ ئەویتر بکات تاکو هەردوولا پێڵاو لەپێبکەن و نانی باش بخۆن، ئەمەش ئەنجامی لەکاری هاوبەش لەبری ئەوەی هەریەکەیان تەنیا بەشی خۆی لەپێداویستی بەرهەم بهێنێت .[116]

بەمجۆرە دەکرێت بوترێت" ئەو بیرانەی ئەفلاتۆن خستونیەتەڕو لەسەر دوو بنەمای سەرەکی بەندن:

یەکەم: خەڵکی لەبەهرەمەندیاندا جیاوازن و دواجار هەندێك کار لەوانیتر باشتر بەجێدەهێنن.

---

115- سباین: سەرچاوەی پێشوو.. ل ٦٠.

116- بڕوانە: جمهوریة افلاطون: سەرچاوەی پێشوو.. ل ٥٥.

دووەم: کارامەیی تەنیا لەو ڕێگەیەوە بەدەست دێت کە خەڵکی خۆیان لەسەر بەئەنجامگەیاندنی ئەو ئیشوکارانە ڕابهێنن کە لەگەڵ ئامادەگی سروشتیاندا دەگونجێت.[117]

لێرەدا دەردەکەوێت بیرۆکەی فەیەلەسوفی فەرمانڕەوا، داهێنراو نییەو داواکردنی فەرمانڕەوایی هەمان پرەنسیپی باوی ناو گشت کۆمەڵەکان دایدەڕێژێت، ڕیشەکێشکردنی پسپۆڕی کۆتایی بەگشت ئاڵوگۆڕێکی کۆمەڵایەتی دەهێنێت و ئەگەر بەهرە سروشتییەکان جیاوازییان نەبوایە هەر لەبنەڕەتەوە بنەمای پسپۆڕی وەرگرتن نەدەبوو، ئەگەر شارەزایی تەواوکەری بەهرەی سروشتیو پاڵنەری بەرەو کارامەیی لەناوچێت هیچ مانایەك بۆ پسپۆڕی نامێنێت.

ئەفلاتۆن دەوڵەت بەکەسێك یان یەکەیەکی زیندو (وەك تاك) دادەنێت کە لەکۆمەڵە بەشێکی لەگەڵ یەکتر گونجاوو پەیوەست بەیەکەوە پێکهاتوەو یەك ئامانجی هەیە ئەویش ئامانجی بەدیهاتنی چاکەیە.

توێژینەوەی دەوڵەت لەم ڕوانگەوە دەبێتە هۆی ئەوەی کە بڵێین سێ ئەرکی پێویست دەبێت ئەنجامبدرێت، ئەوانیش:

١. تێرکردنی پێداویستییە سروشتییەکان.

٢. پاراستنی دەوڵەت لەمەترسی دەرەکی.

٣. فەرمانڕەوایی دەوڵەت.[118]

---

117– سباین: سەرچاوەی پێشوو.. ل ٦٢.

118– الدکتور. بطرس غالي و الدکتور محمود خیري عیسی: سەرچاوەی پێشوو.. ل ٤٧.

ئەم پۆلێنکردنە سیانییە پەیوەندی بەپۆلێنکردنێکی دیکەی لەپۆلێنکردنی چینایەتی‌یەوە هەیە کە بۆ کۆمەڵگای دەوڵەتە نمونەیەکەی پێشنیازیکردوە کە ئەویش دابەشکردنێکی سیانییەو پێکهاتوە لە:

١. **چینی کرێکارە بەرهەمهێنەکان** – Producing Class

ئەم کۆمەڵە هەڵدەستن بەپڕکردنەوەی پێداویستی گشت ئەندامەکانی کۆمەڵگاو سەرجەم ئەوانە لەخۆدەگرێت کە بەپرۆسەی ئابوورییەوە سەرقاڵن لەجوتیارو کرێکارو پیشەوەران.

٢. **چینی سەربازو جەنگاوەران** _ Military Class

ئەم چینە لەدەوڵەتی ئەفلاتۆنیدا ئەرکی بەرگریکردن و پاراستنی دەوڵەتی لەئەستۆدایە لەبەرامبەر هەر مەترسی‌و هەڕەشەیەکی دەرەکیدا.

٣. **چینی فەرمانڕەوا** – Govermental Class

ئەرکی ئەم چینە بریتییە لەداڕشتن و دانانی ئەو یاساو ڕێسایانەی کە دەبنە مایەی ڕێکخستنی کۆمەڵ و ئیدارەکردنی کاروبارەکانی‌و سەرکردایەتی کردنی هەنگاوەکانی.[١١٩]

ئەفلاتۆن بەم پۆلێنکردنە چینایەتییە کە باسکرا، ئەو گریمانەیە دەست دەخات کە کۆمەڵگا لەسێ چینی سەرەکی پێکهاتوە:

١. ئەوانەی سروشت بەشێوەیەك خولقاندونی کە بۆ کارکردن دەستبدەن، نەك بۆ فەرمانڕەوایی.

---

119- Barker, Ernest, Greek political theory., op. cit.. p 198.

٢. ئەوانەی بۆ فەرمانڕەوایی دەست دەدەن، بەمەرجێك لەژێر چاودێریی‌و ئاراستەکردنی کەسانی تردا بن.

٣. ئەوانەی شیاون بۆ لەئەستۆگرتنی گەورەترین ئەرکەکانی فەرمانڕەوایی وەك دەرکردنی بڕیای کۆتایی لەسەر رەنگرێژکردنی هۆیەکان و دیاریکردنی ئامانجەکان.[١٢٠]

ئەفلاتۆن نازناوی (پاسەوانی دەوڵەتی شار) لەهەردوو چینی فەرمانڕەواو سەربازەکان پێبەخشیون، ئەم پاسەوانانە Guardians فەرمانڕەوایی دەوڵەت و راییکردنی ئیشوکارەکانی‌و پاراستنی سەلامەتی نیشتمانی دەوڵ'تی شار لەئەستۆ دەگرن" واتە زاراوەی پاسەوان لەئێستادا واتای وەزیرو سەرەك وەزیرو دەستەودارەیەکەیان لەکارمەندانی دەوڵەت و پیاوانی سوپاو پیاوانی دادگا دەبەخشێت.[١٢١]

تێبینی ئەوە دەکەین ئەفلاتۆن وەك پاساوێك بۆ قبوڵکردنی ئەم پۆلێنکردنە دێت بانگەشەی ئەوە دەکات کەوا پۆلێنکردنەکەی رەگوریشەیەکی ئایینی هەیە، ئەمەش بەوەی بەتاکەکەسەکان بوترێت: رەچەڵەکی رەگەزی مرۆیی لەناخی زەویی کە وەك دایکێکی گەورەیە سەرچاوەی گرتوە، لەو دەمەدا خواوەند پێی خۆشبووە هەندێك لەتاکەکان تێکەڵ بەئاڵتون و هەندێکی تر بەزیو و هەندەکەی تریش تێکەڵ بەمس و ئاسن بکات.. چینی فەرمانڕەوا لەئاڵتون و

---

120- سباین: سەرچاوەی پێشوو.. لا ٦٥.

121- الدکتور عبدالحمید متولی: سەرچاوەی پێشوو.. لا ٤٦.

چینی جەنگاوەران لەزیو و چینی سێیەم (بەرهەمهێن) لەمس و ئاسن.[122]

لەبەرئەوەی فەزیلەت بەلای ئەفلاتۆنەوە مەعریفەیەو لەبەرئەوەی هەندێك هەقیقەتی رەها هەیە هەندێك جیا لەوانیتر لەرێگەی بەهرەو بەرەچاو رۆشنییە ئەکتیفەکانیانەوە دەرکی پێدەکەن ئاساییە تاکەکان یەکسان نەبن: تاکەکانی کۆمەڵگا لەروی بەهرەو تواناو ژیریو هەستەوە جیاوازن، بۆیە دیموکراسیەت لەبەرئەوەی لەسەر بنەمای یەکسانی تاکەکەسەکان بەندە ئەوا وەهم و فرتوفێڵ وساختەیەو ئەم یەکسانییە شتێك نییە لەواقیعدا بونی هەبێت.

جێبەجێکردنی دیموکراسی کە بنەڕەتەکەی یەکسانییەو وادادەنێت گشت هاوڵاتیان لەئیدارەکردنی کاروبارەکانی دەوڵەت بەشداربن کارێکی مەحاڵە، چونکە ئەوەی بەم ئەرکە هەڵدەستێت دەبێت کەسێکی خاوەن مەعریفەو زانست بێت تاکو بتوانێت فرمانڕەوایی ئەوانیتر بکات و لەبەرئەوەی فەزیلە مەعریفەیە بەئیعتباری ئەوەی راستی رەهایە بواری پێگەیشتنی هەیە، بەڵام کەمێکی دیاریکراو لەخەڵکی دەتوانن ببنە خاوەن مەعریفەو زانست و هەر ئەم کەمە خەڵکە ئەهلیەتی فەرمانڕەوایی کۆمەڵیان هەیە، واتە دەسڵات دەبێت لەدەست کۆمەڵێك کەسی ژیر یان فەیلەسوفاندا بێت، ئەوانەی هەموو زیرەکی دەوڵەت لەواندا کۆبوەتەوە.

---

122- جمهورية افلاطون: سەرچاوەی پێشوو.. ل ١١٥.

دووەم: **دادوەریی**

ئەفلاتۆن یەکەمین کەسە رونیکردبێتەوە کە دادوەریی تەنیا بنەمایە بۆ کۆبونەوەی مەدەنیو ئەو دەوڵەتەی لەسەر ئەم بنەمایە دانامەزرێت گەندەڵەو روبەڕوی مەترسی ڕوخان دەبێتەوە، ئەفلاتۆن لەکتێبی چوارەم لە"کۆمار"دا چەمکی دادوەریی دیاریکردوە کاتێك دەڵێت: دادوەریی بریتییە لەئەوەی هەموو مرۆڤێك ئەرکی سەرشانی خۆی بەئەنجام بگەیەنێت و دەست لەکاروبارەکانی ئەوانیتر وەرنەدات، شاری دادوەر ئەو شارەیە کە هەریەك لەسەربازو پیشەسازو فەرمانڕەوا بەبێ دەستێوەردان لەکاروبارەکانی ئەوانیتر ئەرکی سەرشانیان بەئەنجام بگەیەنن.[١٢٣]

بەواتایەکیتر ئەو مەکۆیە ریشاڵەکانی پەیوەندی ناو کۆمەڵگەی توندوتۆڵکردوەو ئەو یەکێتییەیە کە تاکەکانی کۆمەڵ پێکەوە دەبەستێتەوە، بەجۆرێك هەر یەکەیان بەگوێرەی ئامادەیی سروشتیو مەشق و پسپۆڕیی خۆی رۆڵی لەژیانیدا ببینێت. دادوەریی

---

123- هەمان سەرچاوەی پێشوو.. لا ٥٦ و ١٤٠ .. هەروەها بڕوانە: برتراند راسل: سەرچاوەی پێشوو.ز لا ١٨٩.

بارکر لەبارەی ئەم دیاریکردنە دەڵێت: بیرۆکەی ئەفلاتۆنی دەربارەی دادوەریی وەک چۆن لەدەوڵەتدا خۆی دەبینییەوە روبەڕوی رەخنە دەبێتەوە، یاسای بەجێگەیاندنی ئەرک پەیوەندی بەو شتانەوە نییە کە خەڵکی بەشێوەیەکی گشتی لەبارەی دادوەرییەوە لێی تێگەن،، دەکرێت بوترێت زیاد لەئەندازەی پێویست بریتییە لەبنەمای سەلبی" لەکاتێکدا بەسەر خەڵکیدا دەسەپێنێت کە رێز لەبوارەکانی خۆیان بگرن، پرەنسیپێک لەخۆناگرێت کە چارەسەری پێکدادانی نێوان خواست و ململانێکان لەنیوان بوارو بوارێکی تردا بکات، ئەمەش ئەو چەمکەیە کە ئێمە لەبیرۆکەی دادوەریدا بانگەشەی بۆ دەکەین..
بڕوانە:

-Barker, Greek political theory., op. cit..

لەیەککاتدا فەزیلەی گشتیو فەزیلەی تایبەتیشە، چونکە لایەنە باشەکانی دەوڵەت و خەسڵەتە چاکەکانی ئەندامەکانی وەکیەك دەپارێزێت، هیچ شتێك لەوە باشتر نییە پیاو کارێکی دیاریکراوی هەبێت و هاوکات (ئەو پیاوە) بۆ ئەنجامدانی ئەو کارە شیاوبێت، وەك چۆن لەوەباشتریش نییە کە تاکەکان و کۆمەڵ ئەو پۆستانە لەئەستۆ بگرن کە ئەهلیەتی لەئەستۆگرتنیان تێدایە.

بەمشێوە واتای دادوەریی دەبێتە هۆیەك بۆ بەدیهێنانی حاڵەتێکی دیاریکراو کە ئەویش بەخشینی هەموو ئەو شتانەیە کە هەر تاکێك خاوەنیەتی (کارکردن لەسەر ئەو حاڵەتەی تێیدایەو بەگوێرەی ئامادەسازییو کارامەییەکەی)و ئەوەشی کە لەئەستۆیدایەو پۆستەکەی لێی دەخوازێت.[١٢٤]

چەمکی دادوەریی بەو پێیەی باسکرا" زیاتر لەنمونەی ئەخلاقیەوە نزیکە تا لەنمونەی سیاسییەوە، بەواتای ئەو هەڵسوکەوتەی مرۆڤە کە لەئەنجامدانی هەموو ئەو شتانەی ئارەزویی دەکات یان بەرژەوەندییە تایبەتییەکانی لێی دەخوازێت ڕێگریدەکات و بەرەتی ئەم هەڵسوکەوتە پابەندبونە بەو باوەڕەی کە ناهێڵێت کارێك ئەنجام بدەین.[١٢٥]

---

124- سباین: سەرچاوەی پێشوو.. ل ٦٧-٦٨.. دەتوانی بەراوردی بکەیت لەگەڵ: دیور نت: سەرچاوەی پێشوو.. ل ٥٣.

125- فؤاد محمد شبل: سەرچاوەی پێشوو.. ل ١٠١.

ئەم پێناسەیەی ئەفلاتۆن کۆمەڵێك تێبینی لێدەکەوێتەوە، کە ئەمانەن:

١. ئەفلاتۆن لەتوێژینەوەی پرەنسیپی دادوەریدا مەسەلەی توێژینەوەکەی کردوەتە دوو لایەنە" دادوەریی یەکەمجار بەخەسڵەتێکی تاکەکەس داناوەو ئەمەش بەم مانایە راستەقینەی سەربەخۆیەو دووەمجار بەیەکێك لەکۆڵەکەکانی دەوڵەت گوزارشتی لێکردوەو ئەمەش بەم مانایە گوزارشتی لە خەسڵەتگەلێکی تری جیاواز کردوە، بەواتایەکیتر دادوەریی لەسەر ئاستی مایکرۆ Micro هاوشانی تاکەکەسەو، بەڵام لەسەر ئاستی ماکرۆ Macro ماناکەی بەرزدەبێتەوە تا دەگاتە ئاستێکی پەیوەست یەکەیەکی گشتیی سیاسی کە سەبارەت بەهاوڵاتی بریتییە لەوەی هەر کەسێك مافی خۆی وەرگرێت، بەڵام سەبارەت بەدەوڵەت بریتییە لەوەی هەموو هاوڵاتییەك بۆی بلوێت گەشە بەبەهرە خۆییەکانی خۆی بدات.[١٢٦]

٢. پیناسەکەی ئەفلاتۆن بۆ دادوەریی هیچ بنەمایەکی یاسایی لەخۆنەگرتوە، لەبەرئەوەی هیچ دەلالەتێکی ئەم بێژە لاتینیە Jus و هەروەها بێژەی Right ئینگلیزی کە مانای توانای دەستپێکردنی هەڵسوکەوتی ئیرادییانەیە لەسایەی پارێزگاریی یاساو پشتگیری دەسڵاتی دەوڵەت، تێدانییە، بەتێپەڕاندنی ئەم بیرۆکەیە دادوەریی بەلای ئەفلاتۆنەوە بریتییە لە بەپاراستنی ئاشتی گشتیو نیزام، نەك نیزامی گشتی دەرەکی. لانیکەم تەنیا پشکێکی کەمی ئەو پێکەوە

---

126- الدكتور. حامد ربيع: نظرية التحليل السياسي، مكتبة القاهرة الحديثة، القاهرة- ١٩٧٠-١٩٧١.. ل ١١٤-١١٥.

گونجانەی هەیە کە دەوڵەت پێکدەهێنێ، ئەوەی دەوڵەت بۆ ئەندامەکانی کۆمەڵگە دابینی دەکات ئازادیی‌و پاراستن نییە وەك دوو پایەی گرنگی ژیان، بەڵکو هەلڕەخساندنە بۆ ئاڵوگۆڕە کۆمەڵایەتیەکان کە پێداویستی‌و داواکارییەکانی ژیانێکی هاوچەرخ دەیخوازێت، راستە لەم ژیانە کۆمەڵایەتیەدا وەك چۆن ماف هەیە، ئەرکیش هەیە، بەڵام ناکرێت بوترێت" ئەم ماف و ئەرکانە تایبەتن بەناکەسەوە لەبەرئەوەی ئەوان پەیوەندیان بەو خزمەتانەوە هەیە کە پێشکەشی دەکەن، بەڵکو توێژینەوەکە لەسەر Services ئەو بنەمایە کە دەوڵەت بەرئەنجامی کۆمەڵە پێداویستییەکی ئاڵوگۆڕکراوەو دواجار زاراوەی خزمەتگوزارییەکان بەکاردەهێنرێت نەك زاراوەی دەسەڵاتەکان، تەنانەت خودی فەرمانڕەوا لەم یاسا جیاناکرێتەوە، چونکە لەپۆستێکدایە کە داناییەکەی ئەهلییەتی داوەتێ. بیرۆکەی دەسەڵاتی خاوەن سەروەریی لەتیۆرە سیاسییەکەی ئەفلاتۆن و تەنانەت لەبیری هیچکام لەفەیلەسوفانی تری گریکدا هیچ بونێکی نەبووە.[127]

بۆیە دەوترێت دادوەریی ئەفلاتۆنی دادوەرییەکی یاسایی نییەو هیچ پلانێکی دەرەکی ماف و ئەرکە یاساییەکان لەخۆناگرێت. بەواتای ئەوەی ناچێتە چوارچێوە یاساییەکەیەوە، بەڵکو دەچێتە بواری ئەخلاقی کۆمەڵایەتییەوە" کە بریتیی نییە لەو ئەخلاقە کەسیانەی کەوا لەناخی ویژدانی هەریەکەماندا هەیەو ئەو بنەما

---

127- سباین: سەرچاوەی پێشوو.. ل ٦٧-٦٨.

یاسایانەش کە یاسا بەسەر شتەکاندا دەیسەپێنێت، بەڵکو شتێکی تێکەڵە لەهەردوو لایەنەکە پێکهاتووەو لێیانەوە باڵا دەکات.[١٢٨]

٤. بەلای ئەفلاتۆنەوە دادوەریی کاری لەسەر یەکسانی نەکردوە، بەبڕوای ئەو دەشێت لەنێوان دەسڵات و مافەکانداجیاوازیی هەبێت بەبێ ئەوەی کارێکی پێچەوانەی یاساش بێت، گشت دەسڵاتەکان مافی فەرمانڕەواکانە، چونکە ئەوان داناترین ئەندامەکانی کۆمەڵن و لەم روانگەوە هیچ ستەمێك نایەتە ئاراوە، تەنیا لەحاڵەتێکدا نەبێت کە تیایدا جیاوازیی نێوان ماف و ئەرکەکان لەنێوان دوو توێژی کۆمەڵایەتیدا بێت کە لەهەندێك لەفەرمانڕەواکانیش داناتر بن.

بۆیە دەبینین ئەفلاتۆن ئەمەی بەلاوەناوەو بەرزو نزمکردنەوە ئاستی هاوڵاتیانی بەڕەوا زانیوە، لەگەڵ باوەڕبونی بەوەی کە منداڵی چاك و فێربونی چاك لەزۆربەی بارەکاندا ئەنجامیان دەبێت، ئەمەش وایکردوە نەوەی فەرمانڕەواکان لەنەوەی توێژەکانی تر چاکتربن.[١٢٩]

---

128 -Ibid.,

129– برتراند راسل: سەرچاوەی پێشوو.. ل ١٩٠-١٩١.. هەروەها بڕوانە: جمهوریة افلاطون: سەرچاوەی پێشوو.. ل ١١٦.

## سێیەم: هاوبەشی موڵکداریی و خێزان لەکۆماردا

لەڕوی ئابورییەوە ئەفلاتۆن لە"کۆمار"کەیدا پێشنیاری هاوبەشییەك دەکات کە گشت شتەکانی هەردوو چینی فەرمانڕەواو سەربازەکان (پاسەوان)ەکان بگرێتەوە..[١٣٠]

وەك چۆن سێستمی خێزان دەکەوێتە هەمان چوارچێوەوە، بەواتای ئەوەی هاوبەشییەکە پشت بەدوو بنەمای سەرەکیی دەبەستێت، کە بریتین لە: هەڵوەشاندنەوەی خاوەنداریێتی پاسەوان (سەربازو فەرمانڕەوا)و لەناوبردنی سێستمی خێزان.

خاوەنداریێتی تایبەت جیاوازی داهاتەکانی لێدەکەوێتەوەو دواجار دروستبونی دوو چینی دژبەیەك (چینی دەوڵەمەندو چینی هەژار) کە هەریەکەیان رکەبەرایەتیو دژایەتی ئەویتریان دەکات و رقوکینە دەکەوێتە نێوانیانەوە، ئەمەش هەڕەشە لەیەکێتی دەوڵەت و هەڵوەشاندنەوەی لایەنەکانی دەکات، بۆیە بەپێویستی دەزانێت ریشاڵی ئەم خراپە لەناوببرێت، بەتایبەت ئەو لایەنانەی پەیوەندنیان بەخاوەنداریێتی پاسەوانەکانەوە هەیە، لەبەرئەوەی بێجگە لەداماڵینی گشت مافێکی خاوەنداریێتی هیچ شتێك نییە بەر لەتەماعی سەربازو فەرمانڕەواکان بگرێت. بۆیە نابێت پاسەوان زەویو خانوو یان هەر موڵکێکی تری تایبەتی هەبێت، ئەگەر زەوییو خانووی هەبوو، لەولاشەوە پارەی تایبەت بەخۆی هەبوو، ئەوادەبێتە موڵکدارو جوتیار، نەك پاسەوان. بەمجۆرە هەموو ژیانی لەوەدا بەسەر دەبات

---

130- هەندێک جار ئەم هاوبەشییە بەهاوبەشی ئەریستۆکراتی ناودەبرێت، مادام بەرهەمهێنەکان دەتوانن خێزان و سامانەکانیان لای خۆیان بهێڵنەوە.. بڕوانە: الدکتور. عبدالحمید متولی: سەرچاوەی پێشوو.. ل٤٩.

رقيی لەخەڵکی بێتەوەو خەڵکی رقی لەو بێتەوە، پلان لەدژی خەڵکی و خەڵکی پلان لەدژی ئەو بگێڕێت.[131]

لەواقیعدا ئەفلاتۆن لەم بیرۆکەیدا مەبەستی بەدیهێنانی ئامانجێکی ئابوریی دیاریکراوی نەبووە (کارکردن لەسەر بەرزکردنەوەی ئاستی گوزەرانی خەڵك یان هەندێك لەچینەکانی کۆمەڵ) بەو ئەندازەی هەوڵیداوە لەمیانەیەوە بەئەمانجێکی سیاسی بگات کە بریتییە لەدەستەبەرکردنی بەپێی توانای یەکێتی لەناوخۆی دەوڵەت و بەدەستهێنانی بەرزترین پلە لایەنگریی لەلایەن پاسەوانانەوە بۆ نیشتمان و بەدیهاتنی ئەم ئامانجانە بەندە بەهەڵوەشاندنەوەی خاوەندارێتییەوە.

ئەم ئاراستەی بیرکردنەوە لەگەڕان بەشوێن کۆمەڵی نمونەیی‌و دەوڵەتی فازیلەدا تەواو ناکۆکە لەگەڵ شێوازی رێبازە سۆسیالزمییەکانی ئەم سەردەمەدا، ئەفلاتۆن نایەوێت حکومەت بۆ بەدیهاتنی یەکسانی لەنێوان سامانەکاندا بەکاربهێنێت، بەڵکو دەیەوێت سامانەکان یەکسان بکات بەمەبەستی لادانی یەکێك لەسەرچاوەیەکی دڵەڕاوکیٚ کە حکومەت نیگەران دەکات.[132]

ئەم وتەیە لەسەر هەڵوەشاندنەوەی سیستمی خێزان و هاوسەرێتی جێبەجێدەبێت، ئەمەش لەبەرئەوەی ئەفلاتۆن لەسۆزداری خێزاندا رکابەرێکی گەورەی سۆزداری لایەنگری دەوڵەت دەبینێتەوە کە لەدڵسۆزی بۆ فەرمانڕەوایان کەمدەکاتەوە،

---

131- جمهورية افلاطون، ترجمة: الدكتور. فؤاد زكريا، المؤسسة المصرية العامة للتأليف و النشر، القاهرة-١٩٦٨.. ل ١٧٤.

132- بڕوانە سباين: سەرچاوەی پێشوو.. ل ٧٣.

سەرقاڵبونی تاك بەمنداڵەکانییەوە جۆرێکە لەچاکەدان کە مەترسییەکەی لەئارەزوکردنی خاوەنداریێتی زۆر ترسناکترە، وەك چۆن ڕاهێنانی منداڵ لەخانە تایبەتەکاندا وەك هۆیەك خراپ تەماشادەکات لەئامادەکردنی تازەپێگەیشتوان لەسەر ئەو لایەنگیرییە گیانە گشتگیرەی مافی دەوڵەتە، هەرچی بنەمای هاوسەرگیرییە لەکۆمارەکەی ئەفلاتۆندا گرێبەستێکی کاتییە لەنێوان ژن و پیاودا،[133] بەمەرجێك منداڵەکان باوك و دایکی خویان نەناسنەوە.[134]

---

133- ئەفلاتۆن لەو بڕوادا بوو مەبەستی سەرەکی لەپشت ئەم پرۆسەی هاوسەرگیرییە بریتییە لەمنداڵ خستنەوە بەئەندازەی پێویستی دەوڵەت و هەروەها چاککردنی (نەوە) بەپێی ڕێسا پیادەکراوەکان لەبواری ئاژەڵدا، ئەفلاتۆن لەو بڕوادا بووە کە دەبێت منداڵەکان لەجێگەیەکی هاوبەشدا کۆبکرێنەوەو خەڵکانی تایبەتمەند بایەخیان پێبدات و دایکانیش بەبێ ئەوەی بیانناسنەوە دێن شیریان دەدەنێ و بەمەش لەنێوان پاسەوانەکاندا پێوەندییەکی نزیکایەتی دیار نییە، بەڵام هەمویان بەئەندامی یەك خێزان دادەنرێن و بواری سۆزداریی بوون لەنێوانیاندا فراوان دەبێت، خۆ ئەگەر ئەفلاتۆن مافی دروستکردنی خێزان لەچینی بەرهەمهێن قەدەغە نەکات، ئەوا بەپێویستی دەزانێت بخرێتە ژێر چاودێرییەوە نەوەك ببێتە هۆی زیادبونی چڕی دانیشتوان بەشێوەیەك زیاد لەئەندازە، وەك چۆن پێی وابووە هەر منداڵێك بەکەمئەندامی لەدایك ببێت پێویستە بکوژرێت و ئەو منداڵانەش دەکوژرێن کە ناکارخراپن و ئومێدی چاکبوونیان لێناکرێ و ئەو نەخۆشانەی بواری چاکبونەوەیان لەبەردەمدا نەماوە.. بڕوانە: الدکتور. عبدالحمید متوای: سەرچاوەی پێشوو.. ل ٥١ . لەگەڵ: الجمهوریة افلاطون: سەرچاوەی پێشوو.. ل ١٧٢-١٧٣ .

134- ئەمەش بەوە دێتەدی گشت کۆرپەکان هەر لەساتەوەختی لەدایکبونیانەوە لەباوك و دایکیان وەربگیرێن و دور لەوان پەروەردە بکرێن، وەك چۆن دەکرێت فەرمانڕەواو سەربازەکان لەگشت مافێکی موڵکداریی داماڵرێن.. بڕوانە: جمهوریة افلاطون: سەرچاوەی پێشوو، ل ١٧٢.

نێرینەی گونجاو کە تەمەنی لەنێوان بیست وپێنج بۆ پەنجاو پێنج ساڵیدایە لەگەڵ مێینەی گونجاو کە تەمەنی لەبیست بۆ چل ساڵی تێپەڕی نەکردوەو لەکات و کەشوهەوای گونجاوداو لەئاهەنگێکی تایبەت بەو مەراسیمەدا کۆدەکرێنەوەو، لەئاهەنگەکەدا قوربانی دەکرێت و سرود دەوترێتەوە، لەم بۆنەدا بوار بەگەنجە بەهێزو کەڵەگەتەکان دەدرێت تاکو ژنی زیاتر بهێنن بۆ ئەوەی زۆرترین ژمارەی منداڵی هاوشێوەی باوکیان بخەنەوە.

پیاوی ئازا لەوانیتر زیاتر بواری هەبوونی زۆرترین پەیوەندی هاوسەرگیری دەدرێت و لەهەرکەسێك زیاتر لەم بوارەدا ئازادی بۆ فەراهەمدەکرێت هێنانی زیاتر لەپەیوەندییەکی هاوسەرێتی هەیەو لەم بوارەدا لەهەرکەسێکی دیکە ئازادی زیاتری دەدرێتیٚ، بەمەبەستی خستنەوەی زۆرترین منداڵ کە دەکرێت لەرێگەی ئەم باوکەوە بەدەست بخرێت.

ئامانج بریتییە لەبەرهەمهێنانی چاکترین نەوەی ئادەمیزاد لەسەر هەمان رێچکەی ئاژەڵەکانی وەك سەگ و ئەسپ و باڵندەکان، ئەگەر ویسترا لەباشترین جۆرەکانی ئەو ئاژەڵانە بن.

ئەفلاتۆن کاتێك باس لەمەسەلەکانی خێزان و هاوسەرگریی دەکات، بیرۆکەی یەکسانی ژن و پیاوی لەگشت کاروبارەکاندا لەیادناچێت، لەو بڕوادا بووە کە لەروی بەهرە سروشتییەوە هیچ جیاوازییەك لەنێوانیاندا نییەو ئنجا دەبێت هەردووکیان یەك جۆر لەفێرکردن وەربگرن، ژنانیش وەك پیاوان، ئەهلییەتی لەئەستۆ گرتنی پۆستەکانی هەبێت.

دەبێت کچ هاوشێوەی کوڕ هەمان بەشی لەفێربوندا هەبێت: مۆسیقاو یارییەکان و هونەرەکانی جەنگ هاوشان لەگەڵ کوڕدا فێربێت، ژن مافی ئەوەی هەیە لەگشت شتێکدا لەگەڵ پیاودا یەکسان بێت، چونکە هەر فێربونەی والە پیاوێك دەکات بەخێوکەرێکی چاك بێت لەتوانایدایە ژنێکیش بکاتە بەخێوکەرێکی چاك، لەبەرئەوەی سروشتە بنەڕەتی لەهەردووکیاندا وەکیەکە، گومانی تێدا نییە ژن و پیاو جیاوازیی لەنێوانیاندا هەیە، بەڵام ئەم جیاوازییانە هیچ پەیوەندییەکیان بەسیاسەتەوە نییەو هەندێك لەژنان خاوەن ئەنگێزەی فەلسەفیین و لەتوانایدایە کاروبارەکانی فەرمانڕەوای لەئەستۆبگرێت و، هەندێکیان خاوەن ئەنگێزەیەکی سەربازیین کە دەکرێت جەنگاوەری کارامەیان لێدەربچێت.[135]

لەراستیدا ئەفلاتۆن لەمەدا مەبەستی نییە بەرگری لەمافەکانی ژن بکات، بەڵکو لەو بڕوادا بووە کە بەرژەوەندییە باڵای دەوڵەت وادەخوازێت و بەمە گشت بەهرە سروشتییەکانی مرۆڤ لەپێناو خزمەتکردنی دەوڵەتدا هەمواردەکەین.[136]

## چوارەم: فێرکردن

فێربون لای ئەفلاتۆن سیستمێکی ئامانجدارەو تەنیا لەو پرۆسە کۆمەڵایەتییەدا کورتنابێتەوە کە بواری خۆگونجاندن بۆتاك لەناو کۆمەڵدا دەڕەخسێنێت تاکو بەرەزامەندیو بەختەوەری بژی (وەك چۆن سۆفیستەکان وای بۆدەچون) بەڵکو بەرزدەبێتەوە بۆ ئاستێکی زۆر باڵا کە تیایدا تێڕوانینی تەندروست لەگەڕان بەدوای هەقیقەتی

---

135– هەمان سەرچاوەی پێشوو.. ل ١٦٦-١٦٧ .

136– الدکتور عبدالحمید متولی: سەرچاوەی پێشوو.. ل٥٢.

بێکۆتـــای ئەبســـتراکت لـــەروی فەزیلـــەو ئنجـــا دادوەرییـــەوە ئاشکرادەبێت.[137]

ئـەفلاتۆن بەشـێکی ئێجگـار گـەورەی گرنگیـدانی بـۆ فێربـون تەرخانکردوە، بەئەندازیەك گەیشتونەتە ئەو بڕوایەی فێربون بابەتی سـەرەکی (کۆمـار)ەکـەی بێـت، لەراسـتیدا ئەمـە هـیچ کاتێـك جێگـەی سەرسوڕمان نییـە ئەگـەر بزانین ئـەفلاتۆن دەوڵـەتی بەدامەزراوەیـەکی فێرکـاری دانـاوەو ئەگـەر هاوڵاتیـانی تەندروسـت فێـر بکـرێن دەتـوانن بەئاسانی ئالۆزیی ئەو کێشانە بدۆزنەوە کە دوچاری دەبنـەوەو ئەگـەر فێرکردن پشتگوێخرا ئەوا هیچ شتێك جێگەکەی پڕناکاتەوە.

ئـەم گرنگییـەی فێربـون لەنوسـراوەکانی ئەفلاتۆنـدا هەیـەتی وایلێکـردوە فێربـون بکاتـە سێسـتمێکی تـەوزیمیو بیخاتـە ژێـر چاودێری دەوڵـەتـەوە، بـەو پێیـەی ئـەم دامـەزراوە (مەبەسـتی دەوڵـەتـە) لەبەر پێویستبونی ناکرێت دەستبەرداری فێرکردن ببێت یان بیکاتـە سەرچاوەیەکی بازرگانیکردن، بەڵکو لەسـەریەتی هۆیـە پێویستەکانی بۆ دابین بکات و دڵنیابێتەوە لـەوەی کە ئایا هاوڵاتیانی ئامادەکردنی پێویستیان بۆ فەراهەمدەکرێت و ئـەوەش جێگیر بکات کـە جۆری ئـەو فێربونـەی بەهاوڵاتیان دەدرێت بـەکردەوە لەگـەڵ رەفاهییـەتی دەوڵـەت و یەککگرتویدا دەگونجێت.[138]

فێربون دوو بـواری سـەرەکیی لـەخۆدەگرێت" مۆسیقاو یارییەکان و هەریـەك لـەم دوو وشـەیە مانایـەکی فـراوانتر لەماناکـەی ئێسـتایان دەبەخشن: مۆسیقا گشت شتەکانی جیهانی هونەر دەگرێتـەوەو زۆر

---

137- الدكتور على احمد عبدالقادر: سەرچاوەی پێشوو.. ل ٧٥-٧٦ .

138- سباین: سەرچاوەی پێشوو.. ل ٧٤-٧٥ .

نزیکە لەوەی دەلات لەو وشە بکات کە ئەمڕۆ بەرۆشنبیری ناودەبرێت و، بەڵام یارییە وەرزشییەکان مەبەست لێی هەموو ئەو شتانەیە کە پەیوەستن بەمەشقی جەستەی‌و بەکاری‌یەوەو کەمێك لەوەش زیاترە کە ئێستا بەراهێنانە جەستەییەکان ناودەبرێت.

گرنگی رۆشنبیری پێگەیاندنی پیاوە بەئەدەبەکانە کە ماناکەی لەزمانی ئینگلیزیی ئەمڕۆدا چەمکی جەنتڵمان دەگەیەنێت، ئەم مانایە بەئەندازەیەکی گەورە بۆ ئەفلاتۆن دەگەڕێتەوە" ئەتینا لەو سەردەمەدا لەرویەك لەروەکانەوە لەسەدەی نۆزدەیەمی بەریتانیا دەچوو، لەهەریەك لەئەتیناو ئینگلتەرە چینی ئەرستۆکراتی خاوەن سەرمایەو پێگەی کۆمەڵایەتی هەبون، بەڵام دەسڵاتی سیاسیان قۆرخ نەکردبوو، لەهەریەکەیاندا ئەرسۆکراتەکان هەموو هەوڵێکی لەو پێناوەدا خستبووەگەڕ تاکو لەرێگەی کاریگەریی دروستکردن لەسەر رەفتاری ئەندامەکانی زۆرترین سایەی هەبێت، بەڵام ئەرستۆکراتییەت لەشارە فازیلەکەی ئەفلاتۆندا بەبێ هیچ کۆتوبەندێك فەرمانڕەوایی رەها دەکات.[١٣٩]

دەکرێت پێداگریی ئەفلاتۆن لەسەر فێرکردنی تەوزیمی لەئەتینا (کە دەوڵەت سەرپەرشتی دەکات) وەك جۆرێك لەنوێکردنەوەی سیستمە فێرکارییەکەی تەماشابکرێت، هاوکات رەخنەگرتنە لەو نەریتە دیموکراسییە باوەی هاوڵاتیانی ئازادکردوە ئەو چەشنە فێرکردنە بۆ منداڵەکانیان بکرن کە خۆیان ئارەزوی دەکەن یان لەبازاڕدا دەستیان دەکەوێت، لەگەڵ ئەو سیستمانەی ئەتینا کە رێگری لەبەردەم فێربونی ژندا دەکەن، ئەفلاتۆن لەو بڕوادا بوو

---

139- بوتراند راسل: سەرچاوەی پێشوو.. لا ١٨٢-١٨٣.

جیاوازی جۆرایەتی نییە لەنێوان بەهرە سروشتیی کوڕان و کچانداو گەیشتوەتە ئەنجامێکی لۆژیکی" دەبێت هەردوو رەگەز لەیەکجۆر فێرکردن بەهرەمەندبن و ئافرەتانیش هەلی ئەوەیان لەبەردەمدا بڕەخسێت وەکو پیاوان لەپۆستەکاندا دابمەزرێن.[١٤٠]

ئەم بیربۆچونە بەرگری نییە لەمافەکانی ژن بەو ئەندازەی پلانێکە مەبەست لێی بەگەڕخستنی گشت بەهرە سروشتییەکانە لەخزمەتی دەوڵەتداو بێبەش نەبونی کۆمەڵ لەو ئەندازە کۆششە بەرهەمهێنەرەی کە لەهزری ژنانی خاوەن بیرو راهێنراودا هەیە.

کاتێک ئەفلاتۆن باس لەپرۆگرامەکانی پەروەردەو فێرکردن دەکات، ئەوانەی پێویستە بدرێن بەهاوڵاتیانی کۆمارەکەی، دێت ئەو پرۆگرامانە بەسەر سێ قۆناغی سەرەکیدا دابەش دەکات کە پێویستە دەوڵەت لەمیانەی ئەم پرۆگرامەوە هاوڵاتیانی خۆی لەمنداڵییەوە تا تەمەنی پەنجا ساڵی پەروەردە بکات.. کە بریتین لە:

### قۆناغی یەکەم

لەم قۆناغەدا کە لەمنداڵییەوە تاکو تەمەنی بیست ساڵی درێژە دەکێشێ فێرخواز کۆمەڵە وانەیەک لەبارەی مۆسیقاو مەشقی وەرزشییەوە وەردەگرێت، لەبابەتی مۆسیقادا شیعری چاک دەخوێنرێت، ئەم هەڵبژاردنی ئەم شیعرانەو پوختکردنی لەلایەن دەوڵەتەوە دەبێت و مەبەست لێی فێرکردنی پەندە باڵاکانی کۆمەڵگای ئەتینایە.. ئەفلاتۆن داوایکردوە شاعیرەکانی ئایندە لەژێر

---

140– بۆ زانیاری زیاتر لەمبارەوە بڕوانە: جمهوریة افلاطون: سەرچاوەی پێشوو.. لا ١٨٠–١٨٣.

چاودێری فەرمانڕەوا دابن نەوەك ببنە بایسی ئەوەی گەنجەکان لەڕێگەی ئەوانەوە فێری ڕەوشتی خراپ ببن.

مۆسیقا (بەلای ئەفلاتۆنەوە) چارەسەری کێشەی ناکۆکی نێوان ئازایەتیو نەرمونیانی دەکات، چونکی ڕۆح لەڕێگەی مۆسیقاوە فێری ئیقاع و ڕێکوپێکیو گونجاوییو خۆشویستنی دادوەریی دەبێت، کەسێك ئەگەر لەسەر بونیادێکی هاوسەنگ و دادوەریی پێگەیشتبێت ناکرێت ئەو کەسە ستەمکار بێت، مۆسیقا خوڵق دروستدەکات و لەبڕیاردانی وەکیەکی مەسەلە کۆمەڵایەتیو سیاسیەکان بەشدار دەبێت.[١٤١]

ڕاهێنانی وەرزشی لەپرۆگرامەکانی فێرکردنی گەنجاندا بەپلەی دووەم دێت، مەشقە سادەو ئاسانە وەرزشییەکان" تازەپێگەیشتوان فێری گوێڕایەڵیو ملکەچی دەکات، وەك چۆن لەگەڵ مۆسیقا بۆ دەرکردنی سەمای نۆتەییو چیرۆکە جوڵاوەکان بەمەبەستی پێگەیاندنی هزری لاوان لەسەر وەرگرتنی بەهاو پەندە ئەخلاقییە چاکەکاندا بەشدارە.

**قۆناغی دووەم**

لەنێوان بیست بۆ سی ساڵی، ئەوانەی بەشداریی ئەم قۆناغە دەکەن ئەو فێرخوازانەن کە لەقۆناغی یەکەمدا بەسەرکەوتوی وانەکانی بیرکاریو گەردون و فەلسەفەو میتافیزیکیان تەواوکردوە، لەڕاستیدا قۆناغی یەکەم تەنیا سەرەتایەك بووە بۆ ئاشکراکردنی بەهرەکانی ئەو فێرخوازە تازەپێگەیشتوە، لەکاتێکدا قۆناغی

---

141- دیورانت: سەرچاوەی پێشوو.. ل٣٥ .

مەشقکردنی دووەم قۆناغی فێربون و مەشقی جەستەیی و هزری و ڕەفتارییە.

## قۆناغی سێیەم

پێنج ساڵ دەخایەنێت، تەنیا ئەو فێرخوازانە بۆ ئەم قۆناغە سەردەکەون کە زۆرترین توانایان لەتێگەیشتنی وانەکانی قۆناغەکانی پێشوتردا دەرخستووە، لەم قۆناغەدا فێرخواز بابەتی فەلسەفە یان جەدەلی دیالێکتیکی پەیوەست بەپێشبینی میتافیزیکی دەخوێنێت، لەبەرئەوەی تێکڕای ئەم بابەتانە یارمەتیدەری دەبن لەبونیادنان و هاندانی بیری فەلسەفەو دواجار دەیگەننە ئاستی پێشبینی فەلسەفی.[١٤٢]

هاوکات لەگەڵ تەواوکردنی ئەم سێ قۆناغەدا، خوێندکار دەخرێتە بەر ئەزمونی زانستی و داوای لێدەکرێت بەکردەوە ئەرك و وەزیفەکانی دەوڵەت پیادە بکات بەمەبەستی ئاشنابوونی بەکێشەو گرفتەکانی ژیانی ڕۆژانە.[١٤٣]

لەگەڵ ڕوبەڕوبونەوەی ئیغرائاتی ئەو پۆستانەی لەداهاتودا لەئەستۆیان دەگرێت، ئەم ماوەیە پانزە ساڵ دەخایەنێت و تەنیا ئەو

---

142- الدكتور. علی احمد عبدالقادر: سەرچاوەی پێشوو.. ل٧٨-٨٢ .

143- واتە دابەزین لەلوتکەی فەلسەفەوە بۆ ئەشکەوتی جیهانی خەڵکی و شتەکان، کەواتە فێرکردنە ئەبستراکتەکان هیچ بەهایەکیان نییە، ئەگەر لەم جیهانە یەکگرتووەدا تاقی نەکرێتەوە، دەبا بوار بدەینە قوتابییەکانمان بەبێ هیچ بەزەیی و سۆزو چاکەدانێک بچنە ئەو جیهانەوەو ڕکابەری پیاوانی خاوەن کار بکەن.. لەم بازاڕی ڕکابەرییەدا لەخودی کتێبی ژیانەوە فێردەبن، چەناگە فەلسەفییان لەبەردەم ڕاستییە ڕەقەکانی کارکردندا هەڵدەقورتێنن .. بڕوانە: دیورانت: سەرچاوەی پێشوو.. ل ٤٢-٤٣.

کەسانە تێی دەپەڕێنن (کە لەپاڵ مەعریفەی فراوان سەبارەت بەتیۆرو راهاتنیان لەرێگەی مەشق و پسپۆڕییەوە) توانیویانە بەتەواوی خودی خۆیان بناسن و رۆحیان دیبێتەوەو، لەفەلسەفەی رەسەنی راستەقینەوە بەرەو فەلسەفەی رەهای کۆتانەهاتوو هەنگاو هەڵنێن، ئەمانە فەیلەسوفەکانن: کەسی خاوەن فەزیلە چاکەو خۆشەویستیو نکۆڵیکردنی خود پەردەپۆشی بیرو هەڵسوکەوتەکانی دەکات، ئەم لەهەر کەسێك زیاتر شیاوی ئەوەیە فەرمانڕەوایی میللەتەکەی بکات.[144]

کەواتە ئەو کەسەی کە ئەم قۆناغە بەسەرکەوتویی دەبڕێت ئەهلیەتی لەئەستۆگرتنی دەسڵاتی، بەشێوەیەکی دەوری دەست بەرێکخستنی دەوڵەت و کاروبارەکانی هاوڵاتیان دەکات، ئەمانە کاتێك پۆستەکان وەردەگرن" ئەمەیان وەك کارێکی خوازراو نەکردوە، بەڵکو وەك فەرمانێك کە خۆلێدزینەوەی نییە.

خستنەڕوی بەرنامەی ئەفلاتۆن لەبواری فێرکردندا دەگەینە ئەو بڕوای کە ئامانجی پەروەردەیی ئەم فەلسەفە بەرهەمهێنانی ئەو هاوڵاتیانی چاکەیە کە چاکەکەی لەسەر ئەندازەی ئەو زانست و مەعریفە بەندە کە وەریگرتوەو بووتە هۆی هاوسەنگییەکی ویژدانی کە ملکەچی هێزی عەقلیەتی،،ئەو هێزەی کۆنترۆلی گشت هێزەکانی تری مرۆڤ دەکات، کەسی هاوشێوە کەسێکی چاکەو بۆ ئەوە دەستدەدات کە دادوەریی لەناو کۆمەڵگەدا بڵاوبکاتەوە، کە پلەی

---

144- الدكتور. على احمد عبدالقادر: سەرچاوەی پێشوو.. ل ٨٣ .

چـاکییەکەی بەئەنـدازەی پابەنـدبونی بەپرەنسـیپەکانی پسـپۆڕیی وەزیفی ئەندامەکانی زیاددەکات.[١٤٥]

ئەم ئەنجامگیرییـەی سـەرەوە، وامـان لێناکات کە هەنـدێك راسـتی تایبەت بەم پرۆگرامە لەبیربکەین" کە بریتین لە:

١. سەرباری بانگەشەی هەلڕەخسانی فێربون بۆ کچان و کوڕانی هـەردوو چـینی فـەرمانڕەواو سـەربازەکان، چـینێکی گرنگـی کۆمەڵگاکـەی لـەبیرکردوە کـە چـینی (بەهـەمهێن)ە، ئەمـەش بەتـەنیا بریتـی نییـە لەبێبەشـکردنی نـەوەی چـینێکی کاریگـەر لـەفێربون و پێشـکەوتن، هاوکـات بێبەشـکردنی کۆمەڵگایـە لـەئیمکانیاتی خزمەتگوزاریی ئەو چینەو لانیکەم ئەوانەی لەویاندا هەڵدەکەون.

٢. بەپێی ئەوەی باسکرا، سەلامەتی کۆمەڵگەی فازیلە دوچاری نیگـەرانی دەبێتـەوە کـە دەرهاوێشـتەی هاوسـەنگ نـەبونی تۆکمـەی نێوان هێزەکانی ناو کۆمەڵگەیە.

٣. ئـەفلاتۆن لـەو بڕوادایـە دیـاریکردنی فـەرمانڕەوا لـەنێوان چـینەکانی فـەرمانڕەواو سـەربازەکاندا، پێویسـتە لەڕێگـەی پرۆسـەیەکی فێرکارییو پـەروەردەیی درێژخایەنـەوە بێـت و لەگەڵیـدا راهێنانی کرداریی هەبێت کە لەروی بەکاربردنەوەی هیچی لەرەگـەزی زەمـەن کەمترنـەبێت و لەگـەڵ پرەنسیپەکانی دیموکراسیدا نەیەتـەوە" ئـەو پرەنسـیپانەی پێیانوایـە کـە دەبێـت فـەرمانڕەوا لەڕێگـەی هەڵبژاردنـەوە دیاریبکرێـت، بـۆ کەمکردنـەوەی ئـەم روداوە، خـودی ئـەفلاتۆن بانگەشـەی دیموکراسـی نمونـەیی نـەکردوە، بـەو ئەنـدازەی

---

145– هەمان سەرچاوەی پێشوو.. ل ٨٣ .

بانگەشەو کاری لەسەر بەدیهاتنی توانایی کردوە لەئەنجامدانی وەزیفە گشتیەکاندا لەسەربنەمای ئەرستۆکراتیەتی فیکر.[١٤٦]

## پێنجەم: سێستمەکانی فەرمانڕەوایی

ئەفلاتۆن بەتێکەڵکردنی عەقڵ و مێژوو تیۆرەکەی دەربارەی سێستمەکانی فەرمانڕەوایی دارشتوە" لەزاری سۆکراتەوە لەکتێبی هەشتەمی "کۆمار"دا لایەنەکانی سێستمی حوکمڕانی کە بڕیار لەسەر ئامانجی دەوڵەت و نمونە باڵاکانی دەدەن، رونکردوەتەوەو ئەم سێستمانەی بۆ پێنج سێستم پۆلێنکردوە، ئەوانیش[١٤٧]:

### ١. سێستمی ئەرستۆکراتی Aristocracy

لەهەموو سێستمەکانی تری فەرمانڕەوایی کاملترەو ئامانجی بەدیهاتنی چاکەو فازیلە، رەنگدانەوەی سێستمێکی دادوەری دەوڵەتە.

### ٢. سێستمی تیمۆکراسی:

Timoeracy or government by the principle of honor

بریتییە لەو سێستمەی کە تیایدا کۆمەڵە خەڵکانێك فرمانڕەوایی دەکەن، کە بەشوێن سەروەریی و شەرەفدا دەگەڕێن و ئارەزوی سەرکەوتن و پایەبڵندی دەکەن، کەواتە فەرمانڕەوایی کەمینەی سەربازییە.

---

146- سەرچاوەی پێشوو.. لا ٨٤.. بۆ زانیاری زیاتر سەبارەت بەدیاردەکانی فیکری ئەریستۆکراتی لەفەلسەفی ئەفلاتۆندا بڕوانە: جمهوریة افلاطون: سەرچاوەی پێشوو.. لا ٢٤٦-٢٥٢.. هەروەها: الدكتور. مصطفى الباردوی: لمحات من الفكر السياسي حول الفرد و الدولة، مطبعة الجامعة-دمشق.. لا ٢٨-٢٩ .

147- Mcdonald, op. cit.. p 24-25.

### ٣. سێستمی ئۆلیگارشی

Oligarchy or the rule of the rich

سێستمی حوکمڕانی دەوڵەمەندەکانە، بەجۆرێك بایەخی زیاتر بەسامان و دابەشکردنی دەدرێت.

### ٤. سێستمی دیموکراسی

Democracy or The rule of the people

مەبەست لێی ئەو سێستمەی فەرمانڕەواییە کە تیایدا هاوڵاتیانی ئازاد فەرمانڕەوایی دەکەن و، ئنجا ئەرکی گەورەی دەوڵەت بەدیهاتنی ئەو ئازادییەو پاسەوانی کردنیەتی.

### ٥. سێستمی تایرەنی یان دیسپۆتیزم

Tyrany of despotism

بریتییە لەفەرمانڕەوایی ستەمکار یان زۆردار، بەجۆرێك نەزانیی و بێتوانایی و زەوتکردنی دەسڵات باڵی بەسەردا دەکێشێت، ئەفلاتۆن ویستویەتی ئەوە رونبکاتەوە" کە دەوڵەتی نمونەیی پێویستە بەو چوار قۆناغە ریزکراوەی سەرەوەدا تێبپەڕێت، هەر قۆناغێك دەرئەنجامی قۆناغەکەی پێشوترە: تیمۆکراسی دەرئەنجامی سێستمی (نمونەیی) ئەرستۆکراتییە، ئۆلیگارشی دەرهاوێشتەی سێستمی تیمۆکراسیی و دیموکراسی دەرئەنجامی سێستمی ئۆلیگارشیی و تایرەنی یان زۆرداری بەرهەمی سێستمی دیموکراسییە.[١٤٨]

[148]- Harmon, op. cit.. p 40-41.

لەراستیدا ئەم زنجیرەی بەدوایەکدا هاتووەی پۆلێنکردنی سیستمەکانی فەرمانڕەوایی نوێنەرایەتی ئەو شتە دەکات کە هەزیود Hesiod ی شاعیر لەبارەی بنەڕەتی رەگەزەکانی مرۆڤەوە لەلێکۆڵینەوە تایبەتەکەیدا دەربارەی رەچەڵەکی بوون کە بریتین لەرەگەزەکانی ئاڵتون و زیو و برۆنز پێشەکی کردون: رەگەزی خواوەند لەپاڵەوانەکان، ئنجا رەگەزی ئاسن.. لەکاتێکدا رەگەزی خواوەند لەپاڵەوانەکان بەرامبەرە لەگەڵ سیستمی دیموکراسی لای ئەفلاتۆن، بەهەمانشێوە رەگەزەکانی تر بەپێی هەمان زنجیرە بەرامبەرن لەگەڵ سیستمەکانی تردا.

دابەشکردنی سیستمەکان بەمشێوە پرسیارێك لەبارەی چۆنێتیی گۆڕان و گواستنەوە لەسیستمێکەوە بۆ سیستمێکی تر دێنێتە ئاراوە، بەواتایەکیتر ئایا کۆمەڵە کارەکتەرێکی تایبەت هەیە کە رۆڵیان لەگواستنەوەی قۆناغەکاندا هەبێت: گواستنەوە لەسیستمی ئەرستۆکراتییەوە بۆ سیستمی زۆرداریی؟

**لەمبارەوە ئەفلاتۆن بەشێوەیەکی گشتی تەفسیری ئەم دیاردەمان بۆ دەکات کە دەکرێت بە مجۆرە کورتبکرێتەوە:**

---

- بەواتای ئەوەی کە رۆڵی بیروباوەڕ یان مەزهەب لەپەسەندکردنی پەیوەندییەکانی رۆما لەگەڵ وڵاتانی تر لەئاستێکی نزمدا بووە، دەمێک کات هەنوکەیی دەبێت هیچ بوارێک بۆ دروستکردنی مەزهەبی سیاسی نامێنێتەوەو بەتایبەت کاتێک پیاوانی دەوڵەت لەبنەڕەتدا سەرکردەی سەربازیی گشت بەرەکانی شەڕ بن، سەرباری ئەم پێداویستییە هەنوکەییە، کارکردنێک لەلایەن رۆماوە لەئارادایە بۆ سوک و ریسواکردنی تەواوی گشت ئەو شتانەی لەدەرەوەی چوارچێوەی ئەوەوەیە، ئاسایی دەبێت بیر لەداڕشتنی بیروڕاکانی خۆیان بکەنەوە بەشێوەی کۆمەڵە بنەماو مەزهەبێک دەربارەی گەلانێک کە لەئاستێکی خوار خۆیەوەن، تەنیا بەوە ئیکتیفایانکرد بەوشیاریی‌و بەتەواوی ئیدارەی بکەن.. بڕوانە: جان توشار: سەرچاوەی پێشوو.. ل ٤٥ .

١. کاتێك خۆشەویستی خاوەنداریێتی لەدڵی خەڵکیدا دەچەسپێت و بــەهای فەلســەفە دەســت روو داڕوخــان دەکــات سێســتمی ئەرســتۆکراتییە دەگۆڕێــت بــۆ سێســتمی تیمۆکراســی.. ئــەفلاتۆن پێیوایە ئەم سێستمی تیمۆکراسی‌یە لەچاکەو خراپە پێکهاتووەو ئەو کەسەی نوێنەرایەتی دەکات خاوەن ناوبانگی‌و دەسڵاتە کە بەهێزی وتاربێژی گوزراشتی لێناکات، بەڵکو بەپشت بەستن بەهێزی چەك و ئەو سەرکەشیانەی کە لەگەڵ جەنگدا گونجاون.

٢. کاتێك خەڵکی دەبنە کۆیلەی خۆشویستن وکۆکردنەوەی پارە، ئیتر سێستمی تیموکراسی دەگۆڕێت بۆ سێستمی ئۆلیگارشی‌و چینی دەوڵەمەند دەسڵات کۆنترۆڵدەکەن بەبێ ئەوەی چینە هەژارەکە هیچ پشکێکیان تیایدا هەبێت، ئیتر خەڵکە خۆشگوزەرانەکە بەچاوی ئیرەییەوە لەیەکتر دەڕوانن و دەچنە رکابەرییەکەوە کە رەنگدانەوەی لەو کۆمەڵگەدا دەبێت کە خۆیان بەشێکن لێی، زۆر توند بەشوێن کۆکردنەوەی پارەدا وێلدەبن و لەم رێگەدا هەموو بەهایەکی فەزیلە لەدەستدەدەن و پێودانگی سامان بەسەریاندا زاڵدەبێت، بەمجۆرە دەتوانرێت بوترێت جیاوازییەکی گەورە لەنێوان پارەو فەزیلەدا هەیە و ئەگەر بێتو بخرێنە دوو تای تەرازویەکەوە هەمیشە یەکیان بەرزدەبێتەوەو ئەویتریان دەکەوێت.

لەسێستمێکی هاوشێوەدا، کە خاوەنداریێتی زۆر بەتوندی باڵادەستە، دەوڵەمەندە ئۆلیگارشی‌یەکان (ئەوانەی بایەخێکی ئەوتۆ بەفەزیلەو شەرەف نادەن) و منداڵەکانیان بە بەنازیی‌و تەمەڵی و گەندەڵی‌و تەنانەت مەکربازی پەروەردە دەکرێن، دەبنە جێگەی رق وکینەی چینە هەژارەکە کە سەرباری لاوازی جەستەیاندا زبرن.

٣. ئەو کاتانەی هەژارەکان لەناخیاندا هەستێکی وا دروست دەبێت کە خۆیان لەدەوڵەمەندەکان بەباشتر بزانن، ئیتر سیستمی ئۆلیگارشی دەگۆڕێت بۆ سیستمی دیموکراسیو خەڵکانێکی هەلپەرست کە لەسەر حسابی دەوڵەمەندە ریسواکان دەوڵەمەند بوون رابەرایەتی دەکەن و لەساتەوەختی گونجاودا دەسڵات دەگرنە دەست" ژمارەیەك لەدەوڵەمەندەکان دەگرن و ژمارەیەکیان دوردەخنەوەو لەگەڵ ئەوانیتر کاروبارەکانی فەرمانڕەواییو سەرۆکایەتی دابەشدەکەن.

دیموکراسی ئەو سیستمەیە کە ئازادی بۆ هەموان دەستەبەردەکات، هاوڵاتیان لەسایەی ئەم سیستمەدا (بەوتەو بەکردەوە) ئازادن و ئینجا دەتوانن شێوازەکانی ژیانیان بەو شێوە رێکبخەن کە لەگەڵ روانینە خۆییەکانیاندا دەگونجێت، لەئاکامدا جیاوازی رەوشتەکانی لێدەکەوێتەوە کە لەسایەی هیچ سیستمێکی تردا بەو چڕییە بەدیناکرێت.

بەمجۆرە دەستور لەم سیستمەدا وەك باشترین دەستور دەردەکەوێت، بەجۆرێك ئەم فەرمانڕەواییە لەپارچە جلێکی هەمەڕەنگ دەچێت و هەروەك چۆن منداڵ و ژنان بەجلوبەرگی رەنگاوڕەنگەوە سەرسام دەبن، ئاوا زۆرێك لەخەڵکی لەو بڕوادان ئەم سیستمە جوانترینی سیستمەکانە.[١٤٩]

نەبرەی گاڵتەجاڕی ئەفلاتۆن زۆر بەرونی دەردەکەوێت، بەتایبەت کاتێك دواتر بەئاشکرا باس لەستەم لەسیستمی (دیموکراسی)دا دەکات کاتێك دەڵێت:

---

149– جمهورية افلاطون: سەرچاوەی پێشوو.. ل ٣٠٥-٣٠٦

**(ئەمە هەندێکە لەخەسڵەتەکانی دیموکراسی و گشت گریمانەیەك لەئارادایە ببێتە دەوڵەتێکی قبوڵکراو" بەرەنگیی حزبیو بەبێ یاسا، مادامێکی بەشێوەیەکی یەکسان مامەڵە لەگەڵ ئەندامەکانیدا دەکات جا ئیتر یەکسان بن یان نا).**[150]

٤. کاتێك ئازادیی لەکۆمەڵگەدا دەگاتە دواترۆپك، حوکمی زۆرداریی لەسیستمی دیموکراسی دێتەئاراوە، بەجۆرێك مەسەلەکە لەسایەی ئەم سیستمەدا دەگاتە ئاستی سوکایەتیکردن بەعورف و یاساکان، و سەروەریی جگە لەسێبەرەکەی هیچی نامێنێتەوەو، بەبڕوای ئەفلاتۆن سیستمی زۆرداریی لەم خاڵەوە دەست پێدەکات، ئازادی فراوان بەم پێیە زەمینە بۆ بۆ قورسترین جۆری بەکۆیلەکردن و دڕندەترین چەشنی دەڕەخسێنێت.

سیستمی دیموکراسی تەنیا سیستمێکە کە بوار بۆ تاك دەڕەخسێنێ بەئارەزوی خۆی هەڵسوکەوت بکات و سوکایەتی بەیاساکان بکات، بۆیە لەگشت گریمانەکاندا دیموکراسی و تەنیا دیموکراسی بنەڕەتی حوکمی زۆردارییە، کاتێك دەوڵەتەی دەبێتە

150- ئەفلاتۆن ئەمەش بۆ وتەکانی پێشوتری زیاد دەکات، کاتێک دەڵێت: لەسیستمێکی هاوشێوەی ئەم سیستمەدا تاکەکەس ئەگەر خۆی ئارەزویی لێنەبێت ناچارناکرێت بۆ لەئەستۆگرتنی کاروبارەکانی بەڕێوەبردنی دەوڵەت، ئەگەرچی توانای لەئەستۆگرتنی ئەو کاروبارەشی هەبێت و ناچاری شەڕکردن ناکرێت ئەگەر ئەوانیتر بەشداری شەڕەکەیانکردو لێپرسراو نییە لەپاراستنی ئاشتی ئەگەر ئەوانیتر ئەو ئەرکەیان لەئەستۆگرت، ئەگەر بەکرداریی خوازیاری ئاشتی نەبێت، لەلایەکی دیکەوە ئەگەر خۆی ئارەزوی بکات مافی سەرۆکایەتیکردن و فەرمانڕەوایەتیکردنی هەیە، تەنانەت ئەگەر یاسا گشت سەرۆکایەتیکردن یان فەرمانڕەوایەتی کردنێکیشی لێقەدەغەکردبێت، ئایا ئەم یاسایە لەیەکەم تێڕوانیدا یاسایەکی قەشەنگ دەرناکەوێت.. هەمان سەرچاوەی پێشوو.. ل ٣٠٦ .

کۆیلەی فەرمانڕەوایەکی زۆردار، هەموو بنەماکانی ئازادی ئیدارەکردنی کاروبارەکانی لەدەستدەدات و دەکەوێتە ژێرکێفی هەواو ئارەزوەکانی تاکەکەسێکەوە" بەمەیلی خۆیو چۆن بیەوێت فەرمانڕەوایی دەکات.[151]

ئەگەر ئەم لایەنانە کۆی گرنگترین چارەسەرە بیرییەکانی ئەفلاتۆن بێت بۆ مەسەلەی فەرمانڕەوایی وەك لەکتێبی "کۆمار"دا هاتووە، ئایا هیچ رەخنەیەك روبەڕوی بیرەکانی ناو کتێبەکە کراوەتەوە؟

**دیارترین ئەو رەخنانەی ئاراستەی (کۆمار)ی ئەفلاتۆن کراون، بریتین لە[152]:**

١. ئەفلاتۆن کەسێکی خەیاڵی بووەو بیروڕاکانی مۆرکی خەیاڵی بەڵکو ئەفسانەییان هەبووە، ئەو دەوڵەتە نمونەییە ئەفلاتۆن لەسەر کاغەز نەخشەی بۆکێشابوو وێنەکەی لەبەرچاوان دیمەنێکی جوانی بوو، بەڵام تەنیا لەسەر کاغەز.. ئەم بیروڕایانە، بەواتایەکیتر کۆمەڵە خەونێکەو ئەفلاتۆن بەوشە چنیویەتی.

ئەفلاتۆن لەقۆناغی لاویدا هەستی بەم راستییە کرد، بۆیە بیردۆزەکەی سەبارەت بەدەوڵەتی نمونەیی هەمواردەکات، پاش ئەو نائومێدیو تاڵی شکستەی چەشتی کاتێك ویستی لەسیراکیۆز

---

151– الدکتور. نزار الطبقجلی: سەرچاوەی پێشوو.. ل ٧٤.

152– بڕوانە: الدکتور. عبدالحمید متولی: سەرچاوەی پێشوو.. ل ٥٣-٥٤ .. بەراوردی بکە لەگەڵ: الدکتور. محمد الشنیطی: سەرچاوەی پێشوو.. ل ٢٦-٢٨ .

دەوڵەتە نمونەییەکەی کە فەیلەسوف بەبێ پابەندبون بەیاساوە فەرمانڕەوایی دەکات دابمەزرێنێت.[١٥٣]

٢. حوکمڕانی ڕەها، هەرگیز فەرمانڕەوایەکی نمونەیی دەرناچێت، باوەڕبونی ئەفلاتۆن بەحکومەتێك کە کەسێکی خاوەن دەسڵاتی ڕەها بەڕیوەی ببات، ئەگەرچی ئەو کەسە خاوەنی بەرزترین ئاستی زانستیو فەزیلەش بێت، ئنجاناکرێت پشتی پێ ببەسرێت، لەبەرئەوەی بەفەرمانڕەوایەکی باش دانانرێت، ئەگەر پابەندی پرەنسیپی سەروەری یاسا نەبێت بەسەر هەڵسوکەوت و هەنگاوەکانییەوە.

153– ئەوەندە هەیە کەسانێک بڕوایان بەم ڕەخنەیە نەهێناوەو لەو بڕوایەدان ئەو بانگەشەیە هیچ بنەمایەکی لەراستییەو نییە کە دەدرێتە پاڵ ئەفلاتۆن گوایە هەوڵیداوە دەوڵەتێکی ئیدیاڵی ناپابەند بەیاسا دابمەزرێنێت، بەڵکو پێچەوانەکەی ئەمە ڕاستە چونکە ئامانجی بووە دەوڵەتێک دروست بکات کە ملکەچی پرەنسیپی قەڵەمڕەویی بەندەکانی یاسایە، وەک چۆن ئەفلاتۆن لەلایەکی دیکەوە کەسێکی ئیدیاڵ یان خەیاڵی نەبووە بەڵکو چاکەخوازێکی ئەخلاقییە کە پابەندی میسالیاتە، لەبەرئەوەی بانگەشەی ئەو بنەما ئەخلاقییە تەندروستانە دەکات کە پێویستە دەوڵەتیان لەسەر بونیاد بنرێت و ئەمەش بەشێوەیەکی تایبەت پرەنسیپی دادوەریی‌و یەکسانی‌و لایەنگریی ڕاستگۆیانەو تەواوی هاوڵاتییە بەرامبەر بەنیشتمان و پاراستنی یەکێتییە لەنێوان ڕۆڵەکانیداو پێویستە زانیارترین و چاکترین خەڵکی فەرمانڕەوایەتی لەئەستۆ بگرن و ڕاست نییە کەسێک لەبەر بانگەشی ڕەچاوکردنی ئەم پرەنسیپانە بەخەیاڵی دابنرێت، تەنیا مەگەر ئەو کاتانەی کە پێیوابێت دامەزراندی دەوڵەتی هاوشێوە کارێکی ئاسانە.. بۆ نمونە بڕوانە: پێشەکییەکەی بارتلمسی سانهلێر لەکتێبی (السیاسة)ی ئەرستۆدا، ترجمة: احمد لطفی السید، مطبعة دار الکتب المصریة، القاهرة-١٩٤٧.. ل ٢٢ .

وادەردەکەوێت ئەفلاتۆن ئەوەی بەسەردا تێپەڕیوە کە هیچ شتێك بۆ نەتەوەو تەنانەت حاکمەکەش لەوە مەترسیدار نی یە کە دەسڵاتێکی ڕەها بدرێت بەو حاکمە.

٣. پشتگوێ خستنی بەهرەی سیاسی لەلایەن ئەفلاتۆنەوە، تەنیا باسی ئەو فەزیلەو زانستەی کردوە کە دەبێت لەفەرمانڕەوادا فەراهەم ببێت، کەچی بەهرەی سیاسی لەبیرکردوە کە لەپێشینەی خەسڵەتە گرنگەکانی فەرمانڕەوایە.. ئەم بەهرەیە وەك بەهرە هونەریی و ئەدەبییەکان لەگەڵ لەدایکبونی مرۆڤدا دێتە ئاراوەو ئەو کەسەی لەناخیدا ئەم چەمکە خۆرسك دروست نەبوبێت، هەرگیز لەڕێگەی پرۆسەی فێرکارییەوە فێر نابێت، ڕاستە ئەگەر بەهرەکە هەبێت زانست و فێرکاری ڕۆڵیان دەبێت لەپەرەپێدان و کامڵبونی ئەو بەهرەیەدا.

٤. ئەفلاتۆن ماوەی گواستنەوەی فەرامۆشکردوە، ئەوەی لەکیس چوە وێنەی ئەو ماوەی گواستنەوەیە بکێشێت کە دەبێت دەوڵەتە نمونەییەکە پێش گەیشتن بەقۆنانی شیوعیەت تێی پەڕێنێت،[154] ئەمە مەسەلەیەکە مارکسیش تێی نەپەڕاندوە.

---

154– ئەرستۆ کۆمەڵێک ڕەخنەی لەهاوبەشییەکەی ئەفلاتۆن گرتوە، کە دەکرێت هێڵە گشتییەکانی بەمشێوە کورتبکرێتەوە:

ا. هاوبەشێتی موڵکایەتی لەو ڕوانگەوە ڕەخنەی لێدەگیرێت کە تاک هەموو هەوڵ و چاودێرییەکی ناخاتەگەڕ ئەگەر موڵکی تایبەتی خۆی نەبێت و ئەگەر دابەشکردنی پێداویستییەکانی ژیان و کرێ لەسەر ئاستی پێداویستی نەک بەئەندازەی کارکردنی بێت، ئەمە دەبێتە هۆی ئانەوەی گلەیی‌و سکاڵا لەلایەن ئەو کەسانەی کە کاری زیاتریان کردوەو کەچی لەوانیتر زیاتریان نادرێتێ، وەک چۆن هاوبەشی دەروازە لەبەردەم ئازادیدا دادەخات، تاک چۆن ئازاد دەبێت لەکاتێکدا شتێک نییە موڵکی ئەو بێت تا ئازاد بێت مامەڵەی پێوە بکات؟

دوا وتەیەکیش کە دەربارەی کتێبی " کۆمار "دەوترێت: ئەگەر ئەفلاتۆن جۆرێك لەناکۆکی لەنێوان بونی یاساکان و حیکمەتەکانی فەیلەسوفی دادوەریی‌دا دۆزیبێتەوە.. ئەوا پراکتیزەکردنی ئەزمونەکە لەسیراکۆز و ئەگەرەکانی داڕوخانی ئەو سێستمە نمونەیەی ئەفلاتۆن لەئەندێشەی خۆیدا وێنای کردوەو گۆڕانی بەرەو فەرمانڕەواییەکی تۆتالیتێرو ستەمکار.. گەیاندویانەتە بیروباوەڕی زۆر واقیعی ترو ئەمەش بەئاشکرایی لەکتێبی (سیاسەتمەدار)دا دەردەکەوێت.. ئەفلاتۆن لەم کتێبەیدا دەگەڕێتەوە بۆ دابونەریتەکانی گریك لەبانگەشە کردنیدا بۆ بونی یاساکان لەپێناو پاراستنی کۆمەڵگە لەدژی هەر هەلێك کە لەرێگەیەوە فەرمانڕەوایانی ناشارەزاو بێ فەزیلەت و خراپ بگەنە کورسییەکانی دەسڵات.

ئەوەندە هەیە گەڕانەوەی ئەفلاتۆن بۆ نەریتەکانی گریك لەپابەندبون بەیاساوە نەیگەیاندوەتە ئەو ئاستەی یەکسانی بکاتەوە لەگەڵ فەرمانڕەوایی فەیلەسوفدا، بەڵکو بەپلەیەکی دوای ئەو

---

٢. ئەرستۆ هەروەها رەخنە لەهەڵوەشاندنەوەی خێزان و هاوبەشی ژنان و منداڵ دەگرێت، چونکە هاوبەشی لەژندا لەکاتێکدا هاوشێوەیە لەگەڵ هەڵسوکەوتی هەندیک لەئاژەڵاندا، ناچێتە لیستی ئەو نەریتانەی کە دەبێت مرۆڤ لەخۆیدا بەرجەستەی بکات، کاتێکیش گشت هاوڵاتییەک هەزارەها منداڵی چوارچێوەی دەوڵەت بەمنداڵی خۆی دەزانێت، ئیتر ئاستی بایەخدانی بەپەروەردەکردنیان روو لەکەمی دەکات.

٣. جیبەجێکردنی هاوبەشی ئەفلاتۆن لەسەر چینێکی کۆمەڵگەو لەگەڵ جێبەجێ نەکردنی لەسەر چینەکانی تر دروستبونی دوو دەوڵەتی لەدەوڵەتێکدا لێدەکەوێتەوە" دوو دەوڵەت کە هەریەکەیان دژایەتی ئەویتریان دەکات و ئەمەش لەگەڵ ئەو یەکێتی دەوڵەتەدا نایەتەوە کە ئەفلاتۆن بانگەشەو داوای کردوە.. بڕوانە: الدکتور. عبدالحمید متولی: سەرچاوەی پێشوو.. ل ٥٨-٥٩ . بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: ارسطو: السیاسة (الکتاب الثانی- البابین الاول و الثانی): سەرچاوەی پێشوو.. ل ١٢٦ و ل ١٣٤ .

دایناوه، چونکه هیچ یاساو ڕێسایەکی (دانراو) نییه بکەوێته سەرو مەعریفەوەو حیکمەتی لێ بەرهەم بێت.[155]

بەندی دووەم

# ئەفلاتۆن _ سیاسەتمەدار

## The Statesman

پەرتوکی "سیاسەتمەدار" یان "پیاوی دەوڵەت" لەوتوێژە بیرییەکانیدا ئەفلاتۆن دەیەوێت ئەو مۆرکە لەسەر تیۆرە سیاسیەکەی بسڕێتەوە ( دورخستنەوەی یاسا بەتەواوی لەو دەوڵەته نمونەییه کە فەیلەسوف فەرمانڕەوایی دەکات) کە لەکتێبی یەکەمیدا " کۆمار" جەختی لەسەر کردبووه، بەڵام لەکتێبی "سیاسەتمەدار"دا ئەفلاتۆن پێداگری لەسەر دوو خاڵی سەرەکی دەکات" یەکەم: پەیوەسته بەدیاریکردنی پێگەی یاسا لەدەوڵەتدا، ویان ئایا سەبارەت بەجیهان کامیان چاکترن: فەرمانڕەوایی تاکە کەس یان فەرمانڕەوایی دەستوری، واتا حوکمی تاکەکەسی یان حوکمی یاسا؟.. دووەم: تایبەته بەرونکردنەوەی شێوە جیاجیای سیستەمەکانی فەرمانڕەوایی.

### یەکەم: پێگەی یاسا لەچوارچێوەی دەوڵەتدا

کاتێک ئەفلاتۆن لەدەوڵەتەکەیدا چارەسەری مەسەلەی یاسا دەکات، بەپێناسەی سیاسەتمەدار یان پیاوی دەوڵەت دەستپێدەکات، دوپاتیدەکاتەوە: ( سیاسەتمەدار زانایەکی کارامەو

---

155– بڕوانه الدكتور. علی احمد عبدالقادر: سەرچاوەی پێشوو.. ل ٩٩ . و هەروەها بەراوردی بکە لەگەڵ: الدكتور. عبدالحميد متولی: سەرچاوەی پێشوو.. ل ٥٨ .

پسپۆڕێکە هونەرەکەی لەسەر کۆمەڵگەدا پیادە دەکـات کـە خـاوەن شـارەزایی نین).[156]

( سیاسەتمەدار هونەرمەندە زۆرترینــی تواناکـانی لەمەعریفەدایـەو لەمـەدا سیاسـەتمەدار لەشـوان دەچـێت و بـەڵام لـەبری مێگـەل ئـەویان سەرپەرشـتی مرۆڤگەل دەکات و کاروبارەکانیان رایدەکات، سیاسەتمەدار ئـەو بەخێوکەرەیـە کاروباری ئەندامانی خێزانەکەی لەپێناو چاکەی هەمواندا بەڕیوەدەبات).[157]

لێکچـواندنی ئـەرکی سیاسـەتمەدار بەئـەرکی سەرپەرشـتیاری خێـزان، لـەو روانگـەوە سەرچـاوەدەگرێت" هەریـەك لەسیاسـەتمەدارو سەرپەرشتیاری خێـزان کار بۆ بەرژەوەنـدی گشـت کۆمەڵگا دەکـەن و بـەو ئەنـدازەی سەرپەرشـتیاری خێـزان لەبەرژەوەنـدی ئەنـدامانی خێزانەکـەی دەکـات، سیاسـەتمەداریش لەبەرژەوەنـدی کۆمـەڵ وەك "گشت"ێك کاردەکات.

لــەلای دیـارترین فەیلەسـوفەکانی دواتـری گریـك "ئەرسـتۆ" بەدینـــەکردوە لەســـەر ئـــەوەی کـــە سروشـــتی خێـــزان بەتـــەواوی لەسروشتی دەوڵەت جیاواز بێت.

---

[156]– بڕوانە: افلاطون: رجل الدولة، تعریب: ادیب منصور، دار بیروت للطباعة و النشر، بیروت-١٩٥٩ .. ل ١٠ .. هارمۆن سیاسەتمەداری چاک بەفەرمانڕەوای پاسەوان دەچوێنێت کە دەبێت کارامە بێت، ئەو فەرمانڕەوای دەکات لەبەرئەوەی کە دەزانێت فەرمانڕەوایی بکات و ئەم توانایەتییە ئەو مافەی بۆ دەستەبەر دەکات، پیاوی دەوڵەت هونەرمەند (Anartist)ەو بەکوێرەی بەهرەمەندیو زانیاریی تایبەت خەڵکی دەخاتە ژێر رکێفی خۆیەوە.. بڕوانە:
- Harmon., op. cit.. p 42.

[157]– سباین: سەرچاوەی پێشوو.. ل ٨٩ .

بێگومـان لێكچـواندنی دەوڵـەت بـەخێزان پەسـەندكردنی تیـۆری فـەرمانڕەوایی ڕەهایـە، دەلالـەتی ئـەم لێكچـواندنە گشـت هاوڵاتیـان ملكەچـی سیاسـەتمەدار/سـەرۆكی دەوڵـەت دەكـات، ملكەچـی تـەواوی هاوشێوەی ملكەچی ئەندامانی خێزان بۆ سەرپەشتیاری خێزان.

ئنجـا ئـەفلاتۆن پرسـیار دەربـارەی گرنگـی یاسـا دەكـات و لـەو بڕوادایــە فەیلەســوف لەتوانایــدا لەمیانــەی مەعریفــەو زانســت و لێهاتوییـەوە لـەكاروبارە سیاسـیەكان تێبگـات و بڕیـارو چارەسـەری پێویسـت بـۆ گشـت یـەكێك لەحاڵەتـەكان دەرچـوێنێت، مـادامێكی كارەكـان بەمشێوە بەڕێدەكرێن، چ پێویستە فەیلەسوف پابەندبكرێت بەندەكانی یاساوە.[158]

لەبەرئەوەی دەسڵات دەدرێتە دەست خـەڵكانی خـاوەن مەعریفـە/ فەیلەسـوفان" ڕەزامەنـدیی یـان نـاڕەزایی ژێرفەرمانـەكان كاریگـەری لەســەر ڕەوایــەتی دەســڵات نابێــت، چــونكە پیـادەكردنی دەســڵات لەلایەن فەیلەسوفانەوە بەدانایی‌و عاقڵانە دەبێت و ئنجا ئـەفلاتۆن لـەم بارەوە نمونەیەكمان پێشكەشدەكات و دەڵێت:

(... بـەم پێیـە سـكاڵای ڕەعیـەت و یاسـایی بـوونی فـەرمانڕەوایی جێگـەی گومـان دەبێـت، بەگەڕانـەوە بـۆ هونـەرەكانی دیكـە "بەتایبـەت هونــەری پزیشــكی" دەبیــنین پزیشــك هەمیشــە ئــەو كەســەیە چارەسەرمان دەكات، ئیتر ئەگـەر مامـەڵكردنی لەگەڵمانـدا بەڕەزامەنـدی خۆكـان بێـت یـان بەپێچەوانەوە؛ ئەگـەر برینـدارمان بكـات یـان بـەئاگر چارەسەرمان بكات ویـان ببێتـە هـۆی ئازاردان وهاواركردنمـان، شوێن ڕێسـا نوسـراوەكانی پزیشـكی بكـەوێت یـان نـا، تائـەو كاتـەی

---

158– افلاطون: رجل الدولة: سەرچاوەی پێشوو.. لا ١٩-١٠١-١٠٤ .

چارەسەرەکانی تەندروستی بۆ لەشمان دەگەڕێنێتەوە پزیشکە.. هەروەها سێستمی فەرمانڕەوایی چاك بەجۆرێك ئەوانەی کە بەباشی لەهونەری حوکمڕانی گەیشتون: ئیتر بەپێی یاساکان بەبێ یاساکان، بەڕەزاکەندی ژێردەستەکان یان بەبێ ڕەزامەندی ئەوان فەرمانڕەوایی بکەن، مادامێکی سێستمی فەرمانڕەوایی بەرەو چاکسازیی جەستەی سیاسیمان دەبات، ئاساییە ئەو دەسڵاتدارە ئامانجەکەی لەرێگەی کوشتن ژمارەیەك لەخەڵکی یان دورخستنەوەی هەندێکەوە واتە لەرێگەی کەمکرنەوەی رێژەی دانیشتوانەوە بەدیبهێنێت یان بەهێنانی هاوڵاتی لەدەرەوە بەمەبەستی زۆرکردنی رێژەی دانیشتوان.[159]

لەئەنجامی گرێدانی دەسڵات بەمەعریفەوە ئەوەشی لێدەکەوێتەوە: دەسڵات لای ئەفلاتۆن پێویستە تەقدیری رەها بێت، لەبەرئەوەی یاسا ناگەتە ئاستی ئەقڵ،[160].. ئەم فەرمانڕەواییە (کە ملکەچی یاسا نییە) تەندروستترین جۆری فەرمانڕەواییەو تەنیا حکومڕانی راستەقینەیە، بەجۆرێك دەبینین فەرمانڕەواکانی بەڕاستی زانان نەك تەنیا سیماکەیان پێوەبێت" هیچ جیاوازییەك نییە ئەگەر بەپێی یاسا یان بەبێ یاسا فەرمانڕەوایانکرد، بەبێ گوێدانە ئەوەی کە ئایا ژێردەستەکانیان بەو فەرمانڕەواییە رازی بن یان نە.

---

159- الدکتور. علی احمد عبدالقادر: سەرچاوەی پێشوو.. ل ١١٠ .. بەراوردی بکە لەگەڵ سەرچاوەی پێشوو.. ل ٩٧-٩٨ و هەروەها بڕوانە:
- King, J Charles, and Mcgilvray. James A., Political and Social Philosophy., Mcrraw- Hill, N.Y.. P 36.

160- الدکتور ثروت بدوی: سەرچاوەی پێشوو.. ل ٦٩.

بەستنەوەی دەسڵاتدار بەبەندەکانی یاساوە، لەلایەکی دیکەوە گاڵتەجارییەکی ئاشکرایە، ئەفلاتۆن ئەم حاڵەتە بەحاڵەتی پزیشکێك دەچوێنێت کە دوای لێدەکرێت پابەندی ڕێسا پزیشکییە نوسراوەکانی ناو کتێب بێت لەکاتێکدا دەتوانێت کتێبی هاوشێوە بنوسێت. چۆن داوا لەپزیشك بکەین پابەندی پەرتوکێك بێت کە نوسراوی دەستی خۆیەتی؟.. لایەنگرانی سێستمی دیکتاتۆریی ئەم پرەنسیپە وەك بەڵگە بۆ پاساوهێنانەوەی سێستمی فەرمانڕەوایی ڕەهای ڕۆشنگەریی دەهێننەوە.

ئەفلاتۆن سەرباری وتەکەی: (ڕەزامەندیی یان ناڕەزایی ژێردەستەکان هیچ لەڕەوایەتی دەسڵات ناگۆڕێت) دەرکی بەوە کردوە کە مەسەلەکە لایەنێکی دیکەی هەیە، بۆیە جیاوازیکردوە لەنێوان دەسڵاتداریی ستەمکارو دەسڵاتداریی ڕۆشنگەر.[١٦١]

ئەوەشی ڕونکردوەتەوە کە پاشای ستەمکار بەزەبری هێز دەسڵات بەسەر گەلی ناڕەزادا دەسەپێنێت، کەچی پاشای ڕۆشنگەر یان سیاسەتمەداری ڕاستەقینە خاوەنی ئەندازەیەکی دانایی‌و مەعریفەی ئەوتۆیە کە بەهۆیەوە حوکمڕانییەکەی بکاتە جێگەی ڕەزامەندی گەلەکەی

## دووەم: سێستمەکانی فەرمانڕەوایی

ئەفلاتۆن کاتێك قسە لەسەر سێستمەکان کەمێك زیاتر لەو هەڵوێستە دوردەکەوێتەوە کە پێشتر لەکتێبی "کۆمار"دا تۆماری کردبون، لێرەدا پێویستە ڕەچاوی دوو هەقیقەتی بنەڕەتی بکەین"

---

161- king, J. Charles, and Mcgilvray, James, op. Cit p 38-39.

یەکەمیان: دەوڵەتی ئیدیاڵ بەتەواوی لەلیستی ئەو دەوڵەتانە سڕاوەتەوە کە بەدیهاتنیان مەحاڵ نییەو، دووەمیان: سێستمی دیموکراسی بەبەراورد لەگەڵ پێگەی لەکتێبی "کۆمار" پێگەیەکی فراوانتر لەکتێبی "سیاسەتمەدار "دا دەگرێت.

لەکتێبی"کۆمار"دا ئەفلاتۆن هەرگیز یان زۆر بەکەمی بایەخی بەپۆلێنکردنی دەوڵەتان داوە، دەوڵەتی نمونەیی لەلوتکەی هەرەمەکەدا داناوەو دەوڵەتە واقعیەکانیش بەدوای یەکتردا وەك بەشێك لەدوابەدوای یەکێکی کە هەریەك گەندەڵی دەوڵەتەکەی پێش خۆی هەڵدەوەشێنێتەوە، تیمۆکراسی بریتییە لەڕواڵەتی هەڵوەشاوەی دەوڵەتی ئیدیاڵی، ئۆلیگارشی دەرئەنجامی پوکانەوەی ڕژێمی تیمۆکراسییەو.. دیموکراسی زادەی هەڵوەشاندنەوەی حوکمڕانی کەمینەیە، وەك چۆن حوکمی زۆرداریی لەگەندەڵبونی حکومی دیموکراسی دێتەئاراوە، کەچی لە"سیاسەتمەدار"دا بەشێوەیەکی تۆکمەتر هەوڵی پۆلێنکردنی ڕژێمەکانی فەرمانڕەوایی دەدات و پۆلێنەکە بەمجۆرە پوختدەکرێتەوە،[١٦٢]:

### ١. دەوڵەتی نمونەیی:

کە فەرمانڕەوایەکی فەیلەسوف سەرۆکایەتی دەکات، جیاوازی لەلەگشت شێوە دەوڵەتە واقعییەکان ئەوەیە تیایدا فەرمانڕاوایی بۆ مەعریفەیەو بونی یاسا هیچ زەرورەتێکی نییە.

---

162– بڕوانە: سباین: سەرچاوەی پێشوو.. ل ٩٢

ئـــەم دەوڵەتـــە دەوڵـــەتێکی خواییـــەو بـــوونی لـــەم دنیـــادا مەحاڵـــە، بەواتایـــەکیتر دەوڵـــەتی تـــەواوی خـــاوەن مەعریفـــەو ئـــازاد لەگشت تەگەرەکانی یاساو لەسەروی هەموو پلانێکەوەیە.

## ٢. دەوڵەتی زەمەنی

بریتییـــە لەشـــەش جـــۆر پێوانـــە بـــۆ جیاکردنـــەوەیان لـــەروی پابەنـــدبون یـــان پابەندنـــەبون بەیاســـاکانەو دواجـــار ســـێ جـــۆر فـەرمانڕەوایی پابەنـدنی یاسـان و سـێ جـۆریش پێوەی پابەنـد نـین، ئەفلاتۆن ئەمە بەمجۆرە روندەکاتەوە[١٦٣]:

### أ. ئەو دەوڵەتانەی پابەندی یاساکانن

هێزی ئاراستەکەر تیایاندا ئەو مەعریفەیە کە بەیاسا گوزراشتی لێکراوەو نمونەکانی:

١. **پاشـــــــــایەتی**: حـوکمڕانی تـاکی پابەنـد، باشـترین جـۆری فەرمانڕەواییە.

٢. **ئەرســـــتۆکراتی**: حـوکمڕانی کەمینـەی پابەنـد بەیاسـاوە، لـەروی چاکییەوە لەپلەی دووەمدایە.

٣. **دیموکراسی دەستوریی**: حـوکمڕانی زۆرینـەی میـانڕەوی پابەنـد بەیاساوە، خراپترینـی جـۆری دەوڵـەتی یاسـاییو هاوکـات چـاکترینی دەوڵەتە نایاساییەکانە

---

163- Harmon, op, cit.. p 43-44.

- هەروەها: افلاطون: رجل الدولة: سەرچاوەی پێشوو.. ١١٥ .

### ب. ئەو دەوڵەتانەی پابەندی یاسا نابن

هێزی ئاراستەکەر تیایاندا زۆردارو ستەمکارەو پابەندی یاساکان نییەو نمونەکانی:

١. **زۆرداریی**: حکومڕانی تاکەکەسی ناپابەند بەیاساوە، خراپترین جۆری دەوڵەتە.

٢. **ئۆلیگارشی**: حکومڕانی کەمینەی ناپابەند بەیاساوە، بەپلەی دووەم دوای خراپترین جۆرەکانی دەوڵەت دێت.

٣. **دیموکراسی نادەستوریی**: حوکمڕانی زۆرینەی توندڕەوی زەوتکار، لەهەردوو سیستمی زۆرداریی‌و ئۆلیگارشی مەترسی کەمترە.

پۆلێنکردنی شێوازەکانی فەرمانڕەوایی دەکرێت بەم جۆرەش ڕێکبخرێت،[١٦٤]:

| ژ | کێ فەرمانڕەوایە | بەپێی یاسا | بەبێ یاسا |
| --- | --- | --- | --- |
| ١ | تاك | پاشایەتی | زۆرداریی |
| ٢ | کەمینە | ئەرستۆکراتی | ئۆلیگارشی |
| ٣ | زۆرینە | دیموکراسی دەستوریی (موعتەدیل) | دیموکراسی نادەستوریی حکومی پاشاگەردانی |

164- Hagopian, Mark. N., Regimes, Governments and Ideology, Acomparative introduction. To Political Science, Longman N.y., 1978.. p 44.

ئەم پلانی دابەشکردنەو[165].. ریزبەندیە پێشنیازکراوە گۆڕانکاری هەستپێکراو لەهەڵوێستەکانی "سیاسەتمەدار"ی ئەفلاتۆندا دەردەخات کە لێرەدا بەبەراورد لەگەڵ "کۆمار" زیاتر لەواقیعەوە نزیکدەبێتەوە، بەڵام بەو مانایە نا بەتەواوی بیریی نمونەیی ونکردبێت، بەڵکو ماوەتەوە هاوشان لەگەڵ بڕێکی واقعیانەی گەورەتر بۆ سیاسەتی کرداریی‌و پەسەندکردنێکی نویً بەو فەزیلەتەدا کە دەشێت لەدەوڵەتێکی تر بەچەشنی باشتردا هەبێت.

دیموکراسی وەك نمونەی حوکمڕانی لەئاستێکی زۆر نزمی لەپۆلێنکردنەدا پێبڕاوەو بەخراپترین دەوڵەتی یاسایی دانراوە، سەرباری ئەوەی، هاوکات" باشترین (کەم زەرەرترین )ی ناو دەوڵەتانی ناپابەندی یاسایە، بەڵام ئەم گۆڕانکارییە بەو مانایە نییە ئەفلاتۆن دیموکراسی بەسیستمێکی فازیلە بزانێت، بیروڕاکانی لەسەر مەسەلەی دەسڵات و توانای لەئەنجامدانی چاکە یان خراپە لەروانگەی پابەندبون بەیاسا یان پابەند نەبون پێوەی چڕدەکاتەوەو بەم پێیە فەرمانڕەوایی یاسایی تاکەکەس پێگەیەکی باشتری پێدەبڕێت، لەکاتێکدا حوکمڕانی تاکەکەسی ناپابەند بەیاساوە خراپترین چەشنی حوکمڕانی چاوەڕوانکراوە.

---

165– ئەم پۆلێنکردنە شەشییە، زۆرجار هاوتایە لەگەڵ ئەو پۆلێنکردنەی ئەرستۆ لەکتێبی (سیاسەت)دا ئاماژەی پێکردوە، لەراستیدا هیچ نییە جگە لەفەرمانڕەوایی تاک و فەرمانڕەوایی کەمینەو فەرمانڕەوایی زۆرینە لەوێنە چاک و خراپەکانیدا.. بڕوانە:

- Madonald, op., cit.. p 27.

بەهەرحاڵ، دیموکراسی بەهەردوو شێوازەکەی لەلایەن ئەفلاتۆنەوە بەباشتر لەسیستمەکانی زۆرداریی دانراوە کە لەکتێبی "کۆمار"دا لەسەروی دیموکراسییەوە داینابوو، ئەمەش دەلالەتەکەی دەگۆڕێت، . یادەوەری ئەفلاتۆن ئەو رۆژگارەی لەبیرە کە تیایدا دەوڵەتی دیموکراسی بووە بایسی ژیانی پەیامبەری مەعریفە.[166]

جێگەی ئاماژەیە، ئەفلاتۆن لەکتێبی "سیاسەتمەدار"دا هێشتا لەو بڕوادایە کە تاکەکەسەکان کامڵ نین و دیموکراسی ئەو کۆڵەکەیە کە دەستبەرداربونی نییەو بەبێ ئەو ناتوانرێت بەر لەو چاوچنۆکییە بگیردرێت کە بەهۆی حوکمڕانییەوە دێتەئاراوە، لایەنگری ئەفلاتۆن بۆ پرەنسیپی حوکمڕانی فەیلەسوفە داناکان، لەگەڵ ئەمانەشدا" لەکتێبی "سیاسەتمەدار"دا هەستی پێدەکرێت، ئەوەندە هەیە هەڵچونەکانی "کۆمار"ی کۆتکردوە، ئنجا ئەفلاتۆن زەمینەسازی بۆ ئەو میانڕەوییە دەکات کە بەئاشکرا لەکتێبی سێیەم "یاساکان" دەردەکەوێت.

166 - Barker, op., cit.. p 337.

## بەندی سێیەم

# ئەفلاتۆن _ یاساکان

# Laws

کتێبی "یاساکان"[167] بەرهەمی پیریی ئەفلاتۆنەو رەنگە بڵاوکراوەیەك بێت کە دوای مردنی لەلایەن یەکێك لەقوتابیەکانییەوە تەواوکرابێت، پێدەچێت بیرۆکەی ئەم کتێبە ساڵی (٣٦١ -پێش زایین) بەبیری ئەفلاتۆندا هاتبێت، کاتێك لەگەڵ شا دۆنسیۆس خەریکی دیراسەکردنی ئەو پێشەکییە گونجاوانە بوو کە پێویستە بەیاساکانەوە بلکێنرێن.

ئەگەر ئەفلاتۆن لەکتێبی "کۆمار"دا وێنەیەکی ئیدیاڵی کۆمەڵگای سیاسی پێشکەشکردبێن و لەکتێبی "سیاسەتمەدار"دا چەمکی فەرمانڕەوایی خستبێتەڕو بەوەی زانست و هونەرێکە ئامارە

---

167– لەدوانزە کتێب پێکهاتوە: چوار کتێبی یەکەمین لەجیاتی پێشەکییەو ئەفلاتۆن تیایدا چارەسەری چەندین بابەت دەکات کە دیارترینیان گەشەسەندنی دەوڵەتی مێژوکردو پرەنسیپە گشتییەکانی سیاسەت و چوار کتێبەکەی تر تەرخانکراوە بۆ تاوتوێکردنی دانانی دەستور.. بەجۆرێک باشترین شتێک بێت پاش دەستور کە ئەفلاتۆن بەکۆمار وەسفیکردوە، بەڵام سێ کتێبی دواتر (نۆ تا یانزەیەم) لیستێکی یاسایی لەخۆدەگرێت کە دەشێت لەهەندێک لایەنەوە بەگەوهەری (یاساکان) دابنرێت لەکاتێکدا کتێبی دوانزەیەک لەجێگەی کۆتاییدایە، بەجۆرێک ئەفلاتۆن سێستمی نوێی سیاسی هێناوەتە ئاراوە بەرێگەیەک کە تیایدا چەندین بیرۆکەی هێناوەتەوە کە پێشتر لەبیریدا نەبوون. راوێژی یاساکانی بەشێوەیەکی گشتی لەناوبەندەکەیدا بەهێزتر دەبێت و بەجۆرێک چوار بەشەکەی دوایین نەک هەر بەجوانترین بەشەکانی دادەنرێت، بەڵکو جوانترین نوسینەکانی ئەفلاتۆنە.. بڕوانە:

- Ibid., p 339.

بەسیاسەتی مرۆڤ و چاودێرییان دەکات، ئەزمونی لەگەڵ پێشکەوتنی تەمەنیدا لەکتێبی "یاساکان"دا ڕێنوێنی کردەوەو گەیاندویەتییە ئەو بڕوایە کە کۆمەڵگا سیاسیەکەی لەبری بەفەیلەسوفی فەرمانڕەوا پشت بەیاساکان ببەستن و بەبێ ئەوەی مەبەستی بێت بەتەواوی دەستبەرداری ئەو تیۆرانە بووە کە لەکتێبی "کۆمار"دا باسی کردبون، لەبەرئەوەی چەندینجار جەختی لەسەر ئەوە کردوەتەوە کە ئامانجی لە"یاساکان"دا وەسفکردنی دەوڵەتێکە کە دوای دەوڵەتی ئیدیاڵ دێت لەریزبەندیدا The Second best State ، واتە چاکەی دەوڵەتی یاساکانی بەسەر فەرمانڕەوایی فەیلسوفاندا داوە.[١٦٨]

کتێبی "یاساکان" بەهۆی جیاوازیی لەگەڵ کتێبی "کۆمار"دا روبەڕوی رەخنەی زۆر بوەتەوە، ئیتر جیاوازییەکە لەشێوازدا یان لەریزبەندی لۆژیکی بابەتەکان و ئاستی بیرۆکە باسکراوەکاندا بێت، . لەگەڵ ئەو رەخنانەشدا دەتوانین بڵێین" بەبەراورد لەگەڵ کتێبەکانی پێشوتری ئەفلاتۆن "یاساکان" زیاتر لەسەرچاوەیەکی پرشنگداری هزری بەهیزی تێدایە.[١٦٩]

سەرباری ئەوەی ئەفلاتۆن هەوڵیداوە بەشێوازێکی ئەوتۆ روبەروی راستییە واقعیەکان بێتەوە کە پێشتر پشتی پێنەبەستووە.[١٧٠]

---

168- Harmon, op, cit.. p 44.
169- Ibid.,

170- سباین: سەرچاوەی پێشوو.. ل ٨٣ .

بۆ ئەوەی وێنەیەکی تەواو رونمان لەبەرچاو بێت، گرنگترین بابەتەکانی کتێبی "یاساکان" دەخەینەڕو کە هاوشێوەی لەکتێبی "کۆمار"دا هەیە، لێرەوە دەوڵەتی نمونەیی "شاری یاساکان"و سێستەمەکانی خاوەنداریو خێزان و هاوسەرێتیو خوێندن، سەرباری دیاریکردنی شێوەکانی فەرمانڕەوایی دەبنە ئامانج.

## یەکەم: شاری یاساکان

ئەفلاتۆن لە"یاساکان"دا تەنیا بیرۆڕاکانی ناو "کۆمار"ەکەی راستنەکردوەتەوە، بەڵکو جارێکیتر شارەکەی لەسەر بنەمای نوێی جیاواز لەبنەماکانی شاری کۆمارەکەی رێکخستەوە.

لەم نوسراوەیدا "یاساکان" ئەفلاتۆن هەوڵینەداوە بنەما وێناکراوەکانی دەوڵەتی ئیدیالْ وەسف یان دابنێت، بەڵکو ئەمەی تێپەڕاندوەو وێنەیەکی سەبارەت بەو دەوڵەتە داوینەتێ کە دەشێت بەکردەوەو لەچوارچێوەی ژیانی واقعیدا دابمەزرێت.

ئەم دەوڵەتە "دەوڵەتی یاساکان" سەبارەت بەدەوڵەتی ئیدیالْ قەیرانێکە لێدەربازبونی نییە: مادامێکی شتیك نییە بەیاساکانیشەوە بگاتە ئاست و باڵایی فیکرو، کەسێکی خاوەن بەهرەی سروشتی نییە وەك سەردارێکی رەها بەبێ تێوەگلان بەهەواو ئارەزوەکان و لێکەوتەکانی لەتوندوتیژیو ستەمکاری دەسڵات بگرێتەدەست و لەبەرئەوەی ناتوانرێت کەسی سەرکەوتویی خاوەن بیرو هزری

**ڕۆشنگەر بدۆزرێتەوە، دەبا مەسەلەکە بۆ یاسا بەجێ بهێڵرێت، قایل بین بەو عەقڵەی یاسا دادەڕێژرێت" یاسای دەوڵەت.[171]**

**بەبەراورد لەگەڵ بیروڕاکانی کتێبی "کۆمار" گۆڕانکاری ئاشکرا لە"یاساکان"دا لەبیروڕاکانیدا تێبینی دەکەین و خەسڵەتە گشتییەکانی گۆڕانکاریەکەش دەکرێت لەم خاڵانەدا کورتبکرێنەوە:**

**١. ئەفلاتۆن گەیشتوتە ئەو باوەڕەی کە پێویستە بنچینەی کۆمەڵگەی سیاسی فراوان بکرێت و پاوان نەبێت بەسەر کۆمەڵێکی کەمی دیاریکراودا، داوایکردوە هاوڵاتیان بەشداری لەئیدارەکردنی کاروبارەکانی شاردا بکەن و هێندە زانست و زانیاری بدرێتێ کە بەهۆیەوە لەیاساکانی شارو بنەماکانی پیادەکردنی تێبگەن، لەکاتێکدا چینەکانی شار لە"کۆمار"دا بەسەر سێ چینی سەرەکیدا پۆلێندەکرێن: چینی خوارەوە کە چینی بەرهەرمهێنە بواری نادرێتێ بەشداری ژیانی سیاسی یان ئەو پرۆگرامە فێرکارییە بکات کە ئەفلاتۆن بۆ پاسەوانەکان بەپێویستی زانیوە کە بووەتە جێگەی پرسیار دەربارەی چارەسەری گونجاوی کێشەکە: ئایا نەوەکانی ئەم چینە لەخوێندنگای تایبەت بخوێنن یان بەشداری کۆرسی سەرەتایی فێربون بکەن و یان بەتەواوی لەفێربون بێبەش بکرێن.[172]**

**٢. ئەفلاتۆن سۆسیالزمی بەچاکترین سێستم دادەنێت، بەڵام لەگەڵ ئەمەشدا ئامانجێکی باڵاترە لەوەی بەدیبهێنرێت و بەم بۆنەوەو بەهۆی لاوازی مرۆڤەوە دەستبەرداری دەبێت و لەجێگەیدا بانگەشە**

---

171- الدکتور. مصطفی الباردوی: لمحات من الفکر السیاسی حول الفردو الدولة: سەرچاوەی پێشوو.. ل ٣٩-٤٠ .

172- بڕوانە: الدکتور. پروت بدوی: سەرچاوەی پێشوو.. ل ٦٢ .

بۆ دامەزراندنی خاوەنداریێتی تایبەت و دروستبونی خێزان دەكات.[173]

دوای ئەوەی ئەفلاتۆن لە"كۆمار"ەكەیدا چینی پاسەوانی لەگشت مافێكی خاوەنداریێتی بێبەشكرد، دەبینین لە"یاساكان"دا مافی خاوەنداریێتی سنوردارو ملكەچی سیستمێكی نوێی دەكات.[174]

لەگەڵ ئەوەی زەوییەكانی بەیەكسانی دابەشكردوەو مامەڵە پێوەكردن و پارچە پارچە كردنی قەدەغەكردوەو لەرێگەی میراتەوە بۆ نەوەكانی داهاتوو دەمێنێتەوە، خاوەنداریێتی پارەوپوڵیشی دیاریكردوە كە نابێت لەچوار ئەوەندەی نرخی پارچە زەویەكە زیاتر بێت، واتە تاكەكەس بۆی نییە لەچوار ئەوەندەی پشكی عەقارییەكەی زیاتر پارەی مەنقولەی هەبێت.

سەرباری ئەمەش هەڵگرتنی ئاڵتون و زیوو پارەی بیانی قەدەغەكردوە، مەگەر بۆ مامەڵەپێوەكردنی دەرەكیو بەرێگەپێدانی فەرمی، وەك چۆن قەرزی بەسووی قەدەغەكردوەو رێگری

---

173- Madonald, op., cit.. p 31.

هەروەها بڕوانە:

- Bowle, John, Western Political thought, An historical introduction form the origins to Roussrau, Jonathan Cape, London, 1947, p 59.

174- لە(كۆمار)دا بواری پێكەوەنەری سامان داوە لەئازادی تاكەكەسی بەهرەمەند بن، لەكاتێكدا بەچینی پاسەوانی رەوا نەبینیوە، دانی بەتاكگەرایی هاوڵاتی ناوە زیاتر لەوەی هاوبەشی (كۆمار) بواری داوە، مافی خاوەنداریێتی بۆ فەرمانڕەواكان بەڕەوا زانیوەو سەرباری ئەمەش پێشتر بانگەشەیەكی ئاشكرای كردوە لەپێناو پێگەیشتن و ئەو شتانەی بەدوایدا دێن لەكاریگەری لەسەر كۆمەڵگەو شارستانیەتەكەی.. بڕوانە: الدكتور. علی احمد عبدالقادر: سەرچاوەی پێشوو.. ل ١١٧-١١٨.

لەـ(هاوڵاتیـان) گرتـوە کـە نابێـت بازرگـانی بەمەبەسـتی دەسـکەوتنی قـازانج بکـەن وتایبـەتی کـردوە بەبێگانـەکان، هـەروەها ڕێگـەی بەکۆیلـەکان داوە فـەلاحی بکـەن.. مەبەسـتی سـەرەکی ئـەفلاتۆن لەهـەموو ئەمانـەدا ئەوەیـە هاوڵـاتی بەدوربگرێت لـەو شـتانەی لەرێگـە لایـدەدەن و لـەوەی سـامان بکاتـە ئامـانجی ژیـانی ((هـیچ شـتێك **لەهەوڵەکانی بۆ گەیشتن "بەعەقڵ و جەستەوە" بەپلەی نایاب خەریکی نەکەن. ئەم ئامانجە زیاد دەوڵەمەندی بەسەرسەخترین دوژمنی خۆی دەزانێت))**.

هـەروەها دوای ئـەوەی لـە"کۆمـار"ەکەیـدا بانگەشـەی هاوبەشـی ژنی دەکردو زەواجی وەك بنەرەتی کۆمەڵایـەتی دروست بـونی خێـزان پەسـەند نـەکرد، کەچـی لـە"یاسـاکان"دا مەسـەلەی زەواج زۆر بەتونـدوتۆڵی مەرجـدار دەکـات“ مەراسـیمی زەواج بـەبێ پرسـکردن بەدەوڵەت بەڕێوەناچێت و بنەمای دروستکردنی خێزان تـەنیا بریتییە لـەهێنانی یـەك ژن، نـەك فرەژنـی. لەگـەڵ سـزایەکی تونـدی ئەوانـەی گەشـتونەتە تەمـەنی سـیو پێـنج سـاڵی و ژنیـان نـەهێناوە، بـەڵام منداڵـەکان کـوڕی دەوڵـەتن و بایـەخ بەپـەروەردەو فێرکردنیـان دەدات، بەلەبەرچـاوگرتنی ئـەوەی فێربـون "لەشـاری یاسـاکان"دا گشـتییەو جیـاوازی لـەنێوان چـینەکاندا ناکـات. وەك چـۆن لـە"کۆمـار"دا ئـەو جیاوازییە پەیڕەودەکرا.[١٧٥]

٣. لـەکۆماردا بـەهرەی سروشـتیو ئامـادەیی شەخسـی بـەپێوەری سـەرەکی جیاکردنـەوەی هاوڵاتیـانی دادەنـاو دانـی بەجیاکردنـەوەی ڕەهـای نێـوان هـەردوو چـینی خـوارەوەو چـینی فـەرمانڕەواو جـەنگاوەرەکان دانـابوو، بـەجۆرێك ڕێگـەنادرێت ئەنـدامانی چـینی

175– بڕوانە: الدکتور. عبدالرحمن بدوی: افلاطون: سەرچاوەی پێشوو.. لا ٢٢٨-٢٢٩.

خوارەوە لەچینەکەی خۆیانەوە بگوازنەوە بۆ دوو چینەکەی تر، بەڵام لە"یاساکان"دا سەرمایە بنەمای پۆلێنکردنی چینایەتی‌یەو چوار چین لەئارادایە" چینی یەکەم: چینی خوارەوە" ئەو خەڵکانە دەگرێتەوە کە پارەیەکی تایبەتیان نییە زیاتربێت لەنرخی ئەو پارچە زەوییەکەیان، چینی دووەم: پارەی ئەندامەکانی لەپارەی پارچە زەوییەکە زیاترە، بەڵام ناگاتە دوو هێندەی نرخی زەوییەکە. لێرەدا لەبەرئەوەی بوارێك هەیە بۆ گواستنەوەی پارە لەدەستی کۆمەڵێکەوە بۆ کۆمەڵێکی ترو لەم رێگەشەوە گواستنەوە لەچینێکەوە بۆ چینێکی تر، ناکرێت سنوری رەها بۆ جیاکردنەوەی چینەکان دابنرێت، بەواتایەکیتر جیاکردنەوەی چینەکان لە"کۆمار"دا بەرێگەی بەمیرات لەنەوەیەکەوە بۆ نەوەیەکی تر دەمایەوە، لەکاتێکدا لەشاری "یاساکان"دا بەمیرات نەبووە.[١٧٦]

٤. لە"یاساکان"دا سەرباری ئەوەی وێنەی گشتی پرۆگرامی فێربون (کە فێربونی مۆسیقاو وەرزشی جەستەیی لەخۆدەگرێت) وەك پێشتر لە"کۆمار"کەیدا پەیرەوی لێدەکرا، چەندین گۆڕانکاری نوێی تێدا ئەنجامداوە، لەوانە:

بایەخێکی گەورە بەرێکخستنی پرۆسەی فێربون، بەتێڕوانین بۆ ئەوەی کە وەك دامەزراوەیەکی فێرکاریی لەکارکەوتوە، ئەفلاتۆن بەناچاری هەوڵیداوە سێستمی فێربون لەگەڵ سەرجەم سێستمەکانی تری حکومەت بگونجێنێت. ئەفلاتۆن دەیەوێت جۆرێك لەخوێندنگای گشتی رێکخراو دابهێنێت کە تیایدا مامۆستا بەکری" پرۆگرامێکی تێروتەسەلی تەواو دەڵێنەوە کە دوو قۆناغ لەخۆدەگرێت.

---

176- Harmon, op, cit.. p 48.

سەبارەت بەپەیوەندی ئەم سیستەمە بەدەوڵەتەوە، ئەفلاتۆن ئەو فەرمانبەرەی کاروبارەکانی خوێندنگاکان رایدەکات (وەزیری فێرکردن) دەکاتە سەرۆکی گشت فەرمانبەرەکان.. تیۆری فێرکردن لە"یاساکان" بەم پێیە بەپێچەوانەی سیستمی فێربون لە"کۆمار"ەدا بریتییە لەتیۆری سیستمێکی تایبەت بەپەیمانگاکانی فێربون.[177]

لەکۆتایدا پێویستە بوترێت (شاری یاساکان) پێنج هەزارو چل هاوڵاتی لەخۆدەگرێت،[178] و پێویستە لەکەنار دەریاوە دوربێت، چونکە پێگەی دەریایی دەوڵەت گەندەڵدەکات، ئەفلاتۆن لەو بڕوادایە

---

177- بڕوانە: سباین: سەرچاوەی پێشوو.. ل ١٠٠ .

178- ئەم ژمارەیە لەخۆوەو بەشێوەیەکی رەمەکی دیاری نەکراوەو ئاستی کاریگەریی فیساگۆرس لەسەر بیری ئەفلاتۆن دەردەخات" ژمارەی (٥٠٤٠) ئەنجامی لێکدانی ئەم ژمارانەیە..

٥٠٤٠ =٧×٦×٥×٤×٣×٢×١

هەروەها: ٥٠٤٠ =١٠×٩×٨×٧

ئەم ژمارەیەکە بەسەر هەر ژمارەیەکدا تەنانەت ژمارە (١٠)یشدا دابەش دەبێت و بەڵکو تەنانەت بەسەر ژمارە (١٢)یشداو بەمشێوە ئەم ژمارەیە لەکاتی شەڕدا وەک بنچینە بۆ بەشەکانی جەنگ سودی لێوەردەگیرێت، لەکاتی ئاشتیدا بەهەمانشێوە سودی لێوەردەگیرێت بۆ خەمڵاندنی باج و دابەشکردنی زەویی یان هەر موڵکێکی گشتی بەسەر هاوڵاتیاندا.

ئاشکرایە دابەشکراوە سەرەکی کە ئەفلاتۆن دیایکردوە بریتییە لەژمارە (١٢) هەر بۆیە ئەو سیستەمەی ئەو دەیخوازێت بەسیستمی دوانزەیی ناسراوە، ئەم سیستەمە بوار بۆ حکومەت دەڕخسێنێت کە دوانزە هۆز لەخۆبگرێت و هەروەها ئەنجومەنی دەوڵەت لەدوانزە لیژنە پێکبێت و هەر لیژنەیەک لەساڵەکەدا ماوەی یەک مانگ حکومڕانی لەئەستۆ بگرێت و لەچوارچێوەی کاروبارە مەدەنییەکاندا ئەم سیستەمە وەک بنچینەیەک بۆ کارکردن و ژماردنی کێشەکان و پێوانەکان بەکاردێت، بەجۆرێک لەگەڵ یەکترو لەگەڵ بونی سیاسەتی دەوڵەتدا کۆک و گونجاو بێت.. بڕوانە ئەم سەرەچاوانە:

- Ibid., p 45.
- Barkar, op., cit.. p 368.

شتێکی جوانە وڵات بەسەر دەریاوە بێت و هەمیشە چێژی لێوەردەگرێت، بەڵام لەراستیدا دەریا تاڵی چەشەو بەئەندازەیەکی گەورە ماڵوێرانی بۆ دەوڵەت دەهێنێت، بەهۆی دەریاوە وڵات پڕدەبێت لەکەرەستەی بازرگانیو هاوڵاتیان بەپەیداکردنی پارەو مامەڵەکردنەوە خەریکدەکات و مێشکیان پڕدەکا لەروپاماییو ناپاکی، ئەمانە دەبنە هۆی ئەوەی دەوڵەت لەدڵسۆزییو هاوڕێیەتی لەژیانی ناوخۆو لەمامەڵکردن لەگەڵ ئەوانیتردا لەدەستبدات.

کۆمەڵگەی ئەم دەوڵەتە، بەگوێرەی ئەوانەی خرانەڕوو، پێویستە کشتوکاڵی بێت و پشت بەخۆی ببەستێت، کشتوکاڵ پێچەوانەی بازرگانی، مەگەر زۆر بەئەستەم ئەگینا ئەو سامانە گەورەی لێبەرهەم نایەت هەزرو وزەی هاوڵاتیان لەکاروبارە شارستانییەکان دوربخاتەوە، ئەفلاتۆن دەرکی بەوە کردوە کە نابێت هاوڵاتیان ئەوەندە هەژارو بێدەرەتان بن بەمەبەستی دابینکردنی بژێوی زۆربەی کات خەریکی پاسەوانی بن و ئەوەندەش دەوڵەمەندبن تەنیا بیر لەپارە بکەنەوە.[179]

بەمەبەستی هاتنەکایەی ئەم بارودۆخە ئەفلاتۆن زەوی پێشنیازکراوی شارەکەی بەیەکسانی دابەشدەکات، واتە زەوییەکە بەسەر پێنج هەزارو چل پارچەی یەکساندا دابەشدەکات کە بەهیچ شێوەیەك مامەڵە یان پارچە پارچە ناکرێت و تەنیا لەرێگەی میراتەوە لەیەکێکەوە بۆ یەکێکیتر دەگوازرێتەوە، وەك چۆن خاوەنداریێتی پارەوپولیشی دیاریکردوە کە نابێت لەچوار ئەوەندەی نرخی زەوییە

---

179- Harmon, op, cit.. p 450.

هەروەها بڕوانە:

- Bowle, John, op., cit.. p 56.

دابەشکراوە زیاتر بێت، ئەم دیاریکردنە ئەگەرچی مەبەست لێی نەهێشتنی جیاوازییە لەنێوان سامانەکاندا، لەگەڵ ئەوەشدا ئەفلاتۆن دانی بەبوونی ئەم جیاوازییەدا ناوە کاتێك بەگوێرەی دیاریکردنی کەمترین بڕە پارەی هەریەکەیان، هاوڵاتیانی شارەکەی بەسەر چوار چیندا دابەشکردوە.

بەمجۆرە ئەو دەوڵەتەی ئەفلاتۆن لەکتێبی "یاساکان" پێشنیازی دەکات، بایەخدانی لەکاروبارەکانی ناوخۆدا چڕدەکاتەوەو خۆی لەبازرگانی بەدوردەگرێت و لەجێگەیدا کۆمەڵگەیەکی کشتوکاڵ بێتەئاراوە کە بەشی پێداویستییەکانی خۆی بەرهەمی هەبێت و، لەدابڕاوییەکی ڕێژەییدا بژی، ئەگەر تەواو دابڕاو نەبێت (وەك سپارتە) کە یارمەتیدەری بووە لەپاراستنی ماکە ڕەسەنەکەی بەبێ هیچ خەوشێك.[180]

دووەم: **سێستمەکانی فەرمانڕەوایی لەشاری یاساکاندا**

ئەفلاتۆن لەکتێبی "یاساکان"دا چارەسەری سێستمەکانی فەرمانڕەوایی‌و شێوازەکانی کردوەو دەستورێکی بۆ شارەکەی دارشتوە کە بیرۆکەی سێستمی تێکەڵ وەردەگرێت.

سێستمی تێکەڵ ئەو سێستمەیە کە ڕەگەزو پرەنسیپی جیاوازی وەرگیراو لەدامەزراوەو ئاراستە جیاوازەکان لەخۆدەگرێت، بەجۆرێك هاوسەنگی‌و یەکگرتویی لەنێوانیان هێزە دژەکاندا دێنێتە ئاراوەو هەریەکەیان دەکاتە سەمامی ئەویتر، ئەم بیرۆکە بەو بنەڕەتە

180- Barker, op., cit.. p 367.

دادەنرێت کە دواتر پرەنسیپی جیاکردنەوەی دەسڵاتەکانی لەسەر دامەزراوە.

ئەفلاتۆن سیستمە تێکەڵەکەی لەسەر بنەمای یەکخستنی رەگەزەکانی سیستمی پاشایەتیو رەگەزەکانی سیستمی دیموکراسی دارشتووە، بەو پێیەی دوو سیستمی فەرمانڕەوایی دژبەیەکن (لەسەر بنەمای دژ بەیەکتر دامەزراون): سیستمی پاشایەتی لەسەر پرەنسیپی دەسڵات (دانایی) و سیستمی دیموکراسی لەسەر پرەنسیپی ئازادیی دروست بووە، ئەگەر بتوانرێت رەگەزەکانی هەردوو سیستمەکە لەچوارچێوەی یەك سیستمەدا کۆبکرێتەوە، واتە ئەگەر دانایی بۆ فەرمانڕەواو ئازادیی بۆ ژێردەستە فەراهەم بوو، برایەتی دێتەئاراوەو دواجار ئەو سەقامگیرییەی لێدەکەوێتەوە کە خوازیاری بووە.

بەمشێوە دەبینین ئەفلاتۆن لەبری ئەوەی فەرمانڕەوایان بکاتە فەیلەسوف وگەل پەراوێز بکات یان بەئەنقەست پشتگوێی بخات، هەوڵدەدا هاوشێوەی سیاسەتمەدارە کردارییەکان (وەك چۆن زۆربەی کاتەکان هەوڵیان بۆ داوە) گونجانێك لەنێوان پاشایەتیو مەسەلەی فەرمانڕەوای گەل بێنێتە ئاراوە.[181]

رێگەی گەیشتن بەو بەهەماهەنگیو گونجاوییە خۆی لەزیادکردنی ئازادی لەسیستمی پاشایەتی یان چەسپاندنی زیاتری دەسڵات لەسیستمی دیموکراسیدا دەبینێتەوە، بەواتایەکیتر نابێت زیادەڕەوی لەپرەنسیپی ئازادیی یان پرەنسیپی دەسڵاتدا بکرێت، بەڵکو پێویستە هاوسەنگییەك لەنێوانیاندا هەبێت، مێژوی راستی

---

181- Ibid., p 384.

ئەم بیرۆکەی دوپاتکردوەتەوە، روخانی دەوڵات ئاکامی قۆرخکردنی دەسڵات و بەکۆیلەکردنی تاکەکەسەکان بووە لەلایەن پاشاکانەوە تاوەکو لێیان هەڵگەڕاونەتەوە (تاکەکەسەکان)و بەشوێن هەلی دەربازبوندا گەڕاون (وەك چۆن لەدەوڵەتی فارسیدا رویدا) یان ئاکامی زیادەڕەویی تاکەکەسەکان بووە لەئازادیدا بەئەندازەیەك گەیشتوەتە ئاستی سوکایەتی بەدەسڵات و گاڵتەکردن بەیاساکان (وەك چۆن لەدەوڵەتی ئەتینا رویدا).[182]

بۆیە ئەفلاتۆن بەئاراستەی شێوازی کۆکردنەوەی خەسڵەتەکانی" خاوەنداریێتی لەرێزگرتنی دەسڵات و پشتیوانی لێکردنیو خەسڵەتەکانی سێستمی دیموکراسی لەپیرۆزراگرتنی سەربەخۆییو پارێزگاری لێکردنیدا لەیەك دەستوردا، هەنگاو هەڵدەگرێت، سێستمێکی پێشکەش کردوین کە تێکەڵەیە لەهەردوو" سێستمی دیموکراسیو سێستمی ئەرستۆکراتی کە دەشێت ناوی سێستمی ئەرستۆکراتی/ دیموکراسی یان سێستمی شاری یاساکانی لێبنرێت.

پەسەندکردنی پرەنسیپی دیموکراسی ئەگەرچی لەسنورێکی دیاریکراویشدا بێت و داننانی بەوەی کە رەزامەندی جەماوەر هاوشان لەگەڵ فەراهەمبونی مەعریفە لەفەرمانڕەوادا دوو بنەمای فەرمانڕەوایین بەقۆناغێکی نویٚ دادەنرێت لەگەشەسەندنی بیری ئەفلاتۆندا، چیتر بەلایەنگری فەرمانرەوایی رەها نەمایەوە وەك چۆن لەکاتی نوسینی کتێبی "کۆمار"دا وابووە، بەهیچ شێوەیەك قسەی لەسەر مەسەلەی رەزامەندی گەل نەکردوەو تەنانەت لەکتێبی

---

182– بڕوانە: الدكتور. ثروت بدوی: سەرچاوەی پێشوو.. لا ٦٧ .

"سیاسەتمەدار"یشدا ئاوڕی لێنەداوەتەوەو پێداگری لەسەر ئەوە دەکردەوە: مەسەلەی وەرگرتنی رەزامەندیی گەل وەك مەسەلەی سەروەری یاسا وایە، رێگرێکی بێکەڵکە لەبەردەم ئازادی سیاسەتمەداردا، بەڵام لە"یاساکان"دا بایەخێکی زۆر بەمەسەلەی ئازادیی فەرمانڕەوا لەرایکردنی کارەکانیدا نادات، بایەخێکی گەورەتر ئاراستەی ئازادیی ژێردەستەکان لەژیانی رۆژانەیاندا دەکاتەوە.[183]

**لەسێستمی شاری یاساکاندا سێ دامەزراوەی سەرەکی کاردەکەن" ئەوانیش بریتین لە[184]:**

## یەکەم: کۆنگرەی گشتی

ئەم کۆنگرەیە جێگەی ئەنجومەنی یاسادانی ئێستا دەگرێتەوەو لەم ئەنجومەدا هەر چوار چینەکەی کۆمەڵگا بەشداریی دەکەن و ئامادەبونی دوو چینە دەوڵەمەندەکە لەکۆبونەوەکانی ئەم کۆنگرەیەدا تەوزیمییەو بەرامبەر ئامادە نەبونیان غەرامەدەکرێن.

## دووەم: ئەنجومەن

جێگەی دەسڵاتی جێبەجێکردنی ئێستای گرتوەتەوە، ژمارەی ئەندامەکانی سێ سەدو شەست ئەندامەو لەهەر چینێك نەوەد کەس ئامادەی کۆبونەوەکانی دەبن و بەم شێوازە هەڵدەبژێردرێن: هەر

---

183- Ibid.,

184- سەبارەت بەم دەستانە بڕوانە: هەمان سەرچاوەی پێشوو.. ل ٦٧ .

هەروەها بڕوانە:

- Madonald, op., cit.. p 31.

چینێك سەدو هەشتا كەس كاندید دەكات و لەناویاندا نەوەد كەس بەرێگەی ناوڕاكێشان هەڵدەبژێردرێن.[185]

ئەنجومەنەكە بەسەر دوانزە بەش یان لیژنەدا دابەشدەبێت و مانگانە بەدوای یەكتردا كارەكانی ئەنجومەن رادەپەڕێنن: پێشوازیكردن لەهاوڵاتیان میوانی بیانی، فەرمان بەسازدانی كۆبونەوە ئاساییەكانی ئەنجومەنەكە دەكات جا ئەم كۆبونەوانە بۆ هەڵبژاردن بن یان تاوتوێكردنی كێشە جیاوازەكان و یان بەمەبەستی گۆڕینی یاساكان.

## سێیەم: دادوەر یان فەرمانڕەوا

دادوەرو فەرمانڕەواكان چەندین دەستەیان هەیە: دەستەی پاسەوانی یاساكان كە لەسیو حەوت ئەندام پێكهاتوەو بەرێگەی هەڵبژاردن و بەسێ قۆناغ لەكۆنگرەی گشتیدا دیاریدەكرێن" لەقۆناغی یەكەمدا سێ سەد كەس و لەقۆناغی دووەمدا سەد كەس و لەقۆناغی سێیەم و كۆتاییدا سیو حەوت كەس هەڵدەبژێردرێن، ئەم دەستەی پاسەوانە ئەركی پارێزگاریكردن لەسەلامەتی جێبەجێكردنی یاساو خشتەكانی هەڵبژاردنی لەئەستۆدایە.

---

185- دیاریكردنی نوێنەران بەم رێگەیە ناوبەندییەك لەنیوان دەستوری پاشایەتیو دەستوری دیموكراسییدا دروستدەكات و لەنیوان ئەم دوو دەستورەدا دەستورەكەمان هەمیشەیی دەبێت، گونجاو نابێت لەگەڵ كۆیلە سەردارەكان و خراپە فازیلەكان -ئەگەر پۆستی یەكسانیش بەدەست بهێنن- ئەوا بەیەكسانكردنی شتە نایەكسانەكان، ئەنجامی نایەكسان بەدەست دێت، تەنیا ئەو كاتانە نەبێت كە رێوشوێنی پێویست گیرابێتەبەر.. بڕوانە: الدكتور. علی احمد عبدالقادر: سەرچاوەی پێشوو.. ل ١٢٤ .

ئەنجومەنێکی تریش هەیە کە لەگەورەترین دوانزە ئەندامی ئەنجومەنی "پاسەوانەکان" پێکهاتوەو ئەرکی پارێزگاریکردنە لەدەستورو یاسا بنەڕەتیەکانی شار، بەڵام ئەو دادوەرانەی کە ئەرکی جیاکردنەوەی چارەسەرکردنی مەسەلەی تاوانکاریی‌و مەدەنییەکانیان لەئەستۆدایە بەرێگەی ناوڕاکێشان هەڵدەبژێردرێن.

لەمەوە بۆمان دەردەکەوێت" سیستمی پێشنیازکراو هەردوو سیستمی دیموکراسی‌و سیستمی ئەرستۆکراتی کۆکردوەتەوە، لەم سیستمەدا ئەگەرچی پرەنسیپەکانی یەکسانی‌و ئازادیی سیاسی لەسیستمی دیموکراسی وەرگرتوە، لەگەڵ ئەوەشدا هەوڵی کەمکردنەوەی کاریگەریەکانی داوە کاتێك پەنای بردوەتە بەر هەندێك لەسیستمە ئەرستۆکراتییەکان: هەڵبژاردنی کردوەتە هۆیەك بۆ دیاریکردنی فەرمانڕەوا، کە بەهۆیەکی ئەرستۆکراتیانە دادەنرێت لەبەرئەوەی یەکسانییەکی تەندروست بەدیناهێنێت، بەڵکو دیاریکردن لەرێگەی ناوڕاکێشانەوە لەتێڕوانینی گریکە کۆنەکاندا هۆیەکی دیموکراسییانە بووە.

لەلایەکی دیکەوە ئامادەبونی کۆنگرەی گشتی تەنیا لەسەر دوو چینە دەوڵەمەندەکە پێویستکردوە، بەڵام ئەو دوو چینەکەی تر پابەندنین بەئامادەبونی دانیشتنەکانی کۆنگرەو قسەکردن لەمەڕ کاروبارەکانی شار، سەرەڕای ئەمەش کورسیەکانی ناو کۆنگرەی گشتی بەیەکسانی لەنێوان چوار چینەکەی کۆمەڵدا دابەشکردوە، ئەمە لەکاتێکدایە لەروی ژمارەوە چینەکانی خوارەوە زۆر لەچینە دەوڵەمەندەکان زیاترن.

لەکۆتایدا، مەرجێکی بۆ دادوەر یان فەرمانڕەواکان داناوە کە نابێت تەمەنیان لەخوار پەنجا ساڵەوە بێت و بۆ ماوەی بیست ساڵ هەڵدەبژێردرێن،[١٨٦] و بەمەش ئەفلاتۆن بەربەست دادەنێ لەبەردەم کاریگەری گەنجەکان و هەوڵەکانیان لەپێناو نوێگەریدا.

ئەگەر لەکۆتایدا، بە بەراوردکردنی پێگەی فەلسەفەی سیاسی ئەفلاتۆن لەهەریەك لەکتێبەکانی "کۆمار"و "یاساکان"دا بەئاشکرا ئەوەمان دەردەکەوێت، بەئەندازەی ئەو بێبایەخکردنەی ئەفلاتۆن لە"کۆمار"دا کاری لەسەر کردوە لەفەلسەفەی دواتریدا " یاساکان" هەوڵدەدات یاسا بگەڕێنێتەوە جێگەکەی خۆی لەدەوڵەتدا، هەرچەندە ئەم هەوڵدانە لەئاستێکی نزمدا بووەو حەماسەت و یەکلاکردنەوەی تێدا نەبووە.

ئەمەش لەمیانەی هەوڵەکانی ئەفلاتۆن بۆ گونجاندن و پێکبەستی لەنێوان بیروڕاکانی پێشترو بیروڕاکانی دواتریدادا دەردەکەوێت، کاتێك دوا وێنەی دەوڵەت بەدەوڵەتی دوای دەوڵەتی فازیلە وەسفدەکات.

ئەم پێداچونە وای لەئەفلاتۆن دەخواست کە تیۆرێکی نوێ مەعریفە دابڕێژێت تاکو بواری پێویست لەبەردەم ئەزمون و

---

186– بارگر دەربارەی ئەمە دەڵێت: تەنیا لێکچونێک ئامادەگی هەبێت ئەو ماوەیە ئەفلاتۆن پارێزەرانی یاسا لەپۆستەکانیاندا دەمێننەوە کە ماوەی بیست ساڵە هاوشێوەیە لەگەڵ ئەنجومەنی جێبەجێکردنی فیدرالی سویسرادا کە ئەندامەکانی بەناو لەپۆستەکانیاندا لەماوەی خولی پەرلەماندا دەمێننەوە، ئەوەندە هەیە بەشێوەیەکی بەردەوام هەڵدەبژێرێنەوە، هەندێکجار لەو پۆستانەدا بۆ ماوەی نزیکەی بیست ساڵ دەمێننەوە.. بڕوانە:

- Barkar, op., cit.. p 392.

نەریتەکانـــدا بهێڵێتـــەوە، لەگـــەڵ ئەمەشـــدا دیراســـەکردنی دەوڵـــەت لە"یاساکان"دا بووە هۆی ئەوەی پێداچونەوەی داواکراو بێتەئاراوە، ئـەفلاتۆن لـەکتێبی نـاوبراودا پـەنای بردوەتەبـەر توێژینـەوەی وردیـی سێسـتم و یاسـا واقعییـەکان و رایسـپاردوین بـە(مێـژوو)ەوە گرێیـان بـدەین، وەك چۆن پرەنسیپی هاوسـەنگی، بـەو پێیـەی هۆیـەکی چـاکە لەدامەزراندنی دەوڵەتی دەستوریی‌دا وروژاندوەو، بە بەراورد لـەنێوان دەوڵـەتی نمونـەیی "کۆمـار"و دەوڵـەتی واقعیـی"یاسـاکان"دا دەبینین دووەمیـــان شـــاڵاوێکی راســـتەقینەی بـــەڕوی چارەســـەری کێشـــەی دەوڵـــەتی شـــاردا بـــەرپاکردوە، کـــە بریتییـــە لەکێشـــەی گونجانـــدنی بەرژەوەنـدی خـاوەن موڵـك و ئـەو بەرژەوەندیـە کـە ئـاپۆڕەی گـەورەی جەماوەر گوزارشتی لێدەکات.[187]

لەمیانـەی گشـت ئـەم خاڵـە زۆرانـەوە کـە ئـەفلاتۆن لـە"یاسـاکان"و تـا ئەندازەیـەك لـە"کۆمـار"دا وروژاندویـەتی، ئەرسـتۆ ئـەو سـەرەتا هزریانـــەی دەســـتپێکردوە کـــە دواتـــر تیـــۆرە تایبەتـــەکانی لـــەبارەی دەوڵەت و کۆمەڵ، لەسەر دارشتووە.

187– بڕوانە: سباین: سەرچاوەی پێشوو.. لا ١٠٧-١٠٨ .

# بەشی سێیەم

## Aristotle - ئەرستۆ

ئەرستۆ[188] بەباوکی زانستی سیاسیو یەکەمین مامۆستای دادەنرێت، سەرۆکی قوتابخانەی مشائی‌یە لەمێژوی فەلسەفەداو،

---

188- ئەرستۆ ساڵی(٣٨٤ پێش زایین) لەستاجیری(stagiry) لەکارمەندانی تەراکیا لەداکبووەو هەر بۆیە بەستاجیری (The stagirite) ناسراوە، باوکی ئەرستۆ پزیشکی تایبەتی (میتناسی دووەم) پاشای مەکدۆنیاو باوکی ئەسکەندەر بووە، پێدەچێت ئەمەش کاریگەرییەکی گەورەی هەبوبێت لەسەر پێگەیشتنی ئەرستۆ کە هەر لەمنداڵییەوە ئارەزوی زانستە سروشتییەکانی دەکردو بەمەش فەلسەفەکەی لێوان لێوە لەچواندن و بەڵگەهێنانەوەی بایۆلۆژیانەو هاوشێوەکانی.. وەک چۆن ژیانی لەنزیک کۆشکەکان ماکێکی تایبەتی پێبەخشی کە لەوانەیە دواتر رەنگدانەوەی لەسەر کارەکانی بەجێ هێشتبێت، ئەرستۆ ساڵی (٣٦٧ پێش زایین) پەیوەندیکرد بەئەکادیمیاکەی ئەفلاتۆنەوە لەئەتیناو تا مردن لێی مایەوە، ئنجا لەدەرچونێکدا کە ماوەی دوانزە ساڵی خایاند ئەتینای بەجێهێشت وەک مامۆستای ئەسکەندەری مەکەدۆنی کاری دەکرد، تا ساڵی (٣٣٥ پێش زایین) گەڕایەوە بۆ ئەتیناو ئەکادیمیا بەناوبانگەکەی لیکۆم (Lyceum)ی دامەزراندو تیایدا نزیکەی دوانزە ساڵ مایەو ەو لەم ماوەدا زۆرترینی نوسراوەکانی ئەوانەی کە بەردەست کەوتون دایناون.. دور نییە سەرکەوتنی ئەرستۆ لەژیانی هاوسەرێتیدا لەگەڵ کچێکی هەڵگیراوەی شۆڕشگێڕ هێرمیاس (Hermias) کاریگەری هەبوبێت لەسەر وێناکردنی خێزان بەلای ئەرستۆە وەک یەکەیەکی پێکهێنەری کۆمەڵگەو هەروەها لەرەخنەکردنی هاوبەشی ژنان و منداڵان لەلای ئەفلاتۆن، ئەگەر ئەمە – سەربارى ئەوەی کە بیانی بووە- رۆڵی گێڕاوە لەپێشوازی لێکردنی لەلایەن ناوەندە کۆمەڵاتییەکانی ئەتیناوە، ئەرستۆ پێچەوانەی ئەفلاتۆن و ئەکزینفۆن بەشداریی لەژیانی سیاسی ئەتینادا نەکردوە کە بەهۆیەوە دورەپەرێز بووە لەتێکەڵبونی تەنگوچەڵەمە سیاسییەکان و گشت ئەو کاردانەوە "چاک و خراپانە" لەلای نوسەر دروست دەبن، بەپێچەوانەوە ئەرستۆ زیاتر لەئەتینادا وەک میوانێکی تەماشاکەر وابووە کە بەهێمنی چاودێری روداوەکان و راڤە بۆ دیاردەکانی دەوربەر دەکات، ئەرستۆ دوابەدوای مردنی ئەسکەندەری

لەکۆتایی ئەو ماوەدا دەرکەوتوە کە بەڕەسەنایەتی لەمێژوی بیری یۆناندا دەناسرێت، هەزار ساڵ بەسەر مردنیدا تێپەڕی‌و فەیلەسوفێك لەدایك نەبوو شان لەشانی ئەو بدات و لەقۆناغەکانی دواتردا دەسەڵاتی فەلسەفی ئەرستۆ گەیشتە ئاستێك بەرامبەر لەگەڵ دەسڵاتی کلێسا بوەستێتەوە.

ئەرستۆ بۆ ماوەی بیست ساڵ قوتابی بەردەستی ئەفلاتۆن بووە، لەو دەمانەی ئەفلاتۆن گەیشتبووە قۆناغی کاملبون کە وایکرد لەماموستاکەی زیاتر قوڵ بێتەوەو کرداریی بێت و لەزۆر بواردا پێشی کەوتوەو رەخنەی لەچەندین لایەنی بیریی ئەفلاتۆنی گرتوە.

ئەگەر ئەفلاتۆن لەبیرکردنەوەیدا بەگشتی‌و لەبیری سیاسیدا بەتایبەت، میتۆدی ئیدیالی پەیڕەو کردبێت، ئەوا بیرکردنەوەی ئەرستۆ واقیعییەت بەسەر بیرکردنەوەیدا زاڵە، هەوڵیداوە لەرێگەیەوە میتۆدێکی توێژینەوەیی‌و مێژویی بەمەبەستی داڕشتنی تیۆرەکانی لەبارەی سیاسەت و کۆمەڵەوە بەکاربهێنێت.[١٨٩]

---

مەکەدۆنی‌و پاش ئەوەی بەدەرچون لەنایین تۆمەتبارکرا ساڵی (٣٢٣ پێش زایین) ئەتینای بەجێهێشت و هەڵات، پاش یەک ساڵ لەم مێژووە کۆچی دوایکرد.. بڕوانە: الدکتور. علی عبدالقادر: سەرچاوەی پێشوو.. ل ١٢٩-١٣٠ . هەروەها: برتراند راسل: سەرچاوەی پێشوو.. ل ٢٥٨ و ل ٢٦٠ .

189– بەڵام ئەمە بەواتای ئەوە نییە کە ئەرستۆ دان بەیاسای سروشتی‌و میسالییەتی ئەخلاقیدا نانێت و هەروەها بەوەی کە ئەم دووانە لەسەروی واقیعەوەن، هەرگیز شتی وا نەبوە، بەڵکو ئەرستۆ لەگەڵ باوەڕبونی بەمیسالییەت" دوو جۆر لەمیسالییەت جیادەکاتەوە: میسالییەتی خەیاڵی رەها و میسالییەتی رێژەکی کە بواری بەدیهاتنی هەیەو بانگەشە بۆ بڕواهێنان بەمیسالییەتی ناکامڵ دەکات، بەڵام چانسی بەدیهاتنی لەجیهانی واقیعدا هەبێت لەبری گەڕان بەدوای کاملییەکی رەهادا کە هەرگیز نایەتەدی.. بڕوانە: الدکتور. ثروت بدوی: سەرچاوەی پێشوو.. ل ٧٣ .

کتێبەکانی ئەرستۆ سێ ڕەنگدانەوەی گرنگیان هەیە: ئەو دیاردەی پەرتەوازەییە لەو ڕۆژگارەدا لەدەوڵەتی شاردا دەیبینی، لەگەڵ ئەوەی ئەتینا لەو کاتەدا هەندێك لەپێگەو ناوبانگی وەك سەنتەرێکی پەرشبونەوەی ڕۆشنبیریی‌و شارستانی‌و ئەوەی بەتایبەت لەئەتیناو شارەکانی گریك بەگشتی باو بووە، لەتێڕاونینی جیاوازی دەربارەی تایبەتمەندێتی گریك جیا لەگەلانی تر، ئنجا کاریگەری مامۆستاکەی، ئیتر ئەو کاریگەرییە بەسەلبی بێت یان بەئیجابی.

ئەوەی کتێبەکانی ئەرستۆ (کە چوارسەد دانراو تێدەپەڕێنێت) جیادەکاتەوە خەسڵەتێکی ڕەخنەگرانەی خاڵی لەهیچ جۆرە کاریگەرییەکی حەماسەت و سەرجەم بابەتەکانی: سیاسەت و لۆژیك و مێژوی سروشتی‌و سروشت لەخۆدەگرێت، تەنانەت وتراوە: ئەرستۆ خاوەنی هەموو زانستێکە.. هەرچەندە هەموو ئەمانە ڕێگرنین لەبەردەم ئەوەی هەردوو کتێبی "دەستورەکان"و "سیاسەت"ەکەی بەباشترین بەرهەمە سیاسیەکانی ئەرستۆ بزانرێت.[190]

---

190– کتێبی دەستورەکان بەرهەمی دیراسەیەکی توێژینەوەیی‌و بەراوردکارییە سەبارەت بەنزیکەی (١٥٨) دەستور لەدەستوری شارەکانی گریك، تیادا ئەرستۆ چارەسەری حکومەتی چەوسێنەرو دەستورەکانی بەربەرو چاوچنۆکییە هەرێمییەکانی دەوڵەت، ئەم کتێبە فەوتاوەو بێجگە لەچەند بەشێکی کەمی هیچی بەدەست ئێمە نەگەیشتوەو ئەوەشی ماوەتەوە تایبەتە بەدەستورەکانی ئەتینا.
بەڵام کتێبی (سیاسەت) کە هەشت دەروازە لەخۆدەگرێت" هەر دەروازەیەك بەسەر سێ بەشدا دابەشکراوەو هەر بەشەو بابەتی لێکچوی تێدایە ئەگەرچی تێڕوانین و میتۆدەکانی لێکۆڵینەوە لەو بابەتانە جیاوازیش بن، ئەم سێ بەشە بریتیین لە:

دەستپێك پرسیار لەبارەی ئەو تیۆرە سیاسیانەوە دەكرێت كە ئەرستۆ بەشێوەیەكی ورد لەدانراوە سیاسیەكانیدا بایەخی پێداون، بۆیە لێرە بەدواوە پێویستە توێژینەوە لەسەر تیۆرەكانی دروستبونی دەوڵەت و پەندە باڵاكانی، لەسیستەمەكانی فەرمانڕەوایی‌و جیاكردنەوەی دەسڵاتەكان، لەگەڵ كۆیلایەتی‌و چۆنێتی هەڵگیرسانی شۆڕشەكان بكەین.

---

(١) ڕێسای گشتیی‌و ئەرستۆ پێشەكی بابەتەكەی بەمانە دەست پێدەكات و لەسیٚ دەروازەی یەكەم پێكدێت،

(٢) ڕاڤەی سروشتی دەستورەكان و ڕێگەكانی جیاوازیكردن لەنێوانیانداو هەمواركردنیان لەخۆدەگرێت و بریتییە لەسیٚ كتێبی دواتر "چوار تا شەش".

(٣) ئەو ڕێساو بنەمایانەی باشترین دەوڵەتی لەسەر دادەمەزرێت و ئەم بەشە لەهەردوو كتێبی هەشت و نۆ پێكهاتوە، ئەرستۆ لەبەشی دووەمدا هەوڵیداوە خاوەن ئەنگیزەی واقیعیانە بێت، لەكاتێكدا لەبەشی(٣) چەشنێك لەمیسالییەتی ئەفلاتۆنی پەیوەدیارە لەگەڵ پەیوەندییەكی ئاشكرا بەو تێزەی كە پێشتر ئەفلاتۆن تێهەڵكێشی كتێبی (یاساكان)ی كردووە.

# تیۆرە سیاسیەکانی ئەرستۆ

## یەکەم: تیۆرەکانی ئەرستۆ سەبارەت بەدروستبونی دەوڵەت

سەبارەت بەلێکۆڵینەوە لەدەوڵەت بەئاشکرا جیاوازی نێوان ئەفلاتۆن و ئەرستۆ دەردەکەوێت، ئەفلاتۆن دروستبونی دەوڵەت بۆ رەگەزی زەرورەت بوون دەگەڕێنێتەوە، واتە ئارەزومەندی تاك بۆ پڕکردنەوەی پێداویستییە ماددییەکانی کە هاندەرێتی بۆ کۆبونەوە لەگەڵ ژمارەیەکی پێویست لەتاکەکەسەکانی تری کۆمەڵ بەمەبەستی هاوکاریکردن لەپێناو تێرکردنی پێداویستییەکانی یەکتر، لەکۆی ئەو هەموو تاکەکەسانە دەوڵەت دێتەئاراوە کە بریتییە لە"گشت"ێکی ئیدیاڵی ئەبستراکت کە تاك تیایدا بوونی سەربەخۆی نییە.

کەچی ئەرستۆ دەوڵەت بەباڵاترین جۆرەکانی رێکخستنەکانی کۆمەڵ دادەنێت کە ئامانجی گەیشتنە بەبەرزترین ئامانج، خێزان لەروی ریزبەندی زەمەنییەوە پێش دەوڵەت دەکەوێت و، ئەگەر کۆمەڵە خێزانێك کۆبونەوە گوند پێکدەهێنن و لەکۆی چەند گوندێك دەوڵەت دێتەئاراوە، بەمەرجێك کۆبونەوەکەیان لەچوارچێوەیەکی فراوانی ئەوتۆدا بێت بوار بۆ هەر گوندێك برەخسێت پشت بەخۆی ببەستێت.

ئەگەرچی دەوڵەت لەروی کاتەوە پاش خێزان دەکەوێت، بەڵام لەروی بیرەوە پێشی خێزان کەوتوە، بەڵکو بەهۆی سروشتی شتەکانەوە پێشی بونی تاك خۆی کەوتوە، کۆمەڵی مرۆیی

بەگەشەکردن دەوڵەتی لێ دروستدەبێت: گشت لەبیردا پێشی بەش دەکەوێت، بنەڕەتی ئەم بیرکردنەوە بۆ بیرۆکەی "یەکێتی ئەندامی" دەگەڕێتەوە کە دەڵێت:

**(( دەستی مرۆڤ بەدەست دانانرێت ئەگەر هاتوو گشت جەستەی مرۆڤەکە لەکارکەوت، واتە پێناسەی دەست بەشێکە لێی (واتە گرتنی شتەکان)و بەمشێوە چیتر ناتوانێت ئامانج بپێکێت ئەگەر بەلاشەی مرۆڤەکەوە نەمابێت، بەهەمانشێوە "تاکەکەس" ئەگەر ئەندامی دەوڵەت نەبێت ناتوانێت ئامانجەکانی بەدەست بهێنێت)).**[191]

بەشداریکردنی زۆربەی خەڵك لەدانانی بنچینەی دەوڵەتدا (بەگوێرەی ئەرستۆ) مەبەست لێی ئەنجامدانی چاکەیە، لەبەرئەوەی مرۆڤ بەبێ یاسا دڕندەترین جۆری ئاژەڵەکانەو یاسا لەبوونیدا پشت بەبوونی دەوڵەت دەبەستێت.. دەوڵەت بەتەنیا بریتی نییە لەکۆمەڵێك بۆ هاوکاری تاکەکەسەکان لەپەیوەندیکردن و بەرگرتن لەتاوان، بەڵکو مەبەست لێی بەدیهاتنی ژیانێکی خۆشگوزەرانەو هیچی دیکە نییە جگە لەکۆبونەوەی کۆمەڵە گوندو خێزانێك لەکۆمەڵێکی کامڵداو لەگەیشتن بەژیانێکی کامەران و سەربەخۆدا پشت بەخۆیان دەبەستن.[192]

---

191– بڕوانە هەمان سەرچاوەی پێشوو.. ل ٢٩٨ و هەروەها:
- King, Charles and Mcgilvray, Jame A, op. cit.. p 46-50.
بەمانای ئەوەی مرۆڤ لەبیری ئەرستۆدا ئاژەڵێکی سیاسییە لەدەرەوەی کۆمەڵگەکەی ناتوانێت درێژە بەژیان بدات، لەم ڕوانگەوە" هەرکەسێك نەتوانێ لەچوارچێوەی کۆمەڵگە بژی.. ناتوانێ ببێتە ئەندام لەدەوڵەتدا.. بڕوانە: ارسطو السياسة: سەرچاوەی پێشوو.. ل ٩٦..

192– الدكتور. محمد لبيب شقير: تاريخ الفكر الاقتصادي، مطبعة الرسالة، الرسالة– القاهرة.. ل ٧٦.

ئەم گێڕانەوە مێژووییە دەربارەی دروست بوونی دەوڵەت تەواو پێچەوانەوەیە لەگەڵ تیۆری پەیمانی کۆمەڵایەتی کە دواتر هەریەك لەهۆبزو رۆسۆ ئاماژەیان پێکردوەو پێیوایە: دەوڵەت لەئەنجامی پەیمان Contract یان رێککەوتنەوە دروستدەبێت، ئەمەش لەبەرئەوەی خێزان لەئارادایەو دیاردەیەکی ئاساییەو، خانەی کۆمەڵایەتی یەکەمە کە دواتر سەرجەم رێکخستنەکانی تری لەسەر دامەزراوە تا دەگاتە دروستبونی دەوڵەت.

لەئاکامی ئەمەوە ناکرێت دەوڵەت بەلێکەوتەی پەیمان یان رێکەوتن دابنرێت، لەکاتێکدا سێستمێکی سروشتییەو بەپێی سونەتەکانی پەرەسەندن و گەشەسەندن پەیدابووە.[193]

جیاوازیی ئەرستۆ لەمامۆستاکەی"ئەفلاتۆن" مەسەلەی بنەڕەتەکانی دروستبونی دەوڵەت تێدەپەڕێنێت و گونجاندنی دەوڵەتیش لەخۆدەگرێت: لەکاتێکدا ئەفلاتۆن لەوبڕوادایە دەوڵەت گشتێکی یەککگرتوەو تاك تیایدا لوونی سەربەخۆی نییە، بەڕای ئەرستۆ دەوڵەت لەکۆمەڵە تاکەکەسێکی لەیەکتر جیاواز دروستدەبێت، یەکێتی رەها واتە لەناوبردنی دەوڵەت.

ئەرستۆ سەبارەت بەهەڵوەشاندنەوەی خێزان و هاوبەشی لەماڵ و ئافرەت و منداڵدا رەخنەیەکی توندی ئاراستەی ئەفلاتۆن کردوە کە دەیوست یەکێتی نمونەیی بۆ دەوڵەتەکەی بێنێتەکایەوە، پێویستە تاکەکەس مافی خاوەنداریێتی تایبەتی هەبێت بەمەرجێك لەسەر چاکەکردن لەهەڵسوکەوت لەگەڵ ئەوانیتر پەروەردەکرابێت، بەجۆرێك

193– الدکتور. ثروت بدوی: سەرچاوەی پێشوو.. ل٧٦ .

تاکەکەس بواری ئەویتر بدات بۆ ئەوەی شتەکانی بەئازادی بخاتەگەڕو تا رادەیەکی زۆر ئەم موڵکە دەبێتە هاوبەشی.

چاکەو بەخشندەییو دوو فەزیلەی گەورەن و بەبێ خاوەنداریێتی تایبەت بەدەست نایەن، هاوبەشی لەمنداڵدا دەبێتە هۆی پشتگوێخستن و چاودێری نەکردنیان بەبەراورد لەگەڵ ئەوەی کە ئەگەر چاودێریو پەروەردەکردنیان بۆ باوك و دایکی خۆیان بەجێبهلرێت، بەڵام زەواج پێویستە لەسەر بنەمای گونجانی نێوان ژن و پیاوەکە بێت" لەتەمەنی هەژدە ساڵی ئافرەت و سیو حەوت ساڵی پیاوەکەدا دەبێت.[١٩٤]

## دووەم: نمونە باڵاکانی دەوڵەت

ئەرستۆ لەنوسراوەکانیدا سەبارەت بەدەوڵەتە پێشنیازکراوەکەی میتۆدێکی دیاریکراوی دارشتوەو، لەمیانەی واقیعەوە بەشوێن کاملبونی دەوڵەتدا دەگەڕێت: خۆی لەو شتانە نزیکدەکاتەوە کە بواری جێبەجێبونیان مەحاڵ نییەو هەروەها خۆی لەو روانگە ئیدیاڵەکان بەدور دەگرێت.[١٩٥]

سەبارەت بەو نمونە باڵایانە کە جێگەبایەخی ئەرستۆ بوون: بایەخێکی گەورە بەیاسا دەدات، وەك چۆن دادوەرییو فێرکردنی

194- بۆ ئاشنابون بەپاساودانی ئەم بارودۆخە بڕوانە: ارسطو: سەرچاوەی پێشوو.. ل ٢٧٩-٢٨٠.

195- Ebenstien, wiliam, Introduction to Political Philosophy, Rinehartnd Company, Incorporated, Princeton, N.J., p 27.

هاوڵاتیان بەگوێرەی پرۆگرامێکی نەخشە بۆکێشراوی بەلاوە نەخستوە.

**لەم روانگەوەو لەبوارەی نمونە باڵاکانی دەوڵەکەی ئەرستۆ"هەریەك لەسەروەری یاساو دادوەریی‌و فێربون لەسایەی تیۆرەکەیدا دەخەینەڕوو:**

## ١. سەروەریی بەندەکانی یاسا

دەسڵات بەلای ئەفلاتۆنەوە دیاردەیەکی تایبەت و تاکەکەسییەو پەیوەستە بەکەسێتی فەرمانڕەوا ( فەیلەسوف)وەو وەك شتێکی تایبەت بەخۆی کە بەهۆی زانست و مەعریفەکەی بەدەستی هێناوە، مومارەسەی دەکات، ئنجا دەسڵاتێکە فەرمانڕەوا بەئارەزویی خۆی‌و بەبێ ئەوەی پاندبون بەهیچ دەستورو یاسایەکەوە بەکاری دەهێنێت، بەڵکو بەبڕیاری تاکەکەسی‌و بەرچاوکردنی هەر حاڵەتەو بەگوێرەی بارودۆخی خۆی.

فەرمانڕەوا لەدیدی ئەفلاتۆندا، پابەند نییە بەدانانی یاساو رێسای گشتگیری پێشوەخت تاکو دواتر بەسەر حاڵەتە فەردییەکاندا جێبەجێی بکات، بەڵکو لەهەر حاڵەتێك بەگوێرەی بارودۆخ و لایەنەکانی، لێرەوە دەوترێت تایبەت لای ئەفلاتۆن لەسەروی گشتەوەیە.[١٩٦]

196- الدكتور. ثروت بدوى: سەرچاوەی پێشوو.. ل ٧٨ .

بەپێچەوانەوە، بەبڕوای ئەرستۆ" دەسڵات لەکۆمەڵەوە سەرچاوە دەگرێت، کۆمەڵەکە زۆرینە بەبێ کەمینە، دواجار دەسڵات دەسکەلای یاسایە نەك فەرمانڕەوا.[197]

پرەنسیپی پابەندبون بەیاساو سەروەریی نەك هەر پێویستە بەڵکو بەڵگەیە، لەسەر سەڵاحییەتی دەوڵەت و، زیرەکترین و داناترین فەرمانڕەواو خاوەن زۆرترین ئیمتیاز ناتوانێت دەستبەرداری یاساکان ببێت، بەهۆی فەراهەمبونی بابەتێتی لەو ڕێسا گشتیانەدا، کە بەتەواوی داماڵراوە، یاسا بریتییە لەعەقڵی داماڵراو لەگشت هەواو ئارەزوییەك.[198]

بەگوێرەی ئەوانەی سەرەوە ئەوەمان بۆ ڕوندەبێتەوە" میسالییەتی سیاسی لای ئەفلاتۆن لەئیرادەی فەرمانڕەوای عاقڵدا بەرجەستەدەبێت، کەچی ئەرستۆ لەڕێسا گشتیو ئەبستراکتەکەی دەسڵاتی سیاسیدا دەیبینێەوە کە مەبەست لێی گەیشتنە

---

197– بەمە ئەرستۆ کارەکتەرێکی دیکە دێنێتە ناو مەسەلەی سەروەریی، ئەویش ئەوەیە کە پشت بەکەسی فەرمانڕەوا نابەستێت بەڵکو بەیاسا، واتە داوایکردوە تا ئەو پەڕی ئەندازە پابەندی یاساکان بن لەگەڵ پێداویستی گوێڕایەڵ بوون بۆ فەرمانەکانی و ئەرستۆ یاساکانی وەک کارەکتەرێکی سەرەکیی لەدامەزراندنی دەوڵەتدا بەشداری پێکردوە، بەچەشنێک پێگەیەکی باڵای داوەتێ (بەیاساکان) کە ئەم باڵاییە دەکەوێتە سەروی دەسڵاتی فەرمانڕوا، ئیتر ئەو فەرمانڕەوا تاکەکەس بێت یان دەسەیەک.. یاسا دانراوەکان پێویستە سەروەرییەکی باڵای نەبڕاوەی هەبێت بەڵام فەرمانڕوایی تاکەکەسی ئیتر ئەگەر تاک یان کۆمەڵێک لەتاکەکان بەڕێوەی بەرێت نابێت سەروەریی هەبێت مەگەر تەنیا لەو مەسەلانەی کە یاسا دەتوانێ بەیانێکی دروستی لەبارەوە دەربکات، ئەمەش لەبەر سەختی دانانی ڕێساگەلێکی گشتی گونجاو لەگەڵ گشت بارودۆخ و بۆنەکاندا.. بڕوانە: الدکتور. علی احمد عبدالقادر: سەرچاوەی پێشوو.. لا ١٤٣-١٤٤ .

198– بڕوانە: ارسطو: السیاسة: سەرچاوەی پێشوو.. لا ٢٣٠ .

بەئامانجەکانی کۆمەڵ و ئەوەی دادوەریی لەنێوان هاوڵاتیاندا دێنێتەکایەوە.

لەوانەیە بوترێت" ئەفلاتۆن (لەهەردوو کتێبی سیاسەتمەدارو یاساکاندا) پێش ئەرستۆ کەوتوە لەدوپاتکردنەوەی یاساکاندا،بەڵام نابێت ئەوەمان لەبیرچێت کاتێك ئاماژەی بەوە کردوە: ئەو دەوڵەتە (تێکەڵە)ی لەروی دەسڵاتەوە بەپەلەیەك لەدوای دەوڵەتی ئیدیاڵەوە داناوە، لەبەرامبەردا ئەرستۆ دەوڵەتی یاسای بەباشترین شێوەکانی رێکخستنی سیاسی وێناکردوەو جیا لەهەر سێستم و شێوازێکی فەرمانڕەوای گشت خەسڵەتەکانی سەرکەوتن و ئیمتیازێکی داوەتێ.

بەبڕوای ئەرستۆ، هاوکات لەگەڵ داننانی بەپرەنسیپی جیاوازی یاساکان و کاریگەربونیان بەئارەزومەندییەکانی دارێژەرانیو خزمەتکردنی خواست و بەرژەوەندییەکانیان" یاسا دەسڵاتێکی بێلایەنە، لەمەدا تەواو خاوەن ئەنگێزەیەکی واقعییە، بەڵام هاوکات یاساکان بەدەستورەکانەوە دەبەستێت: یاسا چاکەکان لەدەستورە چاکەکاندان و یاسا خراپەکان لەدەستورە خراپەکاندا، واتە سێستمی چاك ئەو سێستمەیە بەندەکانی یاسا جێبەجێدەکات، و پێچەوانەکەی راست نییە، لەوانەیە دەوڵەتێك هەبێت سەروەری یاسای چەسپاندبێت، بەڵام سێستمە سیاسیەکەی سێستمێکی گەندەڵ بێت.[199]

ئەرستۆ ئەم بیرۆکانەی هەنگاوێك بەرەو پێشەوە بردوە، کاتێك جیاوازیکردوە لەنێوان ئەو یاسا دەستورییانەی کە بنەما بنەڕەتییەکانی شار دادەڕێژن و ئەو یاسا ئاساییانەی شوێن یاسا

---

199– بڕوانە: سباین: سەرچاوەی پێشوو.. ل ١٣١ .

دەستورییەکان دەکەون، جیاوازیکردنەکەی ئەرستۆ تا هەنوکە بەردەوامەو رۆڵی کاریگەر لەبواری یاسای دەستوریی‌و دیاریکردنی ئاستی ملکەچی دەوڵەت بۆ یاسادا دەگێڕێت.[200]

سەرباری پێداگری ئەرستۆ لەسەر پێگەی یاسا لەچوارچێوەی دەوڵەتدا، هێشتا بواری هەبونی یەك فەرمانڕەوای رەتنەکردوەتەوە لەکاتێکدا ئەو فەرمانڕەوا بەڕاستی لەژێردەستەکانی جیاواز بێت، لەئاکامی ئەمەدا" بڕیارەکانی لەعەقڵێکەوە دەردەچێت کە لەسەرو عەقڵی هاوڵاتیانەوەیەو بەگوزارشتی ئەرستۆ گەیشتوەتە پێگەی خواوەند لەناو خەڵکیدا.[201]

وەك چۆن ئەرستۆ ئاماژەی بەگریمانەی هەبونی چەندین کەسی جیاواز لەگشت خەڵکی کردوە، ئنجا پێویستە وتەی ئەم دەستەبژێرە لەبەرچاو بگیرێت، چونکە یاسا هەرگیز بۆ خەڵکانی بلیمەتی هاوشێوە دانەنراوەو ئەوانە بۆ خۆیان یاسان، هەروەها گاڵتەجاڕییە ئەگەر هەوڵبدرێت ئەوانە ملکەچی بەندەکانی یاسا بکرێن، لەبەرئەوەی دەتوانن زۆر بەئاسانی وەڵامی ئەوە بدەنەوە وەك چۆن شێرەکان وەڵامی ئەو بڕیارەیان پێدایەوە، کە کۆمەڵەی کەروێشکان سەبارەت بەمەسەلەی یەکسانی گشتی ئاژەڵان دەریانچواندبوو.[202]

هاوکات هەڵکەوتنی ئەم تاکەکەسە یان ئەو کەمینە کەمە دانسقەیەو دەرچونە لەو یاسا گشتییەی کە خۆی لەبەدیهێنانی چاکە (بۆ هەموان، بەبێ تایبەتکردن) دەبینێتەوە.. دواجار ئەرستۆ ئەو

---

200– الدکتور. ثروت بدوی: سەرچاوەی پێشوو.. ل ٧٩.

201– بڕوانە: الدکتور. علی احمد عبدالقادر: سەرچاوەی پێشوو.. ل ١٤٥ . هەروەها: ارسطو" السیاسة: سەرچاوەی پێشوو.. ل ٢١٧ .

202– ارسطو: السیاسة: سەرچاوەی پێشوو. ل ٢١٧ .

هەڵوێستە دوپاتدەکاتـەوە کـە دەبێـت (سێسـتمی پاشـایەتی (ئەگـەر هــەبوو) سێســتمێکی دەســتوریی بێــت و لەلایــەن پرەنســیپە یاساییەکانەوە دیاری‌و پشتگیری لێبکرێت.

## ٢. دادوەریی

ئەرسـتۆ لەبەشـی پێنجـەمی کتێبەکەیـدا لـەبارەی ئەخلاقـەوە جیاوازی لـەنێوان دوو مانـای دادوەریـدا دەکـات: لەلایەکـەوە بەرامبـەر بەگشـت فەزیلـە ئەخلاقییـەکان دەوسـتێت و بـەم پێیـە پیـاوی دادوەر پیـاوێکی خۆپـارێزو چـاك و شـەریفە، لەلایـەکی دیکـەوە فەزیلەیـەکی تایبـەتی دیـاریکراوە جێگەکـەی بەتەنیشـت زیرەکـی‌و میـانڕەویی‌و بەخشـندەییەوەیە یـان ئـەو فەزیلەتـەی مـرۆڤ لەهەڵسـوکەوتی لەگـەڵ ئــەوانیترو لەمەســەلەکانی خاوەندارێتی‌پاشــایەتی‌و گرێبەســت و هاوشێوەکانیاندا مامەڵەی پێدەکات.

کەواتــە پیــاوی دادوەر بــەواتای یەکــەم بــەزەرورەت دادوەرە سـەبارەت بـەواتای دووەم، ئەگەرچـی پێچـەوانەی ئەمـەش بەتـەواوی راسـت نییـەو لەوانەیـە پیـاوی خاوەنکـار لەمامەڵـە بازرگانییەکانیـدا ئەمانـەتپارێز بێـت و لـەبوارەکانی تـری ژیانیـدا وانـەبێت: لەوانەیـە چـروك یـان حەسـود بێـت یـان هەریەکـە لەخەسـڵەتە نـەخوازراوەکانی تر.[٢٠٣]

---

203- بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: الدکتور. علی احمد عبدالقادر: سەرچاوەی پێشوو.. ل ١٦٠-١٦١ . ئنجا بەراوردی بکە لەگەڵ:

- Kelsen, Hans; Arisuies Doctrine of Justice. In Kramnick, Isaac, op. Cit.. p 53-55.

سەرەڕای ئەو تەشویشەی ئەم جیاوازییە لەلای نەوەکانی دواتر دەیورژێنێت، کاتێك ئەرستۆ جیاوازی لەنێوان دوو دەلالەتی دادوەریدا دەکات ویستویەتی ئاماژە بەجیاوازی کرۆکی ماناو بنەڕەکەی بکات: کاتێك باس لەدادوەریی دەکەین لەهزرماندا بیرمان بەلای کەسێکی جیاوازی کەسێکدا دەچێت وەك ئەوەی لەجێگرییەکی ستایکییەوە نزیکبێت، بەهەمانشێوە کاتێك بۆ نمونە پیاوێك بەفەزیلە وەسف دەکەین، بەڵام کاتێك باس لەدادوەریی دەکەین بەگوێرەی واتا یەکەم، ئامانجمان جیاکردنەوەی بونەوەرێکی مرۆییە لەرووە وەزیفییەکەوە (کارلێك و مامەڵەی لەگەڵ ئەوانیتر) ئەم کارلێکە گوزارشتە لەتوانای ئەو (دادوەر)ە لەسەر بنەمای ئەوەی لەپەیوەندیکردنی لەگەڵ ئەوانیتردا فازیل و چاکەکار بێت.

ئەمەش پاڵنەرێکی تر دەبێت لەدوپاتکردنەوەی ئەوەی کە سەرباری پەیوەندی لەریشەوەی نێوانیان" دادوەریی لەواتای یەکەمدا جیاوازە لەدادوەریی لەواتای دووەمیدا: دادوەریی لەمانای یەکەمیدا فراوان و گشتگیرە بۆ واتای گشتی فەزیلە.[204]

لەکاتێکدا دادوەریی بەگوێرەی واتای دووەم (وەك هەر فەزیلەیەکی تر چەمك و مەغزای دیاریکراوی هەیە) و لەکاتی جێبەجێکردندا بوارێکی سنورداریی هەیەو ئەگەرچی هەردوو ماناکە پێکەوە بەستراون بەو پێیەی هەردوکیان بۆ پەیوەندییە مرۆییەکان دەگەڕێنەوەو هەندێك لەلایەنەکانی روندەکەنەوە.

---

204– بەرامبەر ئەوەی ئەرستۆ بەچەمکی دادوەریی یاسایی (Law fulness) بەشێک نییە لەفەزیلەت، بەڵکو خودی فەزیلەیە.. فەزیلەی تەواوە.. بەمانای ئەوەی فەزیلەی کۆمەڵایەتییە.. بڕوانە:

- Ibid., p 53.

## ٣ . فێربون

فێربون وەك پايەيەكی دەوڵەتە نمونەييەكەی ئەرستۆ، بريتييە لەپرۆسەی گۆڕينی خەڵكی بۆ هاوڵاتيانی چاكەكار يان راهێنانيان لەسەر پيادەكردنی فەزيلە، بەڵگەنەويستە ئەم ئەركە دەكەوێتە ئەستۆی دەوڵەت، پەروەردەكردنی منداڵ پێويستە يەكێك بێت لەو بابەتە گرنگانەی ياسادارێژ بايەخيان پێدەدات و ياسا لەسەريەتی ئەو پرۆسەيە رێكبخات كە دەبێت گشتیو تەوزيمی بێت بۆ سەرجەم ئەندامانی دەوڵەت.[205]

پرۆگرامی پەروەردەيی ئەوەی ئەرستۆ پێشنيازی كردوە، لەزۆر لايەنيەوە لەو پرۆگرامە پەروەردەييە دەچێت كە پێشتر ئەفلاتۆن پێشنيازی كردوە: پەروەردەی پێشنيازكراو لەهەردوو بارەكەدا لەسەر بنەمای تەوزيمیو رەتكردنەوەی ئەو فێربونەی كە ئامانجی بەرژەوەندييە بەندەو ئامانج لێی پێگەياندنی ئەو منداڵانەيە لەدواڕۆژدا دەبنە هاوڵاتی. لەگەڵ جياكردنەوەی كۆيلەكان (كۆيلەكان لەسەريانە فێربن، بەڵام نەك ئەو پەروەردەی كە لێرەدا مەبەستە، بەڵكو فێربونی ئەو هونەرانەی كە بەرژەوەنديان لێدەكەوێتەوە لەنمونەی چێشتلێنان) هاوڵاتی دەبێت (بەگوێرەی ئەرستۆ) بەچەشنێك پەروەردەبكرێت كەوا لەگەڵ جۆری ئەو حوكمڕانييەدا بگونجێت كە لەسايەيدا ژيان دەگوزرێنێت و ئەوەش دەسەپێنێت كە لەفێربوندا دەبێت جياوازيگەلێك هەبێت شارێكی لەشارێكی تر جيابكرێتەوەو بەپێی حكومەتی ئەو شارە كە ئايا سيستەمی ديموكراسييە يان سيستەمی ئۆليگشاری.

---

205– ارسطو: السياسة: سەرچاوەی پێشوو.. ل ٢٨٧-٢٨٨ .

کاتێك ئەرستۆ قۆناغەکانی پرۆگرامە پەروەردەیەکەی ڕاڤەدەکات، ئەو قۆناغەی لێجیاکردوەتەوە کە ئەفلاتۆن لەپرۆگرامە پەروەردەییەکەیدا پێشنیازی کردبوو، بەمجۆرە قۆناغی یەکەمی فێربون کە تاکو گەیشتن بەتەمەنی گەنجێتی بەردەوام دەبێت، دەبێتە بنەڕەت و ئامانج لەگشت پرۆسەی فێرکارییداو ئنجا ئەرستۆ قۆناغەکان بەشێوازی حەوتی (واتە گشت حەوت ساڵێك) دابەشدەکات بۆ سێ قۆناغ:

### قۆناغی یەکەم

## لەدایکبونەوە تاکو تەمەنی حەوت ساڵی

چاودێریکردن لەم قۆناغەدا لەسەر بونیادی جەستەی منداڵ لەروی تەندروستیو وەرزشیەوە چڕدەبێتەوە، بۆ ئەوەی بەرگریی لەشیان بەشێوەیەك بەهێز بکرێت توانای روبەڕوبونەوەی کەشوهەواو نارەحەتییەکانی هەبێت و دەبێت لەگشت ئەو شتانە دوربخرێتەوە کە لەگەڵ دابونەریتی گشتیدا ناگونجێن و دیمەنانەش کە کاریگەری خراپیان لەسەر چاو دەبێت.[206]

---

206– برتراند راسل لەمبارەوە دەڵێت: پێویستە منداڵان فێری ئەو شتانە ببن کە سودی بۆیان هەیە بەڵام نابێت ئەمە بگاتە ئەو ئاستەی کە دوچاری ریسواییان بکات.. هەروەها پێویستە فێری وێنەکێشان ببن لەبەرئەوەی رێز لەجوانی مرۆیی بگرن، وەک چۆن دەبێت فێری هونەری وێنەگرتن و پەیکەرتاشی ببن کە گوزارشتن لەبیرۆکەی دروست بوون دەکەن.. مافی ئەوەشیان هەیە" فێری گۆرانی و ژەنین ببن.. فێری خوێندنەوەو نوسین ببن، لەگەڵ ئەوەی ئەم دوو هونەرە لەلیستی هونەرە سودمەندەکاندا، هێشتا ئامانج لەفێربون (فەزیلە)یە نەک سودوەرگرتن.. بڕوانە: برتراند راسل: سەرچاوەی پێشوو.. لا ٣١ .

### قۆناغی دووەم

## لەحەوت ساڵییەوە تاکو تەمەنی پێگەیشتن

لەم قۆناغەدا هاوڵاتیان لەسەر جێبەجێکردنی کارو چالاکییەکان رادەهێنرێن، نەك لێ تێگەیشتن و توێژینەوەی، ئەم راهێنان و مەشقپێکردنە نابێت بیانکاتە ئاژەڵی درەندە، بەڵکو دەبێت بەرەو نەرمونیانیو یەکخستنی جوڵەو جوانی بونیادو کاملی جەستەیاندا بەرێت، ئنجا نۆبەتی رۆڵی مۆسیقا دێت بۆ تێرکردنی عەقڵ لەچوارچێوەی ئەو جەستە کاملەدا.

### قۆناغی سێیەم

## تاکو تەمەنی بیست و یەك ساڵی

مەبەستی فێربون لەم قۆناغەدا خزمەتکردنی کۆمەڵە، هاوڵاتیانی گوێرایەڵەکان دەگۆڕێن بۆ هاوڵاتیانێك کە توانای حوکمڕانییان هەبێت و لەمیانەی پیادەکردنی هەندێك لەئەرکەکانی سەرشانیانەوە بەئەندازەیەك لەدانایی بەهرەمەند دەبن و لەگەنجیاندا چەندە گەشە بەکەن" داناییو فەلسەفەو راهاتنیان لەسەر بەکارهێنانی توانا هزرییەکان لەکەمکردنەوەی کێشەکانی دەوربەریان، زیاد دەکات تا دەگەنە فەلسەفەی تێڕامان.[٢٠٧]

207– بڕوانە: الدکتور. علی احمد عبدالقادر: سەرچاوەی پێشوو..ل ١٥٨ .

## سێیەم: سێستمەکانی فەرمانڕەوایی لای ئەرستۆ

ئاراستەی توێژینەوەیی لەهزری ئەرستۆدا گەورەترین کاریگەری لەسەر پۆلێنکردنی سێستمەکانی فەرمانڕەوایی هەبووە، وەك چۆن کتێبی "دەستورەکان" یارمەتیدەرێکی باشی بووە لەقوڵبونەوە لەدابەشکردنە گونجاوەکانی شێوازەکانی حکومەتەکان.[208]

لەم روانگەوە پۆلێنێکی بەهەژدە سێستمی سیاسی جیاوازی پێشکەش کردوین، کە تۆژاندنەوەی بۆ کردوەو بەشێوەیەکی لۆژیکی یەکیخستون.

ئەرستۆ لەپۆلێنکردنی شێوازی حکومەتەکاندا پشتی بەدوو پێوەری سەرەکی بەستوە: یەکەمیان پێوەری ژمارەیی یان پێوەری چەندێتیو، دووەمیان پێوەری چۆنێتی یان پێوەری بابەتی‌یە، بەپێی

---

208– پێویستە تێبینی ئەوەش بکرێت ئەرستۆ جیاوازیی لەنێوان دەوڵەت و حکومەتدا کردوە: دەوڵەت گوزارشتە لەکۆبونەوەی هاوڵاتیان لەکاتێکدا حکومەت بریتییە لەکۆبونەوەی ئەو هاوڵاتیانەی لەکۆمەڵگەی خۆیاندا رەشمەی دەسەڵاتیان بەدەستەو کاروبارەکانی بەڕێوەدەبەن، حکومەت دەستاوێژێکی بەرجەستەو راستەقینەیە لەپێناو جێبەجێکردنی ئامانجەکانی دەوڵەت و ئاڵوگۆڕکردنی ئەرکە سیاسیو پێکهێنەرەکانی.. لەکاتێکدا حکومەت لەگەڵ گۆڕانی دەستەی باڵای ئەو حکومەتە لەکۆمەڵگەدا گۆڕانی بەسەردا دێت، هەرگیز دەوڵەت گۆڕانی بەسەردا نایەت، تەنیا لەکاتی گۆڕینی دەستورەکەیدا نەبێت.. دامەزراندنی حکومەت لەدەوڵەتی ئەرستۆدا لەسەر بنچینەی رەسەنایەتی رەچەڵەك و لەدایك بوون و سامان و ژمارە بەندە، ئەگەر پشتی بەژمارە بەست وەك بنچینەی فەرمانڕەوایی ئەوا سودی بۆ هەموان تێدایە.. بڕوانە هەمان سەرچاوەی پێشوو..ل ١٤٨ .

پێوەرە ژمارەییەکە دەسەڵات لەدەستی تاکەکەس یان لەدەستی ژمارەیەك کەسی کەم و یان لەدەستی زۆرینەو کۆمەڵدایە.[٢٠٩]

و بەپێی پێوەرە چۆنێتی یان بابەتییەکە جیاوازیکردنەکەی ئەرستۆ لەنێوان جۆری حکومەتەکاندا پشت بەچاکی یان گەندەڵی ئەو حکومەتانە دەبەستێت: حکومەتی چاکەخواز ئەوەیە چاکەی هەموانی وەکیەك دەوێت و بەپێی یاساو رەزامەندی ژێردەستەکانی فەرمانڕەوای دەکات و، چاکەخواز نابێت (بەڵکو خراپ دەبێت) ئەگەر هاتوو تەنیا بایەخی بەبەرژەوەندی خۆی داو مەبەستی فەرمانڕەواکان (تاك بێت کۆ) بوو، بەرژەوەندی خۆی یان چینێك بەبێ چینەکانی تر، بەپێچەوانەی یاساو بنەما گشتییەکان حوکمڕانی کرد یان بەزەبری هێزو بەبێ خواستی دەسڵاتی بگرێتە دەست.[٢١٠]

ئنجا ئەرستۆ هەردوو پێوەرەکەی پێشوو (چەندێتیو چۆنێتی) تێکەڵ بەیەکتر دەکات تاکو دابەشکردنێکی شەشی/مان بداتێ (وەك ئەوەی ئەفلاتۆن لەکتێبی سیاسەتمەدار ئاماژەی پێکردوە)

---

209– ئەم دابەشکردنەی حکومەت ئەفراندنی ئەرستۆ نییە، ئەفلاتۆن لەمەدا پێشی کەوتوە، بەڵام ئەرستۆ فەزلی خۆی هەیە، لەبەرئەوەی یەکەم کەسە ئەم دابەشەکردنە بەناوبانگەی لەسەردەمەکەی خۆیدا پەرەپێداو بەباشترین شێوە رونیکردوە، لەرێکخستنی (سیاسەت) پشتی پێبەستوە و هەریەک لەسپینۆزاو مۆنتیسکۆ پەیڕەوییان لەم شێوازە کردوە: یەکەمیان لەکتێبی (لاهوتی سیاسی) و دووەمیان لەکتێبی (رۆحی یاساکان)دا، ئەم شێوازە بووە شێوازی زانستی سیاسی لەماوەیەکی زۆری رابردوداو لەداهاتویشدا دەستبەرداری نەبوو..
بڕوانە: ارسطو: السیاسة: سەرچاوەی پێشوو.. لا ١٩٨ .

210- Bluhm, William T., Immanent Good, Aristotles quest for the best regime, in Kramnic Isaac, op. cit.. p 69.
- Mcdonald, op., cit.. p 57-58.

حکومەتەکانی بۆ چاك و خراپ پۆلینکردوە، سێ حکومەتیان چاك و سیانەکەی تر خراپن:

سێستمە چاکەکانی فەرمانڕەوایی: سێستمی **پاشایەتی** کە تیایدا فەرمانڕەوای بەدەستی تاکەکەسەوەیەو بەپێی یاساو بەمەبستی بەرژەوەندی گشتی فەرمانڕەوایی دەکات، سێستمی **ئەرستۆکراتی** کە تیایدا فەرمانڕەوا کەمینەیەکی تایبەتەو بەگوێرەی یاساو لەبەرژەوەندی کۆ کارەکانی حوکمڕانی دەکات و، سێستمی **کۆماریی** یان **دیموکراسی میانڕەو** لەمەیاندا دەسڵاتدارێتی بۆ زۆرینەیە لەچینەکانی ناوەڕاست و ئەرستۆ چاکەی بەسەر سێستمەکانی تری حوکمڕانیدا دەدات.

هەرچی وێنەی سێستمە گەندەڵەکانە: حوکمی **زۆرداریی** کە پشت بەخودپەرستی و فرتوفێڵ دەبەستێت و فەرمانڕەوا تاکەکەسەو دەسڵات بۆ بەرژەوەندی خۆیو بەبێ پابەندبون بەیاساو ئیرادەی ژێردەستەکانییەوە بەڕێوەدەبات، سێستمی **ئۆلیگارشی** کە نوێنەرایەتی خەمی دەوڵەمەندبون دەکات و لەسایەیدا دەسڵات بەدەست کەمینەیەکی تایبەتی دەوڵەمەندەوەیە، واتە حوکمڕانی دەوڵەمەندەکان ئەوانەی مەبەستیان بەرژەوەندییە تایبەتەکانی خۆیانە، ئنجا سێستمی **دیموکراسی** (توندڕەو) کە تیایدا زۆرینە لەچینی هەژارەکان لەدژی دەوڵەمەندەکان و بۆ بەرژەوەندی خۆیان دەسڵات دەگرنە دەست.[211]

---

211- پێدەچێت تەنیا جیاوازی نێوان چارەسەری هەریەک لەئەفلاتۆن و ئەرستۆ بۆ بابەتەکە لەوەدا بێت کە یەکەمیان دەوڵەتی دەستوری بەو دەوڵەتە وەسفدەکات کە ملکەچی یاسا دەبێت، لەکاتێکدا دووەمیان (ئەرستۆ) وەسفی دەکات بەوەی کە بریتییە لەو دەوڵەتەی کە لەبەرژەوەندی گشتی فەرمانڕەوایی

دەتوانین بەگوێرەی ئەم خشتەیە دابەشکردنەکەی ئەرستۆ بۆ سیستەمەکانی فەرمانڕەوایی بخەینەڕو:

| فەرمانڕەوایی بەرژەوەندی/ کێ فەرمانڕەوایی دەکات | گشت | تایبەت |
| --- | --- | --- |
| تاك | پاشایەتی | زۆرداریی |
| کەمینە | ئەرستۆکراتی | ئۆلیگارشی |
| زۆرینە | کۆماریی یان دیموکراتی | دیموکراسی (تونڕەو) |

---

دەکات، لەبەر رۆشنایی توێژینەوەکانی ئەرستۆ بۆ واتای حکومەتی دەستوریی ئەوە دەردەخات کە پێی وابووە هەردوو وەسفەکە یەک ئەنجامیان لێدەکەوێتەوە.. بڕوانە: سباین: سەرچاوەی پێشوو.. ل ١٢٨-١٢٩ .

لـەنێوان ئـەم شـەش جـۆرە سیستـەمە (چـاك و گەنـدەڵ)ەی فەرمانڕەوایدا، چەندین شێوازێکی تر هەیە کە هەموویان پێکهاتە یان تێکەڵـەن لـەم ڕەگەزانـە، بـۆ نمونـە لـەنێوان سیستـەمی پاشـایەتی چـاکەخوازو لـەنێوان سیستـەمی زۆرداریـی گەندەڵـدا بـوار بـۆ دروسـتبونی چـەندین جـۆر سیستـەمی تـری حـوکمڕانی هەیـە کـە هەریەکەیان بەئەندازەی چاکی یان خراپی لەویتریان جیادەکرێتەوە، بەو ئەندازەی سیستەمەکە لەسیستەمی پاشایەتی نزیکدەبێتەوە زیاتر بـەرەو چاکە ڕۆشتوەو لەگەنـدەڵی دورکەوتوەتـەوەو، بەپێچەوانەوە.. بەو ئەندازەش کـە سیستەمەکە هاوشێوەی حوکمی زۆرداریـی دەبێت زۆرتـر گەنـدەڵ و کـەمتر چـاکەو هـەروەها سـەبارەت بەسیستـەمەکانی تری فەرمانڕەوایی.

پێویستە تێبینی ئەوەش بکرێت بنـەمای جیاوازیکردن لەنێوان سیستـەمە چـاك و سیستـەمە خراپـەکان بریتییـە لـەو خەسـەڵەتە ئەخلاقیانـەی کـە لەکەسێتی فـەرمانڕەوادا ڕەنگدەداتـەوە، نـەك جـۆری ئەو دەستورەی لەهەریەك لەو سیستمانەدا پەیڕەوی لێدەکرێت.

ئەرسـتۆکراتییەت فـەرمانڕەوایی خـەڵکانی خـاوەن فەزیلەیـە، ئۆلیگارشـی فـەرمانڕەوایی خـەڵکانی خـاوەن سـامانە. ئەرسـتۆ دەوڵەمەنـدیو فەزیلـە بـەموورادیفی زۆر لەیـەکنزیك نازانێـت و بـڕوای وایە پیاوی موتەمیکنی میانڕەو زۆر نزیکـە خـاوەن فەزیلە بێت، بۆیـە جیـاوازی لـەنێوان حـوکمڕانی چـاکەکاران (فـەرمانڕەوایی ئەرسـتۆکراتی)و حـوکمڕانی دەوڵەمەنـدەکان (فـەرمانڕەوایی ئۆلیگارشـی)دا هەیـە، چونکە واباشـتر وایە خـەڵکانی خاوەن فەزیلـە بڕێکـی مامناوەنـد سـامانیان هـەبێت و جیاوازییەکـە کـە ئاسـتێکی

ئەخلاقی هەیە فراوان دەبێت تاکو هەردوو سیستمی پاشایەتیو زۆرداریی لەخۆبگرێت.[212]

## چوارەم: پرەنسیپی جیاکردنەوەی دەسڵاتەکان

ئەرستۆ یەکەمین کەسە دەسڵاتەکانی دەوڵەتی بەسەر سێ دەسڵاتدا دابەشکردوە: یاسادانان و جێبەجێکردن و دادوەریی.. لەگشت وڵاتانی جیهاندا شێوازی حوکمڕانی هەرچییەك بێت سێ چالاکی یان یان سێ ئەرکی گرنگی تێدایە: یەکەمیان: داڕشتنی پرەنسیپ یان ڕێسا گشتییەکان، واتە ئەرکی یاسادانان.. دووەمیان: سەرقاڵبون بەجێبەجێکردنی ئەو پرەنسیپ و ڕێسا گشتیانەوە، واتە ئەرکی جێبەجێکردن و، ئەرکی سێیەم: ئەو دەسڵاتەی بەهۆیەوە ناکۆکییەکان چارەسەردەکرێن و سزای تاوانباران دەدرێت و، جێبەجێکردنی ئەم ئەرکە لەئەستۆی دادگاو دادوەرەکاندایە.

زۆر پێویستە ئەم دەسڵاتانە یان ئەم ئەرکانە لەدەستی تەنیا کەسێکدا کۆنەبنەوە، بەڵکو بخرێتە ئەستۆی دەستەی جیاواز.[213]

ئەرستۆ گوزارشت لەبڕوای ئاشکرای بەم پرەنسیپە دەکات لە"سیاسەت"ەکەیدا، کاتێك دوپاتیدەکاتەوە: دەوڵەت لەسێ بەش پێکدێت و ئەگەر یاساداڕێژەر کەسێکی داناو لەسەروی هەموو شتێکەوە کاری بەدانایی کردو کارەکانی لەسەر ڕێکخست و هەرکاتێك بەباشی ئەم سێ بەشەی بەشێوەیەکی تەواو ڕێکخست، ئەوا گشت سیستمەکەی دەوڵەت چاك دەبێت،دەوڵەتان بەم سێ ڕەگەزە نەبێت جیاوازی ناکەوێتە نێوانیانەوە:

---

212- بڕوانە: ارسطو: السیاسة: سەرچاوەی پێشوو.. ل ١٩٧ تاد.

213- الدکتور. عبدالحمید متولی: سەرچاوەی پێشوو.. ل ٧٣ .

### یەکەم

بریتییە لەکۆمەڵەیەکی گشتی تایبەت بەلێکۆڵینەوەی ئیشوکارەکانی کۆمەڵ و ئەو ئەرکەی لەئەستۆی دەگرێت تەنیا بریتی نییە لەدارشتنی یاساکان و دیاریکردنی دادوەران، بەڵکو بەحساباتەکانی دەوڵەتیشدا دەچێتەوە.. بێگومان سروشتی ئەم تایبەتمەندیانە بەگوێرەی جیاوازی حکومەتەکان گۆرانی بەسەردا دێت: ئەم کۆمەڵە لەوانەیە بەچەندین رێگەیەکی جیاواز دابمەزرێت بەپێی ژمارەی ئەندامەکانیو ئەو دەسڵاتە کەپێی دراوە.. لەسیستمی دیموکراسیدا یان لەئۆلیگارشی و تەنانەت لەوڵاتانی کۆماری یان ئەرستۆکراتدا.

### دووەم

بریتییە لەدەستەی فەرمانڕەوا کە جێبەجێکردنی سروشت و تایبەتمەندێتیو رێگەکانی دامەزراندن بەڕێوەدەبات، بەشوێنکەوتنی ئەم رێسایە کۆمەڵێك بابەت لەبارەیەوە دەوروژێت کە لەروی ژمارەو لەروی گرنگییەوە هیچیان لەکۆمەڵەکە کەمتر نییە.. ئەو ئەرکە گشتیانە چین کە ئەنجامی دەدات؟.. ماوەکەی لەچەند تێپەڕنەکات؟.. بەرپرسێتی ئەو کۆمەڵە بەکێ بسپێردرێت؟.. چۆن تێیدا دادەمەزرێن؟.. ئەو ئەرکانە چین کە دەتوانرێت بەبێ زیان لەو کۆمەڵەدا کۆبکردرێنەوەو سودمەند بن؟.. ئایا هەموو ئەرکەکان لەگەڵ گشت جۆرەکانی فەرمانڕەوایدا دەگونجێن؟..

### سێیەم

بریتییە لەو دامەزراوە دادوەرییەی کە پێویستە بەتەواوی رێکبخرێت و شتانەش رونبکرێنەوە کە پەیوەندیان بەکارمەندو دادوەرکانەوە هەیەو بەرێگەی ریزبەندی لەبەرزەوە بۆ نزم رێکبخرێن، ئیتر ئەو

دامەزراندنـە یـان لەرێگـەی هەڵبژاردنـەوە دەبێـت و یـان لەرێگـەی ناوڕاکێشانەوە دەبێت.[٢١٤]

ئەگـەر ئەمـە بریتیـی بێـت لەبنـەڕەتی پرەنسـیپی جیاکردنـەوەی دەسـڵاتەکان، ئـەوەی مۆنتیسـکۆ سـەدەی هـەژدەیـەم بـەبێ ئاماژەکردن بەسەرچـاوەکەی.. لەئەرسـتۆ وەریگرتـوە، پێویسـتە ئـەوەش رونبکرێتـەوە کـە ئەرسـتۆ بەلایـەوە باشـتر بـووە ئەگـەر دەسـڵاتی دادوەری لەبری تەنیا کەسێك بەکۆمەڵە کەسێك بسپێردرێت.[٢١٥]

ئەرستۆ پێـی وابووە لەکاتێکدا خەڵەتاندنی کۆمـەڵ کارێکی زۆر ئەستەمە، تاك زۆر بەئاسانی گەندەڵ دەبێت و رێگەی خراپـە دەگرێتـە بەر، ئەرستۆ لەمەدا نمونەیەك دەهێنێتەوەو خراپبونی تاك و کۆمەڵ دەشوبهێنێت بەژەهراوی کردنی ئاو.. ئەرستۆ نمونەکەی بەم شێوەیە دەهێنێتـەوە: خراپبـونی تاکـە کـەس وەك ژهـراوی بـونی پـەرداخێك ئـاوە، کـە چـەند بەئاسـانی ژەهرەکـە کاریگـەری لەسـەر دەبێـت، بەپێچـەوانەوە خراپکردنـی کۆمـەڵ وەك ژەهـراوی بونەکەیـە بـەڵام لەدەریایەکی گەورەدا.

یـان ئـەوەی ئەگـەر دادوەر ئەنگیزەیـەك لـەتوڕەیی لەناخیـدا هەبێت، بێگومان ئەم توڕەییە کاریگەری لەسەر ئەو بڕیارە دەبێت کە دەریـدەکات، بەڵام ئەگەر کۆمەڵێك لـەدادوەر هەبوو ناکرێـت هـەمویان یەکجۆرو بەیەك قەبارە توڕەیی لەناخیاندا دروست ببێت و هـەمویان پێکەوە هەڵە بکەن.[٢١٦]

---

214– ارسطو: السياسة: سەرچاوەی پێشوو.. ل ٤٠-٤١ .

215– هەمان سەرچاوەی پێشوو.. ل ٣٥٨ .

216– الدكتور. عبدالحميد متولی: سەرچاوەی پێشوو.. ل ٧٤ . هەروەها بڕوانە:

## پێنجەم: تیۆرەکانی ئەرستۆ دەربارەی کۆیلە

ئەرستۆ لەو روانگەوە پاساو بۆ سیستمی کۆیلایەتی دەهێنێتەوە، گوایە کۆیلە مافی مسۆگەری ژیانی هەیەو ئەمەش گرنگترین جۆرەکانی مافە کە لەجیاوازە لەتوانای کارکردن لەگەڵ ئیدارەکردنی ئیشوکارەکانی بەرهەم هێنانداو ئەرستۆ لەمبارەوە پرسیار دەکات و دەڵێت:

**(( ئایا سروشت کۆمەڵێك لەخەڵکی بەشێوەیەك ئامادە دەکات کەوا بەلایانەوە کۆیلایەتی رێگەیەکی گونجاو و رێگەپێدراو بێت؟..))**

خودی ئەرستۆ وەڵامی ئەم پرسیارە دەداتەوە: هیچ رێگەیەکی تر لەئارادا نییە.. هەر دەبێت کۆمەڵێك ژێردەستە بن و کۆمەڵێك فەرمانڕەوا، هەر چینێك یان پێگەیەك پێویستە لەلایەن چین یان پێگەیەکی لەخۆی سەرزترەوە فەرمانڕەوایی بکرێت، سروشت بەنەریت لاشەی بەهێز بەکۆیلە دەبەخشێو لەکاتێکدا عەقڵی بەپێزو بیری پێگەیشتوو بەلاشەی مرۆڤی ئازاد دەبەخشێت و بەپێی ئەو پرەنسیپەی کە بیر کۆنترۆڵی لاشە دەکات، مرۆڤی ئازاد دەکاتە فەرمانڕەوا بێت.[٢١٧]

ئەم پاساو هێنانەوەی ئەرستۆ بۆ هێشتنەوەی سیستمی کۆیلایەتی لەروی پرەنسیپەوە هاوشێوەیە لەگەڵ ئەو پاساوەی پێشتر ئەفلاتۆن هێنایەوە بۆ ئەوەی هەمیشە چینی بەرهەمهێن ملکەچی چینەکانی تر بکات، هەمیشە مرۆڤ پێویستی بەکۆیلە

---

- Harmon, op. cit.. p 68-72.

217– بڕوانە: ارسطو: السياسة: سەرچاوەی پێشوو.. لا ١٠١ و هەروەها بڕوانە:

- Harmon, op. cit.. p 68-72.

دەبێت بەمەبەستی زەمینەخۆشکردن و هێنانە ئارای کەشوهەوای گونجاو بۆ پەرەپێدانی توانا مەعنەوی‌و رۆشنبیرییەکانی..

گەشەسەندن پێویستی بەکات هەیە، ئەمەش ئەستەم دەبێت ئەگەر هاتوو مرۆڤ سەرقاڵی کارێکی دەستی بێمانا‌و ریسوابوو، کەواتە دەبێت کۆیلە هەبێت لەپێناو دابینکردنی کەرەستەی پێویست ئامادەکردنی ئامێری مۆسیقا بۆ مۆسیقار.[٢١٨]

ئەرستۆ لەگەڵ پرەنسیپی یەکسانی دژ دەوەستێتەوە، چونکە سروشت بەبڕوای ئەرستۆ خەڵکی جیاکردوەتەوە هەندێکی لەروی بەکارهێنانی جەستەوە بەهرەمەندکردوەو عەقڵی بەهەندەکەی تر بەخشیوە: کەواتە سروشت وایکردوە لاشەی کۆیلە لەلاشەی خاوەنەکەی جیاواز بێت، لەکاتێکدا ئەندامەکانی لاشەی کۆیلە زۆر گونجاوە بۆ ئەنجامدانی کارە قورسەکانی ناو کۆمەڵ، تێبینی ئەوە دەکەین ئەندامەکانی لەشی مرۆڤی ئازاد ئەو توانای نییەو سروشت بەشێوەیەك ئەمانی راهێناوە تەنیا بۆ کاروباروی ژیانی مەدەنی دەست بدەن.[٢١٩]

یکلابوونەوەو پێداگری ئەرستۆ سەبارەت بەکۆیلە بەتەواوی روندەبێەوە کاتێك دوپاتیدەکاتەوە کە تەنیا هۆیەك پاڵ بەسەردارەوە بنێت کە سود لەخزمەتەکانی کۆیلە وەربگرێت، هاوکاریکردنی ئەو کۆیلەیە لەبەردەوامیدان بەخەسڵەتە چاکەکانی مرۆڤایەتی، نەك زیادکردنی سامان و بەهێزکردنی پێگەکەی خۆی، شکستی سەردار

---

218– ارسطو: سەرچاوەی پێشوو.. لا ٩٩ .. لەگەڵ:فؤاد محمد شبل: سەرچاوەی پێشوو.. ١٢٧-١٢٨ .

219– ارسطو: سەرچاوەی پێشوو.. لا ١٠٥-١٠٦ .

لەدەرککردنی پیاوەتییەکانی لەگەڵ کۆیلە ئەو فەزیلەی بیربردوەتەوە کە کۆیلە بەهۆی کۆیلایەتی بوونەوە دەستی دەکەوێت کە بریتییە لەرۆشتنی بەئاراستەیەکی بەرهەمهێندا کە سەردار/ خاوەنەکەی رێنیشاندەری بووە، لێرەدا پەیوەندی نێوان شوێنکەوتو، لەگەڵ ئەو کەسەی شوینی دەکەوێت، بەتەواوی جیادەبێتەوە.[220]

ئەرستۆ لەئاکامی ئەم بیروباوەڕانەوە روبەروی رەخنەیەکی توند بووەو تانوتێکی زۆری لێدرا سەبارەت بەو بارە دەرونییە هێمنەی کە ئەم تیۆرەی پێ راڤەکردوە، لەکاتێکدا خاوەنی ئەم بیرۆکەیە کە دوپاتیدەکاتەوە:

(( **لەناو کۆیلەکاندا هی وا هەیە شیاوی ئازادییەو لەناو ئازادەکانیشدا هی وا هەیە شیاوی بەکۆیلەکردنە..** )).

بەڵام ئەم بارودۆخە رێگر نابێت لەوەی کە بوترێت: ئەرستۆ ئەگەرچی پاساوی بۆ سیستەمی کۆیلایەتی هێناوەتەوە، لەگەڵ ئەمەدا (بەتایبەت لەدوا ساڵەکانی تەمەنیدا) مەرجگەلێکی داڕشت کە بەهۆیەوە هەندێك چاکسازی لەسیستەمەکەدا بکرێت و کەمێك لەبارقورسکردنەی سەر کۆیلەکان سوکدەکاتەوە، ئەرستۆ بانگەشەی ئەوەی دەکرد: کە دەبێ بەشێوەیەکی چاك هەڵسوکەوت لەگەڵ کۆیلەکاندا بکرێت و ئەو هیوای لەلا زیندوبکرێتەوە کە رۆژێك دێت ئازاد ببێت، وەك چۆن ئامۆژگاری ئازادکردنی کۆیلەی کردوەو لەوەسێتنامەکەیدا بڕیاریدا کۆیلەکەی ئازادبکات.[221]

---

220– فؤاد محمد شبل: سەرچاوەی پێشوو.. ل ١٢٩ .

221– الدکتور. عبدالحمید متولی: سەرچاوەی پێشوو.. ل ٧٦ .

## شەشەم: تیۆرەکانی ئەرستۆ لەبارەی شۆڕشەوە

ئەرستۆ لە"سیاسەت"دا بەئاراستەی تیۆرەکانی گۆڕانکاری سیاسیدا رۆشتووە کە دەبنە هۆی تێکدان یان چاککردنی کۆمەڵگەو، کتێبی هەشتەمی بۆ تاوتوێکردنی ئەم مەسەلەیە تەرخانکردووەو لەبەر رۆشنای روداوە مێژوییەکاندا هۆکانی شۆڕش و پاڵنەرەکانی لەشێوازەکانی حکومڕانیدا خستوەتەڕو، بۆ ئەوەی بەگریمانەیەکی گشتی بگات کە دەڵێت:

**(( هۆکاری سەرەکی لەپشت شۆڕشکانەوە بریتییە لەململانێی نێوان ئۆلیگارشی (دەوڵەمەندەکان) و دیموکراتەکان (ئەو هەژارانەی بایەخ بەبەرژەوەندی دەوڵەمەندەکان نادەن)).**

ئەرستۆ درێژە بەگریمانەکەی دەدات و دەڵێت:

**(( دیموکراسییەت لەو باوەڕەوە سەرچاوە دەگرێت کە ئەگەر خەڵکی لەئازادییەکاندا یەکسان بن، پێویستە لەگشت بوارو لایەنەکانی تریشدا یەکسان بن.. وەك چۆن لەسایەی سێستمی ئۆلیگارشیدا هەقیقەتێکی واقیعی هەیە: هەرکەسێك لەهەندێك رووە بەسەر ئەوانیتردا سەرکەوت، دێت زیاتر لەمافەکانی خۆیشی داوادەکات )).**

**(( هەریەك لەئۆلیگارشیو دیموکراسییەت.. جۆرێك لەدادوەریيان تێدایە،،ئەگەرچی لەباشترین جۆرەکانی دادوەریش نەبێت،،بۆیە ئەو بەشەی هەریەکەیان لەکاتی فەرمانڕەوایدا بەدەستی دەهێنن یەکسان نییە لەگەڵ بیروباوەڕەی کە پێش دەسەڵات گرتنەدەست هەیانبووە.. چونکە هەریەکەیان"دیموکراسی و ئۆلیگارشی" کارەکتەرەکانی شۆڕش دەجوڵێنن و حکومەتە دیموکراتەکان کەمتر لەحکومەتی ئۆلیگارشی روبەڕوی شۆڕش**

**دەبنەوە، چونکە گریمانەی هەڵایسانی تەنگوچەڵەمە لـەنێوان دەوڵەمەندەکانـدا دیاردەیەك نییە بەتەواوی بەدور بزانرێت )).[٢٢٢]**

بەواتایـەکی تـر، کارەکتـەری سـەرەکی شـۆڕش لەسـایەی هـەر سێسـتمێکی فەرمانڕەوایـدا بێـت بریتییـە لـە نایەکسـانی، سـەرەڕای دانپێێنـانی گشـت مەزهەبـە سیاسـیەکان (بـەجیاوازی نێوانیانـەوە) بەماف و یەکسانی رێژەیی هاوڵاتیان، کەچی لەکاتی جێبەجێکردنـدا لـەو بنەمایانـە لادەدەن، نایەکسـانی هەمیشـە فاکتـەری سـەرەکی شۆڕشـەکانە.. خـەڵکی شـۆڕش لـەپێناو هێنانـەدی یەکسـانیدا دەکەن.[٢٢٣]

لەراستیدا بیرۆکەی یەکسانی لەسەر بنەمای مافە سروشتییەکان بەتـەواوی لای ئەرستۆ نەناسراوە، بۆیـە چـەمکی یەکسـانی پێویسـتە لەروانگـەی بارودۆخـە سیاسـیو کۆمەڵاتییـە رێژەییـەکانی تـاك لەسـەردەمەکەیدا چارەسـەر بکرێـت.. حاڵـەتی نایەکسـانی لـەدوو روانگە زیاتری نییە" یان ئەوەتا کۆمەڵێکی هاوڵاتیان پێگەی سیاسی بـەرزیان هەیـە کـە لەگـەڵ پێگـە ئابورییەکانیانـدا گونجـاو نییـە، یـان بەپێچـەوانەوە ئیمتیـازاتی باشـی ئـابوری کاریگـەریان هەیـە بـەبێ بـوونی هـەمان ئەنـدازە لـەئیمتیازات لـەبواری سیاسـیدا، حاڵـەتی نەگونجان و هاوتانەبونە دەبێتە هـۆی هەستکردن بەنەبونی یەکسانی لەکۆمەڵگـەدا، چارەسـەری ئەم بارودۆخـە تـەنیا لەرێگـەی هەڵگیرسـانی

---

222- برتراند راسل: سەرچاوەی پێشوو.. ل ٣٠٥ .

223- ارسطو: السیاسة: سەرچاوەی پێشوو.. ل ٣٨٣ .. هاولاتیـان هەمـدیس بـەهۆی نارەزوومەندییان لەنایەکسانی و پێکانی سیاسیەکان هەڵدەچن کاتێک ئەمانیش هەمان مافەکانی ئەوانیتریان نییە یان کەمتر لەوانیتریان هەیە سەرباری ئەو فەزل و چاکەی دەیدەنە پاڵ خۆیان.. هەمان سەرچاوەی پێشوو.. ل ٢٨٧

شۆڕشی راستکردنەوە راستکردنەوەی بارودۆخی ئەو کەسانەوە دەبێت کە دەتوانن بەو کارانە هەڵسن.

کەواتە، شۆڕش هەڵناگیرسیٚ.. کاتێك نایەکسانەکان کار بەرێژە جیاوازییەکانی نێوان خۆیانەوە دەکەن، بەڵکو ئەو کاتانە دروست دەبێت کە تیایدا بارودۆخە سیاسییەکە لەگەڵ بارودۆخە ئابورییەکەی ناو یەك چینی کۆمەڵگەدا هاوتانابن و بارودۆخەکە هاندەری هەڵایسانی سیاسی دەبێت.

بەمجۆرە دەتوانرێت بیروڕاکانی ئەرستۆ دەربارەی شۆڕش و هۆکارەکانی لەم گریمانەدا پوختبکرێتەوە: گومانی دروستبونی شۆڕش ئەو کاتانە دێتە ئاراوە کە هێزە ئابورییەکان لەهێزە سیاسیەکان جیا ببنەوە.. ئەو دەوڵەتە هاوتایی لەژیانی ئابوریی‌و ژیانە سیاسییەکەیدا هەیە خاوەن سێستمێکی سەقامگیرو هاوسەنگ و دادوەرە، ئەم هاوتاییە سیاسی _ ئابورییە تەنیا ئەو کاتانە دێتەئاراوە کە تیایدا چینی مامناوەندی گەورە لەروی ژمارەو تواناو ئیمکانیاتەوە لەکۆمەڵگەدا بونیان هەبێت.[٢٢٤]

لەگەڵ ئەوەی ئەرستۆ لەخستنەڕوی هۆکارەکانی شۆڕشدا ئەوەی بۆ روننەکردوینەتەوە کە چ ئەندازەیەك لەجیاوازیی سیاسی _ ئابوریی حاڵەتی مەترسیدار لەهاوسەنگی سیاسیدا دێنێتەکایەوە، ئەمە رێگر نابێت لەوەی کە بڵێین: گریمانە پێوانەییەکەی ئەرستۆ

---

224– الدكتور. علي احمد عبدالقادر: سەرچاوەی پێشوو.. ١٦٥ .

دەربارەی پەیوەندی هێزە سیاسییەکان لەگەڵ هێزە ئابورییەکان لەسەدەکانی دواتردا دروستی خۆی سەلماندوە.[225]

هۆکارەکانی بەرگرتن لەهەڵگیرسانی شۆڕش لەبیری ئەرستۆ نەچوەتەوەو لەمبارەوە پێیوایە کە ئەگەر توانرا دەرك بەهۆکارەکانی تێکشانی دەستورەکان بکرێت، ئەو هۆکارانەش دەدۆزرێتەوە کە لەرێگەیەوە پارێزگاری لەو دەستورانە دەکرێت، لەگرنگترینی ئەو هۆکارانە: بڵاوکردنەوەی پڕوپاگەندەی حکومەتی لەپەروەردەی تازەپێگەیشتوانداو رێزگرتن لەیاساو دادوەریی لەجێبەجێکردنی یاساو لەکارگێڕیدا، واتە یەکسانی کە رێژەی تەندروست دەیخوازێت، هەر کەسێك بەمافەکانی خۆی بگات و باش دابەشکردنی سامانی وڵات و پێداچونەوەو هەڵگرتنی بەشی یەدەگی هەمیشەیی بۆ دەوڵەت.[226]

هەروەها مامەڵەی تەندروستی فەرمانڕەوا لەگەڵ هاوکارەکانیو لەگەڵ گشت هاوڵاتیان و دیاریکردنی ماوەیەکی دیاریکراو بۆ فەرمانڕەوایی.

بیروبۆچونەکانی ئەرستۆ دەربارەی شۆڕش بەتەواوی قوڵ و کاریگەر بووە، بەجۆرێك پاش تێپەڕبونی زیاتر لەدوو هەزار ساڵ لەئەزمونکاریو دوای ئەم گۆڕانکارییە گەورانەی بەدرێژای مێژوو بەسەر کۆمەڵگەای مرۆڤایەتیدا هاتووە، زۆر ئەستەمە شتێکی زیاتر لەوەی ئەرستۆ سەبارەت بەم بابەتە وتراوە.. ئەو پەندانەی ئەم

---

225- هەمان سەرچاوەی پێشوو.. ل ١٦٦ .. ئەرستۆ لێرەدا نەك هەر ئەفلاتۆن لەپێشترە، بەڵکو لەپێشی هەمو ئەوانەشەوەیە کە لەدوای ئەوەوە تاکو ئەمڕۆ هاتون، لەمەدا کەس رکابەری نییە.

226- ارسطو: السياسة: سەرچاوەی پێشوو.. ل ٤١٢-٤٢٢ .

فەیلەسوفە گەورە لەشۆڕشەکانی پێشوی خۆیەوە هەڵهێنجاون تاکو ئێستا رەوایەتی خۆیان وننەکردوە.

تیۆری شۆڕشەکان تا هەنوکە بابەتێکی فراوان و قورس و ئاڵۆزەو لەوانەیە رۆژێك بێت ئەرستۆیەکی تر بێت لەسەری بدوێ‌و لەچاوەڕوانی ئەو رۆژەدا دەبێت بچیتە قوتابخانەکەی ئەرستۆو تیایدا فێر ببێت، لەگەڵ گشت ئەو هەوڵە فیکرییە تێروتەسەلانەی خاوەنەکانیان بەهۆیانەوە ناوبانگیان دەرکردوە، هێشتا قوتابخانەی مەشائییە تەنیا قوتابخانەیە کە هەر کەسێك دەیەوێت تێڕوانینێکی گشتی لەبارەی شۆڕش و هۆکارەکانی‌و چارەسەرکردنییەوە هەبێت پێویستە سەرەتا لەو قوتابخانەوە دەستپێبکات.[٢٢٧]

---

227 لەپێشەکی: بارتلمی سانهلیر: السیاسة: سەرچاوەی پێشوو.. ل ٣٩-٤٠ .

# کۆماری ئەرستۆ

ئەرستۆ هەوڵی وێناکردنی دەوڵەتێکی چاکەخواز دەدات و بەشێکی گەورەی "سیاسەت"ەکەی بۆ ئەم هەوڵە تەرخانکردوە دەکات، ئەرستۆ لەوێناکردنی ئەم دەوڵەتەدا ئەم دەوڵەتەدا وەك ئەفلاتۆن بەرزەفڕ نییە، بەڵکو لەروانگەی توێژینەوەی وردی هەژدە جۆرەکەی سیستمی حوکمڕانییەوە دەستپێدەکات وئەو بلیمەتی و پسپۆڕییەی فەیلەسوفی بەکارهێناوە کە لەمیانەی میتۆدە بەراوردکارییەوە دەستی کەوتوە، ئەرستۆ گەیشتوەتە ئەو ئەنجامە: خەسڵەتی بنەڕەتی ئەم دەوڵەتە کردارییە چاکەخوازە دەستورەکەی (نمونەیی)یەو لەسەر بنەمای تێکەڵاوکردنی رەگەزە چاکەکانی هەردوو سیستمی دیموکراسیو ئۆلیگارشی دامەزراوەو (لەئەنجامی ئەم کۆکردنەوە) سیستمێکی نوێ دێتەکایەوەو ناوی سیستمی دەستوریی The Polity و هەندێکجار ناو سیستمی کۆماریی لێدەنێت.[٢٢٨]

لەپێناو بەدیهاتنی ئەم سیستمە دەستورییە، ئەرستۆ پێشنیازدەکات لەسەر بنەمای ئەم سێ هۆکارە رەگەزە چاکەکانی

---

[228] سەبارەت بەدیاریکردنی چەمکی سیستمی دەستوریی بڕوانە:
- Harmon, op. cit.. p 62-63.
- Ebenstein, William, op., cit.. p 29.

هەردوو سیستمی ئۆلیگارشی‌و دیموکراسی تێکەڵ بەیەکتری بکرێن[229]:

**یەکەم:**

وەرگرتنی چارەسەری مامناوەند لەنێوان پرەنسیپە دژەکانی هەردوو سیستمەکە: سیستمی دیموکراسی لەسەر بنەمای یەکسانی سیاسی دامەزراوە، تیایدا گشت هاوڵاتیان مافی بەشداریکردنی ژیانی گشتیان هەیە بەبێ داوای هی نەسابێکی داراییان لێبکرێت، لەکاتێکدا سیستمی ئۆلیگارشی چینی دەوڵەمەندەکان بەشداری سیاسی تایبەت دەکات بەو کەسانەی توانای دارایی بەرزیان هەیە، چارەسەری مامناوەندی ئەم حاڵەتە بەوە دەبێت بڕێك پارەی (کەم) دابنرێت وەك مەرج لەبەشداریکردنی ژیانی سیاسیدا.

**دووەم:**

کۆکردنەوە لەنێوان رێگەکانی هەردوو سیستمەکە لەدیاریکردنی فەرمانڕەواکاندا: لەسایەی سیستمی دیموکراسیدا دیاریکردنی فەرمانڕەوا لەرێگەی ناوڕاکێشانەوە دەبێت چونکە تەنیا هۆیە بۆ چەسپاندنی یەکسانی، کەچی سیستمی ئۆلیگارشی فەرمانڕەوا لەرێگەی هەڵبژاردنەوە دیاریدەکات، کۆکردنەوە لەنێوان هەردوو شێوازەکەدا لەوەدایە لەپۆستەکانی دەسەڵات بەهەڵبژاردن و هەندەکەی تری بەناوڕاکێشان دیاری بکرێن، یاخود تێکەڵکردنی هەردوو شێوازەکە لەدیاریکردنی سەرجەمی وەزیفەکاندا، سەرەتا زۆرترین رێژەی وەزیفە شاغیرەکان لەرێگەی هەڵبژاردنەوە

---

[229] بڕوانە: ارسطو: السیاسة: سەرچاوەی پێشوو.. لا ۳۲۱-۳۲۳ .. لەگەڵ:
- Mchonald, op., cit.. 61-62.

دیاریدەکەین و ئنجا وەزیفەکان بەرێگەی ناوڕاکێشان بەسەر کاندیدەکاندا دابەشدەکەین.

**سێیەم:**

یەکێك لەخەسڵەتە گرنگەکانی سێستمی دیموکراسی، ئەوەیە ئەرکە گشتییەکان بەکرێ بێت، ئەگینا هاوشێوەی سێستمی ئۆلیگارشی ئەو ئەرکانە قۆرخ دەبون بەسەر دەوڵەمەندەکاندا، بەمجۆرە سێستمە دیموکراسییەکان وەك هۆیەك بۆ هاندانی هەژاران لەئامادەبونی کۆمەڵە گشتییەکاندا پاداشتی ئامادەبونیان پەسەندکردوە، ئەمە لەکاتێکدایە لەسایەی سێستمی ئۆلیگارشیدا باج لەو دەوڵەمەندانە وەردەگیرا کە لەکۆبونەوەکاندا ئامادە نەدەبون.. واتە سێستمی دیموکراسی کار بۆ بەشداری هەژارەکان دەکات لەکۆبونەوەکانی کۆمەڵەی گشتیداو ئەمەش لەرێگەی پاداشتکردنیان لەبەرامبەر ئەو ئامادەبونەدا بەبێ ئەوەی دەوڵەمەندەکان ملکەچی ئامادەبون بکات، جیاواز لەسێستمی ئۆلیگارشی کە دەوڵەمەندەکان ناچاردەکات ناچاردەکات بەشداری لەتاوتێکردنی کاروبارە گشتییەکاندا بکەن و باجی لەسەر ئەو دەوڵەمەندانە داناوە کە ئامادەی کۆبونەوەکان نابن، لەبەرامبەردا هیچ بایەخێك بەئامادەبونی چینە هەژارەکە نادات و هەر کەسێکیش لەو چینە ئامادە نەبێت هیچ جۆرە غەرامەیەکی لەسەر نییەو هەروەها هانی بەشداربون و ئامادەبونیان نادات، بەڵکو لەوانەیە بەتەواوی لەمافی بەشداربون لەژیانی سیاسیدا بێبەشیان بکات.

بەبڕوای ئەرستۆ چارەسەری گونجاو کە هاوسەنگی لەنێوان هەردوو ئاراستەکەدا دروستدەکات ئەوەیە: باج لەسەر

دەوڵەمەندەکان دابنرێت ئەگەر هاتوو ئامادەی کۆبونەوەکانی کۆمەڵەی گەل نەبون و پاداشتی هەژارەکان بکرێت لەبەرامبەر ئامادەبونیان لەو کۆبونەوانەدا.. بەمجۆرە بەشداریکردنی هەردوولا مسۆگەر دەبێت، هەرچی ئەرکە گشتییەکانە ئاساییە بەکرێ بدرێن بەڵام بەبێ زیادەڕەوی.

ئەرستۆ لەسەر بنەمای ئەم تێکەڵکردنی هەندێك لەرەگەزەکانی سیستمی دیموکراسیو هەندێك رەگەزی تر لەسیستمی ئۆلیگارشی دەستورە نمونەییەکەی دارشتوەو بۆ هێشتنەوەی هاوسەنگیو بەدیهێنانی گونجاوی لەنێوان پرەنسیپە دژیەکەکانی هەردوو سیستمەکەدا، ئەرستۆ هۆیەکی چالاکی دۆزیوەتەوە کە بریتییە لەکارکردن بەچارەسەری مامناوەندە، بەڵام ئەمەش ئەوە ناگەیەنێت ئەم سیستمە نوێیە کە بەرئەنجامی هەردوو سیستمەکەی ترە بەکەڵکی گشت دەوڵەت و گشت بارودۆخێك دێت.

ئەرستۆ لەو بڕوادا بووە، دەستوری نمونەیی بەجیاوازی دەوڵەتەکان و جیاوازیی ژینگەو بارودۆخی ئابورییو کۆمەڵایەتیو جوگرافیو هەروەها بەگوێرەی سروشت و مێژوو و ئەخلاقی گەلان جیاوازەو گۆڕانی بەسەردا دێت.[230]

---

230 – دکتور حامد ربیع لەمبارەوە دەڵێت: ئەرستۆ دەیەوێت تەنیا بەوە دەست هەڵگرێت کە رێرەوی رونکردنەوەی باشترین بارودۆخ بگرێتەبەر کە بوار بۆ گەیشتن بەکۆمەڵێکی بەختەوەر هەمواربکات، واتە کۆمەڵێک کە لەتوانایدایە لەرووە سیاسیو ئابوورییەکەوە یەکخستنێک لەنێوان بەرژەوەندییە دژەکاندا دروست بکات، وەک چۆن توانیویەتی لەرووە مەعنەوییەکەوە یەکخستن لەنیوانیاندا دروستبکات.. بەمشێوە ئەرستۆ وەسف دەکەین بەوەی کە یەکەمین کەسە دارشتنێکی فیکریی ئەوتۆمان پێشکەش بکات کە ئەمڕۆ ئێمە بەرێژەیی سیاسی ناویدەبەین، لەوانەیە لەبەندەکانیدا رون و ورد نەبێت و لەوانەیە

ئنجا ئەو دەستورەی بۆ وڵاتێك دەست دەدا، لەوانەیە بۆ وڵاتێکی تر کە بارودۆخێکی جیاوازی هەیە دەستنەدات.

بەڵام باوەڕهێنانی ئەرستۆ بەرێژەگەرایی بەدەر نەبووە لەجەختکردنەوەی لەسەر ئەوەی کە باشترین و نزیکترین سێستم لەکاملبونەوە ئەو سێستمەیە کە هاوسەنگی لەنێوان هەردوو سێستمی دیموکراسیو ئۆلیگارشیدا دروستدەکات و لەنێوانیاندا چارەسەری مامناوەند هەڵدەبژێرێت، بەواتایە کە ئەرستۆ وەك ئەفلاتۆن سێستمی تیکەڵی بەلاوە پەسەندەو، بنچینەی سێستمەکە ناوەندگریی چاك یان دادوەرە.[231]

لەپێناو بەدیهاتنی بیرۆکەکەی لەم ناوەندگرییە چاکدا ئەرستۆ چینی مامناوەندەی بەکۆڵەکەی سەرەکی سێستمەکەو بنچینە کۆمەڵایەتییەکەی داناوە، لەبەرئەوەی میانڕەویی‌و ناوەندگریی لەباشترینی شتەکان و، چینی مامناوەند باشترینی ئەو چینانەیە کە دەکرێت حوکمڕانی دەوڵەتی بخرێتەئەستۆو ئەندامەکانی ئەم چینە لەئەندامی گشت چینەکانی تر زیاتر ئامادەی گوێبیستی دەنگی عەقڵ بن و هەمیشە ئامادەی پەند وەرگرتنن، بەپێچەوانەی چینە هەژارەکەوە کە بەهۆی هەژارییەوە توانای دەرککردن و وشیاری

---

نەتوانین لەبیرۆکەکانی ئەرستۆ تیۆرەکی کامڵ لەبارەی چەمکی رێژەیی پوخت بکەینەوە، بەڵام ئەوەی جێگەی گۆمان نییە ئەرستۆ بڕوای بەپرەنسیپی چالاکیی فرەیی سێستمە سیاسییەکان هەیە، بەڵکو گەیشتوەتە ئەو بڕوایەی کە پێی وابێت سەرباری نکۆڵیکردنی لەسێستمی پاشایەتی بڕوای بەچاکسازیی‌و چالاکی ئەم سێستمە هێناوە لەبارودۆخی دیاریکراوداو بەتایبەت لەماوەی قۆناغە سەرەتاییەکانی دروستبونی دەوڵەتدا.. بڕوانە: الدکتور. حامد ربیع: ابحاث فی النظریة السیاسیة: سەرچاوەی پێشوو.. لا ١٤٥-١٤٦ .

231- Mcdonald, op., cit.. p 62.

تەندروستیان نییەو، هەروەها بەپێچەوانەی چینە دەوڵەمەندەکەوە کە دەوڵەمەندییەکەی کوێری کردوە.[٢٣٢]

دەوڵەمەندەکان ئارەزوی یاخیبون و توندوتیژی دەکەن و هەژارەکانیش ئارەزوی درۆکردن لەبەرئەوەی لەمنداڵییەوە لەبەندەکانی یاسا بێبەشکراون و بەدەست بێبایەخیو هەژارییو زەرورەتەوە کە تیایدا لەدایکبون، ناڵاندویانە. بۆیە بەکردەوە هەردوو چینەکە (هەژارو دەوڵەمەند) لەتوانایاندا نییە بەشێوازێکی تەندروست حوکمڕانی کۆمەڵگا بکەن و، ئەگەر هاتوو بواری فەرمانڕەواییان بۆ ڕەخسا سەرباری توانای ماددی لەلای هەردوو چینەکە ئاکامەکەی دەسەڵاتێکە هاوشێوەی دەسەڵاتی سەردار بەسەر کۆیلەکەیدا، لەکاتێکدا کۆمەڵگای سیاسی لەسەر بنەمای هاوکارییو تەشەنکردنی دۆستایەتی لەنێوان ئەندامەکانیدا دروستدەبێت و پێویستە ئەندامەکانی تا زۆرترین ئەندازە لەئازادیی بەهرەمەند بن.. چینی مامناوەند جیاواز لەچینەکانی تر گشت ئەم خەسڵەتانەی تێدایە.[٢٣٣]

ئەگەر ئەرستۆ چینی مامناوەندی کردبێتە کۆڵەکەی سیستمی دەستورییو پایەکانیو پێوەرێکی تایبەتمەندی بۆ دانابێت: زۆرو کەمی ژمارەی ئەندامەکانی، بەرژەوەندییە ئابورییو پێشکەوتنی بوارە ڕۆشنبیرییەکەی، بەهەمانشێوە چوار مەرجی دیکەی داناوە بۆ

---

232- Kinand, Mcgilvray, Political and Social Philosphy, op., cit.. p 52.

233- بڕوانە: الدکتور. علی احمد عبدالقادر: سەرچاوەی پێشوو.. ل ١٥٢-١٥٣ .

بەشداری پێکردنی هاوڵاتیان لەدەسڵاتی سیاسی لەسایەی ئەم سێستمەداو مەرجەکان بریتین لە[234]:

١. **مەرجی رەگەزو تەمەن**: هاوڵاتی شیاو بۆ لەئەستۆگرتنی دەسڵات گەیشتوەتە تەمەنێك کە ناوی لەتۆماری مەدەنیدا نوسرابێت، جگە لەو پیرانەی کە ناویان لەو تۆمارەدا سڕاوەتەوە: کە هاوڵاتی ناتەواون و یان ئەوەتا خانەنشینکراون، لێرەوە دەردەکەوێت ئەرستۆ پێچەوانە مامۆستاکەی (ئەفلاتۆن) ئافرەتی لەمافی دەسڵاتگرتنە دەست بێبەشکردوەو فەرمانڕەوایی کردوەتە ئیمتیازێك بۆ تەمەن، واتە فەرمانڕەوایی تایبەتکردوە بەگەورەکان و گەنجەکانی پابەندی گوێڕایەڵی کردوە تائەو دەمەی پێدەگەن.

٢. **مەرجی رەگەزنامە**: هاوڵاتی ئەو کەسەیە کە لەدایك و باوکی هاوڵاتی لەدایکبووە، فەراهەم نەبونی مەرجی هاوڵاتیبون لەیەکێك لەدایك و باوکەکاندا دەبێتە هۆی ئەوەی منداڵەکەیان مافی هاوڵاتیبونی پێنەبڕێت.

٣. **مەرجی ئازادیی**: هاوڵاتی پێویستە ئازاد بێت، ئنجا ئەرستۆ ئەوەی بەدوری زانیوە کۆیلەکان ئیدارەی ئیشوکارەکانی شار لەئەستۆ بگرن.

٤. **مەرجی دارایی**: یان توانای بەخێوکردنی ئەوانیتر" هاوکات ئەرستۆ بەدوری زانیوە (بێجگە لەکۆیلەکان) بازرگان و پیشەوەرو جوتیارەکان ئیدارەی شار بگرنەدەست، چونکە ئەمانە ئیشوکارێك ئەنجام دەدەن کە بەسروشت لەئیشوکاری کۆیلەکان دەچن،

---

234- بڕوانە: ارسطو: السیاسة: سەرچاوەی پێشوو.. ل ١٨٢-١٨٣.

لەکاتێکدا پێویستە هاوڵاتی بەئەندازەیەك دەست ڕۆیشتو بێت بواری ئەوەی هەبێت دەستبەرداری کاری دەستی ببێت، بۆ ئەوەی هەلی تێڕامان و بیرکردنەوە لەکاروبارەکانی شاری بۆ بڕەخسێت.

کەواتە ئەرستۆ دەوڵەمەندی بەمەرجێك داناوە لەبەردەم ئەو کەسانەی کە دەسەڵات دەگرنەدەست، مەبەست لەم دەوڵەمەندییە ئەوەیە کە فەرمانڕەوا هێندە سەروەت و سامی هەبێت بواری بۆ بڕەخسێنێت تەنیا بایەخ بەکاروبارەکانی شارو بەدەستهێنانی فەزیلە بدات و بەبێ ئەوەی سامانەکە هێندە زۆر بێت ڕێگری بێت لەجێبەجێکردنی ئەرکەکانیدا.

بۆ تەواوکردنی وێنەی گشتی کۆمارەکەی ئەرستۆ، پێویستە ئاماژە بەوەش بکرێت کە ئەرستۆ کەمترین ڕێژە بۆ ژمارەی دانیشتوان دادەنێت کە نابێت ژمارەی دانیشتوانی دەوڵەت لەو ڕێژەیە کەمتر بێت، تا لەتوانایدا بێت لەپڕکردنەوەی پێداویستییەکانیدا پشت بەخۆی ببەستێت و بەوەی هاوڵاتیانی ئەو کۆمەڵگە (نمونەیی)یە لەدیاریکردنی فەرمانڕەواو کارمەندەکانیدا بەشداردەبن، وا پێویست دەکات بیاناسن تاوەکو بتوانن لەناویاندا کەسانێك هەڵبژێرن، ئنجا وا دەخوازێت ژمارەی دانیشتوانی کۆمارەکە لەسنورێکی دیاریکراودا رابگیردرێت و نابێت ئەو ڕێژەیە تێپەڕێنێت، چونکە جۆرێکە لەپاشەکشێ لەبارودۆخە نمونەییەکە، سەرەڕای ئەمانە ژمارەیەکی دیاری نەکردوە وەك ڕێژەی باڵا یان کەمترین ڕێژە بۆ ژمارەی دانیشتوان.[٢٣٥]

---

235- هەمان سەرچاوەی پێشوو.. ل ٢٤٧ و ٢٦٤ .. هەروەها:
- Foster, op., cit.. p 168-189.

پێویستە ئەوەش رونبکرێتەوە کە ئەرستۆ باس لەدەوڵەتی نەتەوەیی ناکات وەك ئەم چەمکە هاوچەرخەی هەنوکە لەئارادایە، بەڵکو هەموو بیرکردنەوەیەکی لەچوارچێوەی ئەو دەوڵەتە شارەدا چڕکردوەتەوە کە هاوسەردەمی بووە، سەبارەت بەشوێنی جوگرافی دەوڵەتەکە ئەرستۆ پێشنیاز دەکات دەوڵەتەکە لەجێگەیەکدا بێت دەروازەیەکی ناخۆشی هەبێت بۆچونە ژورەوەی دوژمنان و دەرزاوەیەکی ئاسانی هەبێت بۆ دەرچونی هاوڵاتیان و بەئاسانی بتوانرێت چاودێری بکرێت و لەهەردوو سنوری دەریاییو وشکانییەوە وەکیەك نزیك بێت.[٢٣٦]

لەئاکامدا دەمانگەیەنێتە هەوڵی ناسینی دیارترینی خاڵەکانی جیاوازیو وەکیەکبونی بیرو میتۆدی هەریەك لەئەرستۆو ئەفلاتۆن:

بوارەکانی لێکچون و یەکگرتن رەنگدانەوەی زیاتر لەهەقیقەتێکە: لەبواری یەکەمدا تێبینی دەکرێت ئەرستۆ وەك مامۆستاکەی خاڵی سەرەتای نوسینەکانی بەگەڕان بەدوای ئیدیاڵدا دەستپێکردوە، وەك چۆن دەبینین هەریەك لەو دوو فەیلەسوفە وێنەی دەوڵەتێکی ئیدیاڵمان نیشاندەدەن کە ئامانج لێی بەدیهاتنی بەختەوەرییە لەژیانی کۆمەڵدا، لەگەڵ ئاماژەکردن بەوەی کە بەدیهاتنی ئەم دەوڵەتە بەندە بەبەرقەرابونی ئەو دادوەرییو چاکەی لەرێگەی فێربونەوە دابیندەکرێت و دەوڵەت لەسەریەتی ئەو فێربونە لەئەستۆبگرێت.

---

- Blum, William, T. op.. cit.. p 60.

236– بڕوانە: ارسطو: السیاسة: سەرچاوەی پێشوو.. لا ٢٥١ .. ئنجا بەراوردی بکە لەگەڵ: جان توشار: سەرچاوەی پێشوو.. لا ٣٩ .

لەلایـەکی دیکـەوە هـەردوو فەیلەسـوف لەسـەر ئـەوە کـۆکن کـە ژیـانی بەختـەوەری تەندروسـت بەدینایـەت ئەگـەر لەچوارچـێوەی دەوڵەتی شارەدا نەبێت، ئەو دەوڵەتەی دەسڵاتی داوەتە دەست زاناو فازیلەکان و، لەبەرئەوەی فەزیلە شتێکە نییە هەموان لێی بەهرەمەند بـبن و قۆرخـە بـۆ کۆمەڵـە کەسێك جیاواز لـەوانیتر.. وای پێویسـت کـردوە خەسـڵەتەکانی هاوڵـاتیبون پەیوەسـت بکـرێن بەمەرجگـەلێکی دیـاریکراوەوە کـە لـەتواناداا بێـت (بەبۆچـونی ئەرسـتۆو ئـەفلاتۆن) بیرۆکەی هاوڵاتی چاك لەدەوڵەتی چاکدا بەئەنجام بگەیەنێت.

**بونی ئەم لێکچونانە لەنێوان ئەم دوو فەیلەسوفەدا بەمانای ئەوە نایەت کە جیاوازیی لەنێوانیاندا نییە:**

١. ئەرسـتۆ بەپێچـەوانەی ئەفلاتۆنـەوە بـاوەڕی بەمیسـالییەتی رەهـا نـەبووە، یـان بـەدەر لـەوە ( میسـالییەت) هـەموو شـتەکانی تـر بـەخراپ و گەنـدەڵ لەقەڵـەم بـدات، بـەڵکو جیـاوازیکردوە لـەنێوان میسـالییەتی رەهـاو میسـالییەتی رێژەییـدا، ئـەو میسـالیەتە رێژەییـەی کـە دەکرێـت لەچوارچێوەی واقیعدا بێتـەدی‌و بنچینـەی سێسـتمە سیاسـیەکەی لەسـەر بنـەمای ئـەم چـەمکە داڕشـتوە، کەواتە دەتوانرێت بوترێت کە ئەرسـتۆ بایەخی بەو شـتانە داوە کـە لەئارادان زیاتر لەو شتانەی کە دەبێت بێنە ئاراوە، بەواتایـەکی تـر لەبری ئەوەی ئەمیش وەکو ئەفلاتۆن بەشوێن دەوڵـەتێکی ئیدیاڵـدا بگەڕێت هەوڵیداوە وێنەیەکی پراکتیکیمـان بـداتێ لـەبارەی ئـەوەی کـە دەشـێت شـارێکی یۆنـانی لەسـەری بـڕوات، ئنجـا ئەرسـتۆ لەشـاری یۆنانـدا روبـەڕوی کێشـەی سیاسـی هاتوەتـەوە، بۆیـە

کارامەیی‌و پسپۆڕی کردوەتە خاڵی سەرەتا لەو توێژینەوانەی پێشکەشی دەکردن، نەك خەیاڵ یان بەدەربون لەواقیع.[237]

٢. ئەرستۆ لەو بڕوادا بووە کە چاکترین سێستم لەوڵاتێکەوە بۆ ولاتێکی تر بەپێی بارودۆخی جوگرافی‌و ئابوریی‌و بەگوێرەی سروشت و ئەخلاقی ئەو گەلانەی لەچوارچێوەی ئەو دەوڵەتەدا دەژین، جیاوازە. بۆیە زۆرێك لەسێستمە سیاسیەکانی بەشێوەیەکی رێژەیی بەلاوە چاك و پەسەند بووە، لەکاتێکدا ئەفلاتۆن روبەڕوی ئەم بیربۆچونە دەبێتەوەو داوا دەکات: تەنیا یەك شێوە لەسێستمی ئیدیاڵ هەبێت بەبێ گوێدانە گۆڕانی بارودۆخ و هەمەچەشنەیی وڵاتان.

٣. ئەرستۆ بڕوای بەزۆرینە هەیەو بەلایەوە رای زۆرینە بەسەر رای تاکدا زاڵدەبێت، ئەگەرچی ئەو تاکەکەسە بەهەر ئەندازەیەك خاوەن دانایی‌و مەعریفە بێت و، هاتووە چینی مامناوەندی کردوەتە کۆڵەکەی سەرەکی سێستمە سیاسیەکەی.. بەڵام ئەفلاتۆن بنچینەی کۆمەڵگە سیاسیەکەی لەسەر دیکتاتۆریەتی تاکی عاقڵ یان ژمارەیەکی کەم لەتاکە عاقڵەکان بونیادناوە.

٤. ئەرستۆ نکۆڵی لەو پەیوەندییە هۆکارییە دەکات کە هاوڵاتی چاك بەشاری چاکەوە دەبەستێت، ئەوەی ئەفلاتۆن لە"کۆمار"ەکەیدا باسیکردوەو پێیوایە تاك بریتییە لەبونەوەرێکی سیاسی و لەبونەوەرەکانی تر جیاوازە بەوەی ئینتیمای بۆ شار هەیەو، شار بەم مانایە دوایەمین قۆناغی پەرەسەندنی کۆمەڵایەتی

---

237– بڕوانە: الدکتور. حامد ربیع: ابحاث فی النظریة السیاسة: سەرچاوەی پێشوو. ل ١٤٣.

درێژخایەنە بۆ ئەو یەکەی کە تاك لەسەریەتی لەخێزانەوە بۆ هۆز پەیوەندی پێوە بکات و، لەهۆزیشەوە بۆ گوندو ئنجا لەگوندەوە بۆ شار، هونەری سیاسەت هیچ نییە جگە لەتێگەیشتنی تاك و شار لەروی پەیوەندییان بەیەکترەوە، واتە سەربەخۆبونی یەکێکیان بەهۆی ئەویتریانەوە.

ئەگەر زیادەیەك هەبێت، پوختەکەی ئەوەیە ئەرستۆ کولتورێکی فیکریی گەورەی بۆ بەجێهێشتوین، یاسای گشتی لەزۆرێك لەبیروڕاو تیۆرکانیدا قەرزاریەتی: ئەرستۆ لەریشاڵی دەوڵەت و پایەکانی کۆڵیوەتەوەو دیراسەی ئامانجەکان و ئەو هۆکارانەی کردوە کە دەکرێت بەهۆیانەوە ئەو ئامانجانە بێتەدی.. جۆرە جیاوازەکانی حکومەتی شیتەڵکردوەتەوە و چارەسەری تەنگوچوڵەمە سیاسیەکان و رێگەکانی چارەسەرکردن و ئەو هۆکارانەی کردوە کە دەشێت رۆڵیان هەبێت لەروخانی رژێمێکدا.

وەك چۆن میتۆدی لێکۆڵینەوەی سیاسی قەرزاری ئەرستۆیە، باشترین کەسە گوزارشتی لەلایەنە داینامیکیو وەزیفییەکانی ئەم بوارە کردوەو یەکەمین کەسە رێگەی لێکۆڵینەوەی ئەزمونگەرایی بەراوردکاریی داهێناوە.

## سیماکانی بیری سیاسی پاش ئەرستۆ

هاوکات لەگەڵ داننان بەو بەشدارییە فیکرییەی هەریەك لەئەفلاتۆن و ئەرستۆ پێشکەشیان کردوین، ناکرێت ئەوە لەبیربکرێت ئەو بیروبۆچونانە تایبەت بوون بەدەوڵەتی شار City State، بەو پێیەی وێنەی نمونەیی دەوڵەتە یان تەنیا دامەزراوەیە تواناکانی تاك پەرەپێبدات و وێنەی شارستانی پێشکەوتوو پێشکەش بکات.

بێگومان ئەو گریمانانەی فەیلەسوفەکانی یۆنان پێشکەشیان کردوین، وا وێنای ئەو شارە زۆرانە کراوە کە لەتوانایاندایە بەرەنگاری گشت ئەو ململانێ (ناوخۆو دەرەکی) ببنەوە کە روبەڕویان دەبێتەوەو لەتوانایاندایە بەبێ پەنابردنە بەر هاوکاری دەرەکی پشت بەخۆیان ببەستن.

ئەمەش بەو مانایە" پرەنسیپی دابڕاویی کە روانگە تیۆرییەکان ئەوانەی چارەسەری گرفتەکانی ئەو شارانە کردوە لەگەڵ سروشتی ژیانی سیاسی تیایاندا سەپاندویەتی، بەڵام ئەم پرەنسیپانە (کە کاریگەریی فاکتەرە دەرکییەکان لەسەر رەوتی ژیانی ئەم شارانەیان پشتگوێ خستوەو گەشەسەندنی ئەو شارانەو زیادبونی پێداویستییەکانی لەبەرچاو نەگرتوە کە ناچاریان دەکات لەگەڵ ئەوانیتر یەکبگرن بەمەبەستی روبەڕوبونەی ئەو پێداویستیانە) نەیانتوانیوە واقعیبونی خۆیان بسەلمێنن، بەرە بەرە لەژێر زەبری ئەو کێشانەدا روبەڕوی شارە دەوڵەت دەبونەوە لەلایەك و ئەو شاڵاوە بیرییە نوێیانەی لێکەوتەی داگیرکارییەکانی ئەسکەندەری مەکدۆنی

که جیهانی دەرەوەی ئەتینای گرتەوە: ئاسیای بچوك، سوریا، میسر، بابل، وڵاتی فارس، سەمەرقەند، بنجاب.. لەلایەکی دیکەوە.[238].. دەوڵەتە شارەکان بەرەو پاشەکشەو پوکانەوە رۆشتن.

کێشە ناوخۆییەکان یەکێك بوو کارەکتەرانەی رۆڵیان هەبووە لەو ئاوابونە کاتییەی فەلسەفەی سیاسی یۆنان دوای ئەرستۆ دوچاری بووە، بەجۆرێك بیروباوەڕەکانی ئەفلاتۆن و لەدوای ئەو ئەرستۆ پشکیان هەبووە لەوەی هاوڵاتیبون لەدەوڵەتی شاردا ئیمتیاز بێت بۆ ئەوانەی کات و سامانی ئەوەیان هەیە بەهرەمەندیان بکات بۆ لەئەستۆگرتنی ئەرکە سیاسیەکان، چەمکی ئەخلاقی دەوڵەتی شار قۆرخ بووە بۆ کەمینەیەك لەخەڵکی، نەك جەماوەری پیشەسازو جوتیارو کرێکار، ئەم بیروباوەڕانە رۆڵیان هەبووە لەهاندانی ئەمانەی دوایین ( پیشەسازو جوتیارو کرێکار) لەگەیشتن بەو بڕوایەی کە دەوڵەتی شار ئەو نمونەیە کە پێویستی بەچاکسازیی‌و چاککردن نییە، بەڵکو پێویستی بەگۆڕین و گۆڕانکاری تەواو هەیە.

لەم بوارەدا شاڵاوەکانی ئەسکەندەری مەکدۆنی لەروی کاریگەرییەوە هیچی کەمتر نەبووە لەرۆڵی کێشە ناوخۆییەکان: لەئاکامی ئەم شاڵاوانە بیروباوەڕێك هاتەئاراوە" رەگەزی مرۆیی یەکەیەکی دانەبڕاوە لەیەکتر، و چیتر ئەو دڵسۆزییە کۆنە نەما بۆ دەوڵەتی یەك شار، یان دڵسۆزی (بەپلەیەکی کەمتر) بۆ رەگەزی یۆنانی لەبەرژەوەندی سەردەمی نوێ.

---

238– سباین: سەرچاوەی پێشوو.. ل ١٥٩ .. سەبارەت بەشاڵاوەکانی ئەسکەندەری مەکدۆنی بڕوانە:
- Reither, Joseph, World history: Abrief introduction, MCGrow, Hill Book Co., N.y., 1973, P 61-62.

ئەم تیۆرە نوێیە بووە هۆی کارلێکی یۆنان لەگەڵ رەگەزەکانی تر (بەربەرەکان).. (( ئەمانە شتێکی زۆریان لەزانستەکانی یۆنان وەرگرتووەو یۆنانەکانیش زۆریان لەئەفسانەکانی بەربەر وەرگرت. بەمجۆرە شارستانییەتی یۆنانی هاوکات لەگەڵ بڵاوبونەوەی لەروبەرێکی فراوانتردا لەروی ناوەڕۆکەوە مۆرکە یۆنانیەکەی روی لەکاڵبونەوە کرد.))[٢٣٩]

سیاسەتی ئەسکەندەری مەکدۆنی کە لەسەر بنەمای تێکەڵکردنی شتە یونانیو شتە غەیرە یۆنانیەکان بونیات نرابوو، بووە هۆی لەدەستدانی سەربەخۆی زاتی دەوڵەتە شارو دانیشتوانی ئەم شارانە (بەم پێیە) چیتر توانای ئەوەیان نەما ئەرکەکانی حوکمڕانی لەئەستۆ بگرن و دواجار هەستی نیشتمانی گریکییان لاواز بوو، ئەمەش بووە هۆی دابڕانی تاك لەدەوڵەت، گریکەکان پاش گواستنەوەی حوکمڕانی بۆ پایتەختە بیانیەکان (ئەوانەی یۆنانی نەبوون) ناچاربون بەشوێن بوارەکانی چالاکی لەدەرەوەی چوارچێوەی دەوڵەتدا بگەڕێن و فەلسەفە سیاسیدا لەم سەروبەندەدا جەختی لەسەر ئەو هۆیانە دەکردەوە کە تاك لەمیانەیەوە لەبری بایەخدان بەخۆشگوزەرانی گشتی بەختەوەری بۆ خۆی بەدەستبهێنێت، واتە لەروانگەی نەبونی پەیوەندی لەنێوان تاك و خۆشگوزەرانی کۆمەڵایەتیداو دەوڵەت هیچ زەرورەتێکی نییە لەبەدیهاتنی ژیانی بەختەوەردا" بواری گرنگیپێدان لەدەوڵەتەوە گوازرایەوە بۆ تاك.

ئەم سیفەتە (جیهانییە) لەم سەردەمەدا رەنگدانەوەی لەسەر بیری فەلسەفی هەبوو، بەم پێیە لەبری نیشتمانییەتی شار پشت

---

239– بڕوانە: برتراند راسل: سەرچوەی پێشوو.. ل ٣٥٢ .

بــەجيهانيبون Universalismو تاكگــەرايى Individualism بەسترا، سنورێك بۆ جياكردنەوە لەنێوان گريكىو بەربەرىو، لەنێوان شارێك و شارێكى تردا داناو تاكەكەس خۆى بەهاوڵاتى جيهانى يان تــاكى ســەربەخۆ لەيــەكتر دادەنــا كــە خــەريكى بەرژەوەندييــە تايبەتييەكانى خۆيانن.[240]

لەكاريگەرييــەكانى ئــەم گۆڕانــە بيرۆكــەى مــرۆڤ زينــدەوەرێكى سياسيە لەناوچوو، ئەو بيرۆكەى دەوڵەتى شارى پىٚ جيادەكرايەوەو لەجێگەيــدا بيرۆكــەى" مرۆڤــى تــاك پێويســتى بەرێكخســتنى پەيوەندييەكانيەتى لەگەڵ گشت ئەو تاكەكەسانەى كە جيهانيان لىٚ پێكهــاتوە، هاتــەئاراوە. مــرۆڤ فێــرى ئــەوە دەبــوو كــە چــۆن لەگــەڵ ئــەوانيترو لەچوارچــێوەيەكى گــەورەتر لەدەوڵــەتى شــاردا بــژى، لــەو چوارچێوەدا كە پەيوەندييــە مرۆييــەكانى لەســەر بنــەماى ناشەخســى بەرێوەدەچێت.[241]

دەركەوتنى ئەم بيرۆكە نوێيانە كە هاتنەكايەى يەكسانى تەواوى نێــوان تاكــەكان لەناويانــدا كۆيلــەو بەربــەرىو خــاوەنى پيشــە دەستييەكانى لێكەوتــەوە، بــەدەر نييــە لەدوپاتكردنــەوەى ئــەوەى كــە هەوڵــەكانى پشــتهەڵكردن لــەكۆن، نــاڕەزايى دەربــڕين لــەدژى لەئــەنگيزەى كۆتاييــدا لــەوڵاتى گريــك بــووەو، لــەديارترين ئــەو هەوڵــە فەلســەفيانە كــە هەريــەك لــەم قوتابخانانــە: كەلبىيــەكان و ئەبيقۆرييەكان و رەواقيەكان پێشكەشيان كردوين:

---

240- Gettell, op., cit.. p 56.

241- بڕوانە: الدكتور. بطرس غالىو الدكتور. محمود خيرى عيسى: سەرچاوەى پێشوو.. ل ٧٤ .

## یەکەم: قوتابخانەی کەلبی

ناڕەزایی زۆر توند دەربڕین لەدژی بنەماکانی دەوڵەتی شار لەلایەن ژمارەیەك لەرۆشنبیران کە لەمیانەی رەگەزیی بیانی لەئەتینا سەریان هەڵدابوو و بە ناوی کەلبیەکانەوە Cynics ناسرابوون.[٢٤٢]

ئەم قوتابخانە بەخاڵی پەیوەستی نێوان سۆکرات و رەواقییەکان یان نێوان فەلسەفەی تەواو گریکی لەسەدەی چوارەمی پێش زایین و سێستمی فیکری دادەنرێت، لەسەدەکانی ناوەڕاست و تا بەسەردەمی نویٚ دەگات کاریگەری قوڵی لەسەر ئەخلاقیات هەبوو.[٢٤٣]

بنەماکانی قوتابخانەی کەلبی (لەمیانەی دامەزرێنەرەکەی دیۆجینیز Diogenes) کە لە ئەنتیستنیس Antisthenes[٢٤٤]ی

---

242ـ بەوردی ئەو هۆیە نازانرێت کە چۆن قوتابخانەی کەلبی لەسەر ئەو ناوە خۆی دامەزراندوە، پێدەچێت ناوەکە بۆ ئەو شوێنە بگەڕێتەوە کە ئەم فێرگەیە لەئەتینا بەکاریدەهێنا (سینۆ سارجس - Cynesarges) و ناوەکە لەوشەیەکی گریکی بەمانای (سەگ)ەوە وەرگیرابێت وەك ئاماژەکردن لەزیادەڕۆی لەرێگەیەکی دوژمنکارانە ئاتەدەبیانە کە ئەندامانی فێرگەکە لەمامەڵەکردنیاندا پەیڕەوییان لێدەکرد، لەهەردوو بارەکەدا کەلبییەکان لەسەر ئەوە راهاتبون کە (سەگ) وەك هێمایەك لەخۆیان بنێن.. بڕوانە: الدكتور

243ـ بڕوانە: الدكتور. على احمد عبدالقادر: سەرچاوەی پێشوو.. لا ١٧٠ ئنجا بەراوردی بکە لەگەڵ: برتراند راسل: سەرچاوەی پێشوو.. لا ٣٦٨-٣٧٠ .

244ـ ئەنتیستنیس لەئەتینا لەساڵی (٤٤٥ پێش زایین) لەدایکبووە و ساڵی (٣٦٥ پێش زایین) لەسەرەتای لاویدا لەسەر دەستی سۆفیست جورجیاس و مارس هاوشێوەی سۆفیستەکان فێری پیشەی فێرکردن بوو، ئنجا رێی لەسۆکرات کەوت و تا دواڕۆژەکانی ژیانی بەقوتابی ئەو مایەوە، ئەنتیستنیس خۆی بەمیراتگریی فیکریی سۆکرات دەزانی، ئەگەرچی ئەفلاتۆن لە(کۆمار)کەیدا رەخنەیەکی

وەرگرتوە کە قوتابی سۆکرات و بەتەمەن بیست ساڵ لەئەفلاتۆن گەورەتر بووە.

دوو قۆناغی سەرەکی ڕەنگدانەوەی مێژویی ئەم قوتابخانەمان بۆ دەردەخەن: یەکەمیان لەسەدەی چوارەمی پێش زایین تێبینی دەکرێت، بەڵام قۆناغی دووەمیان هاوکاتە لەگەڵ ئاوابونی دەوڵەتە شاری یۆنان وتاکو سەردەمی ڕوخانی ئیمپراتۆرییەت درێژدەبێتەوە.

کەلبی‌یەکان ئاراستە بیرییەکانی خۆیان لەقۆناغی یەکەمدا لەلایەك لەسەر بنچینەی ژیانی سۆکرات و لەلایەکی دیکەوە لەسەر میتۆدو ئامۆژگارییەکانی بونیادنابوو، ئەگەر سۆکرات بەپێخاوسی ڕۆشبێت و قسەی لەگەڵ گشت مرۆڤێکدا (شازادە یان هەژار) دا بکردایە، ئەوا کەلبیەکان وایانکردوە. یان ئەگەر سۆکرات بانگەشەی ئەوەی کردبێت کە پێویستە مرۆڤ خۆی بناسێت و بەگوێرەی ئەو خۆناسینە کاربکات، کەلبی‌یەکان لەوە زیاتر ڕۆشتون و وتویانە" پیاوی دانا کە دەگاتە مەعریفە دەتوانێت پشت بەخۆی ببەستێت.

لەئاکامی شوێنپیٚ هەڵگرتنی ژیانی سۆکرات و زیادەڕەویی تێدا کردنی وەك سواڵکەریان لێهات هاوشێوەی ڕەهبانە دێرینەکانی فرنسیسەکان، لەگەڵ جیاوازییەکی گەورەدا" ئەمان هەژارییان هەڵبژارد نەك لەبەر خۆشەویستیان بۆ عەرشی ئاسمان، بەڵکو لەئاکامی ڕق لێبونەوەیان لەدەسڵاتدارانی سەر زەوی.[٢٤٥]

---

زۆری ئاراستە کردوە.. بڕوانە: الدکتور. ابراهیم درویش: سەرچاوەی پێشوو.. لا ٥٧.

245- Barker, op., cit.. p 122.

ئامانجی قوتابخانەی کەلبی بەدیهێنانی نمونەیەکی باڵا لەژیاندا کە پشت بەبنەمای پشتبەستن بەخودو کۆنترۆڵکردنی خودو بەرگەگرتنی ناخۆشییەکان و کارکردنی بەردەوام دەبەستێت، لەبەر رقبونەوەیان لەبنەڕەتی خاوەندارێتی پشتیان لەدەوڵەمەندی هەڵکرد، وەك چۆن کەلبی‌یەکان رۆڵیان هەبووە لەدەرکەوتنی بیرۆکەی یەکسانی سروشتی نێوان تاکەکان و برای یەکتربونی سروشتی خەڵکی‌و دواجار هەموویان سەر بەیەك کۆمەڵگەی مرۆڤایەتین، ئەم روانگە بیریانە لەناوەڕۆکەوە جیاوازییان نییە لەگەڵ ئەو روانگانەی کە بیری مەسیحی خستونیەتەڕو وتیایدا بانگەشەی پرەنسیپی برایەتی مرۆڤایەتی لەنێوان مرۆڤەکاندا کردوە لەپێناو هاتنەکایەی کۆمەڵگەیەکی نێودەوڵەتی یەکگرتوو کە لەسەر بیرۆکەی هاوڵاتیبونی جیهانی دامەزراوە، ئەوەی قوتابخانەی کەلبی بانگەشەی بۆ دەکرد. مرۆڤی عاقڵی دانا پێویستە (بەگوێرەی ئەنتیستنیس) لەچوارچێوەی دەوڵەتداو بەپێی ئەو بنەما یاساییانە نەژی کە دایڕشتوە، بەڵکو بەپێی یاساکانی فەزیلەو چاکە بژی کە بەسروشت جیهانییە.[٢٤٦]

ئەم بیرۆکە هەندێك لەنوسەرانی گەیاندوەتە ئەو بڕوایە" ئەنتیستنیس ئارەزوی کردوە بۆ ژیانی کۆمەڵگەی سروشتی بگەڕێتەوە، چونکە لەبارترە بۆ ژیانی مرۆڤایەتی. بونی چەندین دەوڵەت و دواجار دامەزراندنی چەندین حکومەتی نیشتمانی لەیەکتر جیاواز هیچ زەرورەتێکی نییە، لەبەرئەوەی گشت مرۆڤایەتی دەبێت لەچوارچێوەی یەك نیشتماندا و بەپێی سروشت بژی، بەجۆرێك جەنگ نییە، بەڵکو ئاشتی.. کۆیلایەتی نییە، بەڵکو ئازادیی..

246– الدکتور. ابراهیم درویش: سەرچاوەی پێشوو.. لا ٥٨ .

بەچەشنێك هیچ پەیوەستبونێك و هیچ کۆتێك و هیچ نەریتێك نییە، بەڵکو ئازادکردنی رەهای ئەفراندنی گشت مانا سروشتییەکانی ناخی مرۆڤە.[٢٤٧]

**بەکورتیو پوختی ئاسانیSimplicity کلیلی ئەو ژیانە فازیلەیە[٢٤٨].**

ئەنتیستنیس و لایەنگرانی باوەڕیان بەتاکگەرایی هێناوە، بەچەشنێك هیچ بوارێك بۆ پەیوەندییە کۆمەڵایەتیو نەتەوایەتییەکان لەئارادا نامێنێت و نکۆڵیکردن لەگشت لێکۆڵینەوە زانستییە قوڵ و چەمکە پەروەردەییو فێرکارییەکانی گریك، تاك ئەو میحوەرەیە لەسایەیدا بیرو سێستمەکان دروست دەبن و (هەروەها) ئەو یەکەیە کە پشت بەخۆی دەبەستێت وئەرکەکانی سەرشانی هەر لەخۆوەو بەبێ ئاراستەکار بەگوێرەی تێڕوانین و ئاستی دەرککردنی سەبارەت بەسروشت و یاساکانی فەزیلە ئەنجامدەدات.

کەلبییەکان چەمکی تاکگەراییان گەیاندە دواپلەی، ئەمەش کاتێك جەختیانکردوە لەسەر:

**((چێژە ئاساییەکانی ژیان سوك و زیانبەخشن، لەبەرئەوەی دەبنە لەمپەر لەبەردەم ئیرادەدا، بەهەمانشێوە سامان و ناوبانگیو هێزو دەسڵات بەئاراستەی لاوازکردنی پێگەی عەقڵ و گومڕاکردنی رۆحدا دەچن بەهۆیەوە شتە سروشتییەکان دەگۆڕدرێن بۆ دەستکرد، مرۆڤ لەناخی خۆیداو تەنیا بۆ خۆی دەژی، بەرزترین مەبەست بەلایەوە ناسینی خۆییو بەدیهێنانی ئەم خودەیە بەگوێرەی ئەو شتانەی لۆژیك و عەقڵی خۆی دور لەکۆمەڵگەو دەوڵەت لێی دەخوازێت، لەوانەیە ئاسانترین رێگە بۆ گەیشتن بەم ئامانجە هەژارییو**

---

247- هەمان سەرچاوەی پێشوو..

248- Harmon, op., cit.. p 78.

بەدناویی بێت، لەبەرئەوەی ئەم دوانە وا لەمرۆڤ دەکەن ئاوڕ لەخۆی بداتەوەو ئنجا کۆنترۆڵی خۆی بکات و هێزی خۆیشی لەخەوشی رواڵەتە هەڵخەڵەتێنەرەکان پاکبکاتەوە، واتە پیاوی چاك یان عاقڵ هاوشێوەی خواوەندەکان نایەوێت یان ئارەزوی ئەو شتانە ناکات.. بەپشت بەخۆبەستن دەستبەرداری پێداویستییەکان دەبێت، هاوڵاتی جیهانی بەمجۆرە دەبێت کە پەیوەستی بەنیشتمانێکی دیاریکراو نییەو، گشت دنیا وڵاتی هەموو مرۆڤەکانە.))[249]

کەلبی‌یەکان لەقۆناغی دووەمدا فەلسەفەی هەڵاتن یان پاشەکشەیان بەشێوەیەکی تیژو توندڕەوانە هێنایەکایەوە: باوەڕیان بەپشتبەستنی تاك بەخۆی هەبوو لەبەرئەوەی ئەوەی کۆتایی بەو کێشەو گرفتانە دەهێنێت لێی کۆبونەتەوە لەچوارچێوەی کۆمەڵگەی شارستانیدا لەسەر ژیانی کەڵەکە بوون، رونیانکردوەتەوە" پیاوی عاقڵ ئەوەیە پیشت بەخۆی ببەستێت، بەڵام پیاوی بێ‌عەقڵ پێویستی بەدامەزراوەکانی کۆمەڵگای سیاسی‌و پەیماننامەکانی دەبێت، کەلبی‌یەکان لەو بڕوادابوون دەوڵەتی شارو ئەوبیرو دامەزراوەو پەیماننامانەی پەیوەندیان پێوەی هەیە نەك هەر هیچ بەهایەکیان نییە، بەڵکو لەمپەری گەورە لەبەردەم پەرەسەندنی مرۆڤایەتیدا دروستدەکەن و، داوای لابردنی جیاوازییەکانی نێوان تاکەکانیان دەکرد (لەژیانی فازیلدا کۆیلە هەمان هەلی ئازادی هەیەو بەم پێیە گشت تاکەکان یەکسانن)و خۆیان لەهەموو شتێکی خۆش گرتوەتەوە.[250]

---

249- الدكتور. احمد عبدالقادر: سەرچاوەی پێشوو.. لا ١٧١ .

250- Ibid.,

لەپێناو بەدیهاتنی ناوەڕۆکی ئەم فەلسەفە قوتابخانەی کەلبی بانگەشەی پشتگوێ خستنی پرەنسیپەکانی ئەخلاقیو ناوبانگی باش و نکۆڵیکردن لەبارودۆخی کۆمەڵایەتی کردوە، لەگەڵ یاخیبون لەسیستمی خاوەنداریتیو هاوسەرگیرییو خێزان و گشت پەیوەستییە کۆمەڵایەتییەکانی ترو، هاوڵاتیبون. وەك چۆن بانگەشەی یەکسانیان دەکرد لەنێوان تاکەکانی کۆمەڵگەی گریکدا.

گەیشتن بەم لایەنانە سەبارەت بەکەلبیەکان مانای گەڕانەوەیە بۆ کۆمەڵگای سروشتی کە بریتییە لەژیانی فازیلە، ئەوەی عاقڵان و دانایان پێوەی پابەندن و جگە لەمرۆڤە گەوجەکان کەس لێی لانادات و لەبەرئەوەی دانایان لەهەموو جێگەیەکدا بونیان هەیە" ئەوا کۆمەڵگەیەکی جیهانی پێکدەهێنن و دەوڵەتێکی جیهانیانی تایبەت بەخۆیان دەبێت کە تیایدا هەموان یەکسانن: کویلەو ئازاد، یۆنانیو بەربەرەکان و گشت ئەو دانایانە لەخۆدەگرێت کە پابەندی پرەنسیپی پشت بەخۆبەستن دەبن و ئەوانەش فەرمانڕەواییەکی جیهانی لەئەستۆ دەگرن، بریتییە لەدەوڵەتێك کە ملکەچی تاکە سەرۆکێکی خاوەنی دەسڵاتی ڕەهایە.

قوتابخانەی ڕەواقییە لایەنی سەلبی بیرۆکەی دەوڵەتی جیهانی و فەرمانڕەوایی جیهانیی لەقوتابخانەی کەلبییە وەك بنچینەیەکی ئیجابی دواتردا هەڵدەهێنجن.[٢٥١]

251- Barker, op., cit.. p 124.

## دووەم: قوتابخانەی ئەپیکۆری

قوتابخانەی ئەپیکۆری کە لەئەتینا ساڵی(٣٠٦ی پێش زایین) جێگربووە، کاریگەری گەورەی لەسەر بیری سیاسی بەجێهێشتووەو دامەزرێنەرەکەی ئەپیکۆر Epicurus[٢٥٢] وێناکردنێکی رونی بۆ ئەو کۆمەڵە ئامانجە هەبووە کە پێویستە فەیلەسوف بەجێیان بهێنێت.

قوتابخانەی ئەپیکۆری بەشێوەیەکی گشتی هەمان ئامانجی فەلسەفە سیاسیەکانی تری پاش ئەرستۆی هەبووە، ئەویش ئەوەیە لەناخی قوتابییەکانیدا تۆی پشت بەخۆبەستنی تاکگەرایی بچێنێت ولەم پێناوەدا فێری دەکردن کە ژیانی فازیلە لەسەر بنەمای بەهرەمەند بوون لەچێژوەرگرتن بەندە، چونکە چێژ بریتییە لەچاکەو سەرەتاو کۆتایی ژیانی پیرۆزە.[٢٥٣]

---

252- ئەپیکۆر (ساڵی ٣٤٢ ی پێش زایین) لەشاری سامۆس (samos) لەدایکبوەو تەمەنی منداڵیتی لەوێ بەسەربردوە، لەتەمەنی چواردە ساڵانەوە دەستیکردوە بەخوێندنی فەلسەفەو لەتەمەنی هەژدە ساڵیدا بەنیازی وەرگرتنی مافی هاوڵاتیبون تیایدا بەرەو ئەتینا بەرێکەوتەوە، بەڵام ئەو دەمە داگیرکارەکان لەسامۆس دەرکران و ئەمیش ناچاربو لەگەڵ خانەوادەکەیدا بچێت بۆ ئاسیای بچوک، لەوێ ئەپیکۆر لەسەردەستی پیاوێک بەناوی (نۆسیکانیس) وانەی دەخوێند کە پێدەچێت لەلایەنگرانی دیموکریتس بێت. فێرگە فەلسەفییەکەی بەناوی (باخچە) ساڵی (٣١١ پێش زایین) لەمیتلین (Metlyn) و ئنجا لەلامپاکۆس دامەزراندوەو ساڵی (٤٠٦ پێش زایین) گواستویەتییەوە بۆ ئەتیناو تا دوا رۆژەکانی مردنی ساڵی (٢٧٠ پێش زایین) وانەی تێدا وتوەتەوە.. بڕوانە: الموسوعة الفلسفية المختصرة: سەرچاوەی پێشوو.. لا ٤٤٣ . ئنجا بەراوردی بکە لەگەڵ: الدكتور. أحمد فؤاد الاهواني: المدارس الفلسفية: سەرچاوەی پێشوو.. لا ٧٩ .

253- ئەپیکۆر لەمبارەوە دەڵێت: نازانم چۆن بتوانم وێنای بیرۆکەی چاکە بکەم، لەکاتێکدا من گشت چێژەکانی هەستی تامکردن و چێژی خۆشەویستی و چێژەکانی هەردوو هەستی بیستن و بینینم دور خستوەتەوە.. سەرەتای گشت

کۆڵەکەی فەلسەفەی سیاسی ئەپیکۆر بەریتییە لەپاشەکشەکردن لەژیانی گشتی.[254]

ئەپیکۆر بۆ سەلماندنی بەم بیروبۆچونە لەوبڕوادایە یەکسانبونی مرۆڤ لەپێگەدا لەگەڵ ئەوانیتر روبەڕوی دوژمنانێکی سەرسەختی دەکەنەوە کە هەمیشە لەبۆسەدان بۆی‌و هەرگیز بەئاسودەیی ناژی‌و، ئایین و مردنی بەدوو سەرچاوەی سەرەکی ترس داناوەو ئنجا لەلایەنی ماددی گرتووەو گەیشتوەتە ئەو بڕوایە" مرۆڤ ئازادی ئیرادەی هەیەو هاوکات لەگەڵ ملکەچبونی بۆ هێزەکانی سروشت کە لەتوانایدایە زانستیانەی لێی بکۆڵێتەوە، بەئەندازەیەك سەرداری خۆیەتی.

ئەپیکۆر کاتێك لەباسی تاك و دەوڵەتدا جەخت لەسەر پرەنسیپی بەرژەوەندی تایبەت دەکاتەوە، بەدیهاتنی بەختەوەریی تایبەتی تاك و بەرژەوەندییە تایبەتەکانی ئامانجی باڵای ژیانە، بێجگە لەمە هەموو رێکخستنێکی هەڵسوکەوتەکانی مرۆڤ دەچێتە چوارچێوە عورفەوەو لەتێڕوانینی دانادا هیچ مانایەکی نامێنێت مەگەر ئەو نەریتە بەختەوەرییەك بۆ تاك بەدیبێنێت کە بەبێ ئەو

---

چاکەیەک و ریشاڵە یەکەمەکانی بریتییە لەچێژی گەدە، هەقوایە دانایی‌و رۆشنبیری بەهەندێک وەتەر پەیوەندی لەگەڵ ئەم چێژەدا هەبێت.. بڕوانە: برتراند راسل: سەرچاوەی پێشوو.. لا ٣٨٧ . لەگەڵ: عبدالرحمن بدوی: خریف الفکر الیونانی، مکتبه النهڤچه المصریه، القاهره-١٩٥٩ .. لا ٦٣-٦٤ .

[254] – لەبەرئەوەی مرۆڤ بەو ئەندازەی هێزی زیاد دەکات، ژمارەی ئەوانەش زیاد دەکات کە ئیرەیی پێدەبن و دەیانەوێت زیانی پێبگەیەنن و تەنانەت ئەگەر لەبەدبەختی دەرەکیش دەربازی ببێت، هێشتا مەحاڵە لەم بارەدا ئاسودە بێت، یەکێک لەخەسڵەتەکانی پیاوی دانا ئەوەیە لەبەرەچاوان ژیانێکی ئاسایی بگوزەرێنێت ئەمەش تاکو دوژمنی بۆ پەیدا نەبێت.. بڕوانە: برتراند راسل: سەرچاوەی پێشوو.. لا ٣٨٩ .

بەدینەیەت. بەڵام دەوڵەت تەنیا بۆ پاراستنی ئاسایش و بەرەنگاربونەوەی دوژمن دادەمەزرێت و لەبەرئەوەی بەشداری تاک لەدامەزراوەکانیدا مەبەست لێی بەدیهاتنی بەرژەوەندییە تەواو کەسییەکانە، ئەپیکۆرییەکان یاسایان بەرێکەوتنی سودەکان Agreement of utility ناساندوە کە لەنێوان تاکەکاندا بۆ بەرقەراکردنی ئاسایش و بەرگرتن لەستەم و توندوتیژی ئیمزا دەکرێت و، لەو بڕوادا بوون ژیانی سیاسی ژیانێکی پڕوکێنەرە، بۆیە پیاوی عاقڵ نابێت بەشداری تێدا بکات، ئەگەر بەرژەوەندییە رەهاکانی ئەوەی بەسەردا بسەپێنن.[255]

وەك چۆن تەواو ملکەچی هەر حکومەتێك بین کە هەوڵ بۆ چەسپاندی ئاشتیو دەسڵات بدات و لێرەوە سێستمی حوکمی زۆرداریی بەلای ئەپیکۆرییەکانەوە هیچ جیاوازییەکی نییە لەگەڵ سێستمی فەرمانڕەوای پاشایەتی.

روانگە سیاسیەکانی ئەپیکۆر ئەو گریمانەی هێناوەتەئاراوە کە گشت تاکەکەسەکان بەخۆڕسك خودپەرستن و بەدوای بەرژەوەندیيە تایبەتییەکانیاندا دەگەڕێن، ئەگەر هەندێکیان چاکەیان دەستکەوت خودپەرستی هەندەکەی تر گەندەڵی دەکات، لەبەردەم ئەم تاکەکەسانەدا هیچ رێگەیەك نییە جگە لەوەی لەنێوان خۆیاندا لەسەر ئەوە رێکبکەون کە زیان بەیەکتر نەگەیەنن. بەجۆرێك ستەمکردن لەخۆیدا خراپە نییە، بەڵام نەهامەتی دەرئەنجام و لێکەوتەکانی (بەبێ ئەوەی ستەملێکراو کەسێك بدۆزێتەوە خراپەکەی لەکۆڵبکاتەوە) لەهەموو شتێك خراپترە، بۆیە خەڵکی لەسەر

---

[255]- Wanlass, op. cit.. p 69.

ڕێزگرتنی مافەکانی یەکتر ڕاهاتن بۆ خۆپاراستن لەو خراپانەی هەندێك کە ڕوبەڕوی هەندەکەی تر دەبێتەوە.[256]

بەمجۆرە دەوڵەت و یاسا وەك ڕێکەوتنێك لەپێناو ئاسانکردنەوەی هەڵسوکەوتی نێوان تاکەکان دەردەکەون، ئەگەر بونی ئەم جۆرە ڕێکەوتنامە ڕەتکرایەوە ئەوا دادوەریی بونی نامێنێت، یاساو حکومەتەکان لەپێناو ئاسایشی بەرامبەرکێدا دێتەئاراوەو هیچ کاریگەرییەکی نییە جگە لەوەی ئەو سزایانەی کە یاساکان بڕیاری لەسەر دەدەن وا دەکەن ستەم هیچ کەڵکێکی نەمێنێت.

بەرژەوەندی تەنیا مۆرکی بڕیاردانە لەسەر یاساو سیستەمە سیاسییەکان، لەبەرئەوەی یاساو سیستەمەکان پێداویستی بۆ ئاسایش پڕدەکەنەوەو بەهۆیەوە هەڵسوکەوتی نێوان تاکەکان بەشێوەیەکی تەندروست و ئاسانتر بەدیدێت، ئەوا دادوەرە بەو مانای کە دەشێت لەم وشەیەوە تێیی بگەین، بۆیە ئاساییە ئەپیکۆرییەکان بەگشتی حکومەتی تاکگەرایان بەلاوە باشتر بووە، بەو پێیەی زۆرترین و بەهێزترین جۆری حکومەتە، لەم پێناوەدا، ئاسایشی تیادا بەرقەرارە.[257]

بیرەکانی قوتابخانەی ئەپیکۆری خەریکە بەشێوەیەکی گشتی وەك ئەڵقەی پەیوەستی لێدێت لەنێوان بیروڕای سۆفیستەکان و ئاراستەکانی هۆبزدا، لەو ڕوانگەوە کە خۆپەرستی چەقی پەیمانی کۆمەڵایەتییە، کە لەبنەڕەتدا ئامانج لێی دابینکردنی سەلامەتی

---

256– بڕوانە: فؤاد محمد شبل: سەرچاوەی پێشوو.. ل ١٣٧-١٣٨ .

257– بڕوانە: سباین: سەرچاوەی پێشوو.. ل ١٧٣ .

ئەندامەکانییەتی تا بتوانن بەرهەمی زیاتریان هەبێت و سود بەبەرژەوەندییە تایبەتەکانیان بگات، بەجۆرێك هەستەکانی تاك سەبارەت بەخۆی پێوەری چاکەو خراپە بێت.

## سێیەم: قوتابخانەی ڕەواقی

فەیلەسوف زێنۆ Zeno[٢٥٨]..دامەزرێنەری قوتابخانەی ڕەواقی Stoics یە لەکۆتایی سەدەی چواردەهەم و سەرەتای سەدەی سیانزەهەمی پێش زایین. لەگەڵ ئەوەی ئەم قوتابخانە لەسەر خاکی گریك دامەزراوەو وانەکانی لەبنەڕەتدا لەسەر خاکی ئەتینا وتراونەتەوە، هێشتا ئەستەمە بەقوتابخانەیەکی بیری تەواو گریکی دابنرێت، لەوانەیە زیاتر بیپێکین ئەگەر بەمژدەبەخشی ماوەی گەشەسەندنی کارلێکی نێوان خۆرهەڵات و خۆرئاوا دابنرێت، کە

258- زێنۆ لەنزیکەی ساڵەکانی (٣٣٣ – ٢٦٢ پێش زایین) لەکتیۆم لەدورگەی قوبرسی کەناریی بەرامبەر فینیقیا هاتوەتە دنیاوەو هەر لەبەرئەمەش ئەتینیایەکان نازناوی (فینیقی)یان لێناوە، سەرقاڵی بازرگانی بووەو ئنجا ڕوی لەئەتینا کرد، بەچەشنێک هاتە جیهانێکی نوێوە کە پێشتر نەیدیبوو، ئەوەی تێپەڕاند کە باسا لەمەسەلەکانی قازانج و زیان بکات، فەلسەفە تیایدا باڵای دەکردو لەسەر ئەوە ڕاهات بۆ فێربون لەفێرگەیەکەوە بۆ فێرگەیەکی تر بچێت و تەنیا بەیەک مامۆستا ڕازی نەدەبو: ئامادەی وانەکانی "جەدەل"ی کریتسی کەلەبی دەبوو، گوێی لەستلبۆنی مەکاری دەگرت و بۆ ماوەی بیست ساڵی ڕەبەق بەسەر فێرگەکانی تری یۆناندا دەگەڕا.. پاش ئەوەی لەبیرە جیاجیاکان بەهرەمەند بو بازنەیەکی فێربونی سەربەخۆی لەنێوان دامەزراند، ئەم بازنەیە خاوەن پایەی ئەخشێنرابو و پێشتریش جێژوانی ئەدیب و هونەرمەندان بووە و هەر لەم جێگەوە ناوی فێرگەی (ڕەواقییە) وەرگیراوە.. بڕوانە: الدکتور. عثمان امین: الفلسفة الرواقیة، مکتبة النهضة المصریة، القاهرة-١٩٥٩ .. ل ٣٤ و ل ٣٦ .

دەرئـەنجامی شـاڵاوەکانی ئەسـکەندەری مەکدۆنی‌یـەو پـاش ئـەو هاتووە.[٢٥٩]

گشـت بیریـارانی قوتابخانـەی ڕەواقـی لـەدەرەوەی وڵـاتی گریـك بـوون، ڕەواقییـە یەکەمـەکان زۆربـەیان بەڕەچـەڵەك سـوریی بـون و، ڕەواقییـەکانی دواتـریش زۆربـەیان ڕۆمـانی بـوون، تەنانـەت زینـۆی دامەزرێنـەری قوتابخانەکـە لـەفینیقیا لـەدایکبووە، ئـەم دیـاردە زۆرێـك لەنوسـەرانی هانـداوە قوتابخانـەی ڕەواقـی بەکـەمترین قوتابخانـەی یۆنانی بزانن، کە مۆرکی یۆنانی هەڵگرتبێت.[٢٦٠]

ڕەواقـی تـوانی نزیکـەی چـوار سـەدە پێگـەی پێشـەنگ لەبزوتنەوەی فیکری لـەجیهانی هاوچەرخی ئەو کاتـەدا بگرێت و وەك چۆن ڕەواقـی دەنگدانـەوەی تایبـەتی لـەلای فـەرمانڕەوایان هـەبووەو زۆربـەی جێنشـینەکانی ئەسـکەندەر، بـەڵکو گشـت پاشـا سـەرەکییەکانی پـاش زینـۆ بانگەشـەی (ڕەواقـی) بونیـان کـردوەو، ناوبانگـەکانی ڕۆمـانیش شـانازییان کـردوە بـەوەی یـری ڕەواقـی گوزارشـت لەفەلسـەفەو ئـەو شـتانە دەکـات کـە ئـەوان باوەڕیـان پێـی هەبووە.

---

259– الدکتور. علی احمد عبدالقادر: سەرچاوەی پێشوو.. لا ١٧٦ .

260– بڕوانە: سباین: تطور الفکر السیاسی، الکتاب الثانی، الترجمة: حسن جلال العروسی، دار المعارف.، القاهرة-١٩٦٩، ط٣ .. لا ٢١٤ . هەروەها: عبدالرحمن بدوی: خریف الفکر الیونانی: سەرچاوەی پێشوو.. لا١٠ .

مێژوی رەواقییە بەسەر سێ قۆناغی سەرەکیدا دابەشدەبێت، ئەوانیش:

## قۆناغی یەکەم

قۆناغی دامەزراندن لەسەر دەستی زێنۆ و کریسبۆس لەماوەی نێوان (٣٠٤ –٣٠٥ی پێش زایین) بەجۆرێك بنەمای چەمکەکانی رەواقی دانرا.

## قۆناغی دووەم

کە تیایدا هەریەك لەدیۆجینیس Diogenesو بۆتیس Boethus لەصیدا ناوبانگیان دەرکرد.

## قۆناغی سێیەم

سەردەمی رۆمانیا دەگرێتەوە کە تیایدا لەمیانەی کتێبەکانی هەریەك لەسێنێکا Seneca و کۆرنۆتس Cornotus و ئێپیکتۆتس Epictetusو مارکۆس ئۆرلیۆس MercuAurelius چەمکەکان بەتەواوی رون و ئاشکرابون.[٢٦١]

ئەم خستنەڕوە خێرایەی واقیعی قوتابخانەی رەواقییە هانمان دەدا پرسیار دەربارەی سروشتی بیرە سیاسیەکانی بکەین؟..

پێویستە یەکەمجار ئەوە وەبیر بهێنینەوە سۆکرات پێشەنگی گشت رەواقییەکان بووە:

هەڵوێستە بوێرانەکەی لەکاتی دادگایکردنداو هەڵنەهاتنی لەگەڵ ئەوەی بواری هەبووەو هێمنی لەبەرامبەر مەرگداو بەرگریکردنی لەو

261– سەبارەت بەم دابەشکردنە بڕوانە: الدکتور. عثمان امین: الفلسفة الرواقیة: سەرچاوەی پێشوو.. ل ٣٣-٣٤ .

ڕا كە دەڵێت" ئەوەی ستەم بڵاوبكاتەوە زیان لەخۆی دەكەوێت زیاتر لەقوربانییەكەی‌و، گشت ئەم لایەنانە لەگەڵ بنەماكانی ڕەواقی‌دا یەكدەكەوتن، هەروەها ساكاری‌و پشتهەڵكردنی لەچێژە هەمەجۆرەكانی جەستە بەگشتی لەگەڵ ڕەواقی‌یەكاندا دەگونجا.

ڕەواقی‌یەكان ئامانجی ژیانیان لەبەدیهاتنی بەختەوەریی بۆ تاك كورتكردوەتەوە، ئەم بەختەوەرییە لەتێڕوانینی ئەواندا واتە خەفەكردنی هەڵچونی سوزداری‌و ملكەچكردنی ئەو ئارەزوانەی لەگەڵ ئەخلاق ناكۆكن بۆ دەسڵاتی عەقڵ، مرۆڤی عاقڵ ئەو لێكۆڵەرەیە لەرێگەی مەشقكردن لەسەر كەمتەرخەمی و شكاندنەوەی دەرون و داماڵینی لەگشت هەست و هەڵچونەكان بەدوای حەسانەو پارێزدا دەگەڕێت، بەجۆرێك روداوەكان هەرچەندە سەخت بن هێشتا پێیانەوە كاریگەرنابێت، لێرەوە ڕەواقی لەروی فیكرەوە لەئەپیكۆری جیادەبێتەوە كە میانڕەوانە بەرگری لەئارەزوە بیری‌و جەستەییەكانی مرۆڤ دەكات.

بەهەمانشێوە ڕەواقی‌یەكان بڕوایان بەسروشت و یاساكانی هەبووەو وای بۆ چوون" یاساكانی سروشت لەگەڵ عەقڵی مرۆڤدا دەگونجێن وهیچ بوارێكی گۆڕانیان نییە، بۆیە بیروڕاكانی خۆیان تایبەت بەپەیوەندییە كۆمەڵایەتییەكان لەسروشتەوە وەرگرتوەو ئەو مرۆڤەی ئارەزوی ژیانێكی باشتر دەكات پێویستە بەتەواوی تێكەڵی سروشت ببێت، ئەمەش لەبەرئەوەی ناسینی سروشت لەگرنگترین بنەماكانی ژیانی فازیلەیەو ژیانی سیاسی هیچ زەرورەتێكی نییە، مادامێكی مەبەستی تاك لەوەدا دیاریكراوە بەپشتبەستن بەخۆی بژی‌و لەگەڕانی بەدوای بەختەوەریدا هەوڵ دەدات لەسەر ژیانی سیاسی بمێنێتەوەو بەلایەوە باشترە ئەگەر بەپێی یاسای سروشت

بژی کە بەسە بۆ ڕێکخستنی جیهان و بەڕێوەچونی ژیانی بەبێ ئاراستەکردن و ڕێنوێنی تاکەکان.[٢٦٢]

لەم ڕوانگەوە ڕەواقی‌یەکان پێیانوایە ئەخلاق بەتەنیا بەدەر لەسیاسەت" هێزی بزوێنەری تاکەکەسەکانە، لەپسپۆڕی کۆمەڵ نییە، بەڵکو بەشێکە لەپسپۆڕی خودی تاکەکەس.

هەروەها ڕەواقی‌یەکان جەختیان لەسەر پرەنسیپی برایەتی مرۆڤایەتی کردوەتەوە: تاکەکان، وەك بونەوەری عاقڵ لەبنەڕەتدا وەکیەکن و ملکەچی هەمان یاسای سروشت دەبن و مافی یەکسانیان هەیە، لەم بیروبۆچون و تیۆرەوە سیاسەتی جیهانی هاتەئاراوە: گشت تاکەکەسەکان بەسروشت بران و هەوڵاتی یەك کۆماری جیهانین.[٢٦٣]

---

262– دەربارەی ئەمە دەڵێت: بیرۆکەی ئەم یاسا سروشتییە چەندین ئامانجی جیاجیای لەخۆگرتوە: سەرەتا لەبیرۆکەیەکی تێڕوانینی فەلسەفییەوە دەستی پێکرد، زۆری نەبرد تا گۆڕا بۆ بیرۆکەیەکی یاسایی، ئنجا بووە بیرۆکەیەکی ئاینی و لەکۆتاییدا فەیلەسوف و نوسەران کردیانە ئامرازی هەژاندنی لەڕێگەڵادەران و زەمینەسازیی (شۆڕشی فەرەنسا)یان پێکرد لەگەڵ ئەو مافانەی مرۆڤ کە جاڕی بۆدا.. بڕوانە: الدکتور. ابراهیم درویش: النظریة السیاسة فی العصر الذهبی: سەرچاوەی پێشوو.. لا ١٨٠

263– بەڵام هەندێک لەمامۆستایان لەو بڕوادان: هەوڵدانی فێرگەی ڕەواقییە بەمەبەستی دروستکردنی دەوڵەتێکی جیهانی لەسەر بنەمای ڕاڤەکردنی نمونە باڵاکانی سیاسیەت بەجۆرێک لەگەڵ سروشتی دەوڵەتی جیهانیدا گونجاوبێت و ئەوەی لەئامانجەکانیدا داوای برایەتی مرۆیی جیهانی دەکات لەسایەی یاسای سروشتیدا کە هەموان لەبەردەمیدا وەکیەکن و بەبێ هیچ جیاکردنەوەیەکی عەقڵ بریتییە لەهەوڵدانێک ئامانج لێی پاڵنەری ئەخلاقییە نەک زیاترو هەر ئەمەشە لەسایەی "شاری خودا"دا لەبیری مەسیحیدا تێبینی دەکەین، ئەوەی کە مەبەستی بوو ئەخشەیەکی فراوان لەپێناو بیرۆکەی برایەتی جیهانی گشتیدا بکێشێت.

هەر یەكێك لەو تاكەكەسانە هەوڵدەدات ژیانی تایبەتی خۆی بەشێوەیەكی گونجاو لەگەڵ یاسای سروشتدا بسازێنیٚ، ئەو یاسای لەسەروی ئارەزوەكانی مرۆڤەوەیەو نەمرەو مرۆڤ ناتوانێت هەمواری بكات ئەگەرچی هەمیشە هەوڵی ئاشكراكردنی دەدات، چونكە ژیان و بەختەوەریی لەو یاسادایە، ئەوەندە هەیە ئەمە لەو هەقیقەتەوە كەمدەكاتەوە" ئیرادەی فەرمانڕەوا سەرباری داننان بەدەسەڵاتی یاسای سروشتیو رەوایەتیو گشتگیریدا، لەبنەڕەتدا یاساكان دادەڕێژێت وهەڵیان دەوشێنێتەوە.

رەواقیيەكان پرەنسیپی یەكسانییان وەك بنچینەیەك داناوە بۆ بەرزكردنەوەی ئاستی ئەخلاقی، رەواقی دژایەتی یان لایەنگری ئەو بیروڕایانە ناكات كە ئەفلاتۆن و ئەرستۆ سەبارەت بەبونی جیاوازی لەنێوان تاكەكاندا بەهۆی رەگەز یان هاوڵاتیبونەوە خستویانەتەڕو: كۆیلە" بەپێی روانگە فەلسەفیەكانی رەواقی مرۆڤەو هیچ كۆیلەیەك بەسروشت كۆیلە نییە، بەڵكو مرۆڤەو دەبێت لەو روانگەوە مامەڵەی لەگەڵ بكرێت كە كرێكارێكەو بەدرێژای ژیانی بەكریٚ كاردەكات.[٢٦٤]

لەكاتێكدا رەواقیيەكان لەدوو بواری فەلسەفیو مرۆییەوە پەرەیان بەفیكر دەدا، بارودۆخە هەنوكەییەكانی دواتری وڵاتی

---

ئەو بنەمایانەی فێرگەی رەواقییە بیرۆكەی دەوڵەتی جیهانیی لەسەر بونیادناوە، بنەماگەلێكی جێگەی گومان و ئەمەش لەبەر نادروستی ئەو تێڕوانینەی فێرگەكە سەبارەت بەیەكسانی گشت مرۆڤەكان بەجیاوازی رەگەزو سامانیانەوە پێشكەشی كردوین.. بەسروشتی داڵ پێویستە ئەوە بخەینە مێشكی خۆمانەوە كە ئەم بنەمایانە لەفەلسەفەی فێرگەی رەواقییەوە سەبارەت بەیاسای سروشتی سەرچاوەی گرتووە.. بڕوانە: الدكتور. ابراهيم درويش: الدولة" النظرياتهاو تنظيماتها، دراسة فلسفية تحليلية.

264- بڕوانە: الدكتور. نزار الطبقجلي: سەرچاوەی پێشوو.. لا ١١٩ .

گریك، لەبەرژەوەندی جێبەجێکردنی سیاسیانەی ئەو بیرانەدا بووە. ئیمپراتۆرییەتی ئەسکەندەریی لەمپەرەکانی نێوان گەلی گریك و ئەو گەلانەی تێپەڕاند کە لەچوارچێوەی قەڵەمڕەویی ئیمپراتۆریەتەکەدا بوون (بەجۆرێك ئەسکەندەر گشت گەلانی جیهانی لەیەك بۆتەدا کۆکردەوەو فەرمانی بەهەمووان کرد کە زەوی بەنیشتمانی خۆیان بزانن و سوپاکەی وەك( ئەکرۆبۆلهم) واتە قەڵا پتەوەکەیان، پیاوانی چاك وەك کەسوکارو خراپەکان وەك بێگانە تەماشا بکەن).[٢٦٥]

لەلایەکی دیکەوە جیاوازییە مەدەنیو کۆمەڵایەتییەکانی نێوان گەلە جیاوازەکانی کۆتایی پێهێناو بەمەش گشت ئەو گەلانە ملکەچی تەنیا یەك سێستمی سیاسی دەبوون، بەدامەزراندنی ئیمپراتۆرییەتی رۆمانی" هاوڵاتیبونی جیهانیو یاسای جیهانی بونە دوو هەقیقەتی واقیعی.

رەواقییەکان تەنیا بەکەمکردنەوەی بایەخی جیاوازییەکانی نێوان تاکەکەسەکانەوە نەوەستاون و تێیان پەڕاندووە بۆ پتەوکردنی خاڵەکانی پێکەوە گونجانی نێوان وڵاتان، گشت تاکێك ملکەچی دوو یاسا دەبێت: یاسای شارەکەیو یاسای شارە جیهانییەکە، یاسای نەریت و یاسای عەقڵ.. دووەمیان گرنگترەو زیاتر دەمێنێتەوەو لەبەر رۆشناییدا جیاوازیو گرفتە هەرێمیو ناوخۆییەکان لەبیردەکرێن.[٢٦٦]

بیرەکانی تایبەت بەیەکسانیو برایەتیو دادوەرییو یاسای سروشتی کە لەلایەن رەواقییەکانەوە پێشکەشکرا کاریگەری لەسەر فەلسەفە سیاسیەکانی تر بەجێهێشتووە: مەسیحیەت بیرۆکەی برایەتی

---

265– بڕوانە: جان توشار: سەرچاوەی پێشوو.. ل ١١٩ .

266– بڕوانە: الدکتور. ملحم قربان: سەرچاوەی پێشوو.. ل ٢٨٠-٢٨١ .

جیهانیو رۆمانەکان بیرۆکەی یاسای سروشتیو یەکسانیو دادوەریی گشتییان لێوەرگرتوە.

ئەم کاریگەرییەی قوتابخانەی رەواقی لەسەر قوتابخانەکانی دوای خۆی، ئەوە ناگەیەنێت چاوپۆشی لەلایەنە نەگەتیفەکانی بکرێت: لەکاتێکدا رەواقی دەیوست جیاوازییەکە نەهێڵێت هاتووە: مرۆڤەکانی بەسەر عاقڵ و گێلدا دابەشکردوە (ئەم جیاوازیکردنە زۆر لەو جیاوازییە سەخت و قوڵترە کە گریکەکان سەبارەت بەدابەشکردنی جیهان بۆ گریك و بەربەر پێشکەشیانکردوە) بەجۆرێك لێرەدا وادەخوازێت پێوانەی زۆر جیاواز لەعەقڵ و گێلێتی بۆ پێوانەی پلەکان دابهێنرێت، کە دەرگا بەروی بانگەشەی پێوانەیی کە تێکەڵە بەخەوشی هەڵچون و خۆیی لەگوزارشت و لەبڕیارداندا، تەنانەت لێرەدا هیچ رێگرییەك دانەنراوە بۆ بەرگرتن لەگشتگیرکردنی هەردوو خەسڵەتی (عەقڵ و گێلێتی) بەسەر تەواوی گەلێك یان گەلێکی تردا، وەك ئەوەی رەواقی سەرەڕای رەونەقی بانگەشە جیهانییەکەی، شتێکی نوێی دانەهێنابێت، بەڵکو ریشاڵەکانی لایەنگرییە رەگەزپەرستانەکەی پێشوی قوڵترکردوە.[267]

---

267– الدکتور. علی احمد عبدالقادر: سەرچاوەی پێشوو.. ل ١٨١ .

# دەروازە

بەدەگمەن ڕێدەکەوێت نوسەرێك لەکاتی لێکۆڵینەوە لەمێژوی گەشەسەندنی زانستی سیاسیدا، کولتوری ڕۆمانی بەسەرکردبێتەوە، ڕۆما، بەتێڕوانی زۆربەی نوسەران، هێزی سیاسی[268].. بەخۆوە نەدیوەو سروشت بەهرەی توێژینەوەی سیاسی بەڕۆمانیا نەبەخشیوە کە بەیەکێك لەخەسڵەتەکانی شارەکانی یۆنان دادەنرێت، ئەوەندە هەیە لەئەمڕۆدا ئەم تێڕوانینە بەهای نەماوەو بەهیچ شێوەیەك جێگەی ڕەزامەندی نییە.

ئەگەر فەلسەفەی یۆنانی ئەو زمانەی بەرهەمهێنابێت کە ئەمڕۆ زانایان بەهۆیەوە گوزراشت لەرەوشەکانی تایبەت بەدیارەی سیاسیەوە دەکەن، بێگومان شارستانییەتی ڕۆمانیا ئەو چوارچێوەی پێشکەشکردوە کە شارستانییەتی نوێ بەشێوەیەکی گشتی سێستمە سیاسیو یاساییەکانی لەسەر بونیادناوەو بەتایبەت ئەو شتانە کە تایبەتن بەپەیوەندییەکانی نێوان تاك و دەوڵەت.

ئەم ڕاستییە بەسە بۆپاساودانی دیراسەکردنی شارستانییەتی ڕۆمانیو گفتوگۆکردن سەبارەت بەچۆنێتی داڕشتنەوەی کێشە سیاسیەکان لەلایەن ئەم شارستانییەتەوەو ئەو چارەسەرانە کە لەو پێناوەدا پێشکەشی کردون و، ئایا بیری سیاسی ڕۆمانی توانیویەتی

---

268– بۆ نمونە بڕوانە:

- Wanlass, op. cit.. p 89.
- Bowle, op. cit.. p 89.

سەرکەوتوو بێت لەو شتانەدا کە بیری یۆنانی شکستی تێدا خواردون.[٢٦٩]

هەروەها شارستانییەتی رۆمانی نمونەی شارستانیەتییەکی تەواومان پێشکەشدەکات لەروی پەرەسەندنەوە، زانیاری زۆری پشتئەستور بەبەڵگەو دیکۆمێنت لەبارەوە لەبەردەستدایەو بۆیە ئەم شارستانییەتە بووەتە مەیدانی تەماشاکردن و ئەزمون لەزانستی سیاسیی و ئەمەش پاش ئەوەی سەرچاوەی راستەوخۆی دارشتنی یاسایی بووەو دەبێت.

لەبەرئەوەی دەرککردن بەو گەشەسەندنانەی دامەزراوە سیاسیەکانی رۆماو سیستمە یاساییەکانی بەخۆیانەوە بینویانە، لەمیانەی لێکۆڵینەوە لەمێژووە سیاسیەکەیەوە نەبێت بەدەستنایەت و ئەو پەرەسەندە بیرییەی لەچوارچێوەی دەوڵەتی ڕۆمادا رویداوە ناکرێت بەدەر لەناسینی ئەو بیرو تیۆرانە بکرێت کە بیریارەکانی خستویانەتەرو پێوانە بکرێت و لەبەرئەوەی رۆما بەتەنیا لەسنوری جوگرافیای خۆیدا نەماوەتەوە وەك چۆن لەئەتینا یان لەشارەکانی تری یۆناندا تێبینی دەکرا، بەڵکو رۆڵی سەرکردایەتی ئەوتۆی بینیوە کە سنوری شارستانیەتەکەی خۆی تێپەڕاندوە بۆ سنوری شارستانیەتەکانی تر.

بۆیە ئاساییە ئەم بەرگە سێ بەش لەخۆبگرێت و بەدوایەکدا لەسێستمە سیاسیەکانی رۆماو نمونەکانی بیری سیاسیو ئنجا بنەما یاساییەکان کە لەناو کۆمەڵگەکەیانداو لەپەیوەندییە دەرەکیەکانیان لەگەڵ وڵاتانی تردا باو بووە بکۆڵێتەوە.

---

269– الدكتور. حامد ربيع: ابحاث في النظرية السياسية: سەرچاوەی پێشوو.. لا ١٤٦-١٤٧.

## بەشی چوارەم

# سیستمە سیاسیەکانی رۆمان

توێژینەوە لەمێژووی سیاسی رۆما واتە باسکردن لەسێ قۆناغی یان سەردەم کە بریتیین لە: سەردەمی پاشایەتی‌و سەردەمی کۆماری‌و سەردەمی ئیمپراتۆری، هەریەك لەم سەردەمانە بەواقعێکی کۆمەڵایەتی دیاریکراو و دامەزراوەی سیاسی دەناسرێتەوە کە رۆڵی دیاریکراویان هەبوەو کاریگەرییەکی ئاشکرای هەبوە لەچوارچێوەی ژیانی سیاسی‌و سیاسەتی دەرەکیدا، مەوداکانی بەگوێرەی ئەو سەردەمەی کە تێیدا تێپەڕیوە جیاواز بوە.

پێویستە ئاشنای ئەو واقیعە کۆمەڵایەتییە بین و سروشتی دامەزراوە سیاسیەکانی هەریەکەیان بناسین.

## بەندی یەکەم

# سەردەمی پاشایەتی

سەردەمی پاشایەتی بۆماوەی زیاتر لەسەد ساڵ (٦١٦-٥٠٩ پێش زایین) رەنگدانەوەی لەسەر واقعیی رۆما هەبووەو زۆرترین کات لەم ماوەیەدا دەسڵات بەدەست رەگەزی لاترۆسکی‌یەوە بووە کە رۆمای دروست کردو پێگەیەکی نایابی (بەبەراورد لەگەڵ شارەکانی تری ئیتالیا) پێبەخشی لەمیانەی گۆڕینی (بەرە بەرە) لەشارێکی بچوکەوە City State بۆ دەوڵەتێکی بەهێز کە سەرکردایەتی شارە بچوکەکانی دەوروبەرو ئاراستەی دەکردن،[270] لەکاتێکدا چینی ئازاد بەسەر چەند چینێکدا دابەشبوون[271].. چینی کۆیلەکان بنچینەی هەرەمە کۆمەڵایەتییەکەی رۆمانیای پێکدەهێناو سەرچاوەکانی لەناوەوەو دەرەوەوە پێکهات.

---

270– دەربارەی چۆنێتی دروستبونی رۆماو ئاراستەکانی‌و ئاستی کاریگەری ترۆسکیین و سابیین، بڕوانە:
- Adcok, F.E, Roman Pojitical jdca and practice, the university of Michigan, 1972.. p 5-18.
هەروەها: الدكتور. ابراهيم نصحى: تاريخ الرومان، ج١، دار النجاح، بيروت-١٩٧١ لةطةڵ: محمد محفل: تاريخ الرومان،مطابع غندور، بيروت-١٩٧٤ .

271– بریتییە لەچینێکی خانەدانی زەویندارو خاوەن سامان، هەروەها ئەو شوێنکەوتوانەی کە موڵکەکانیان لەدەستدا نەمابو و بوبونە خزمەتکاری خانەدانەکان و ئەو رەشۆکانەی کە رەگەزەکانی لاتینی دۆڕاو و ئەو بێدەرامەتانەی لەناوچە جیاجیاکاندا لەگوندەکاندا دەژیان و بۆ حسابی خانەدانەکان کاریان دەکرد، خەڵکی رەشۆک زۆرینەی کۆمەڵگەی پێکدەهێناو ژمارەیەک لەئەندامەکانی کە چوبونە ناو حوکمڕانییەوە پیادەی هەندێک کاری پیشەییان دەکرد.. بڕوانە: محمد محفل: سەرچاوەی پێشوو.. ل١٩٢-١٩٩ .

ئەگــەر سەرچــاوە ناوخۆییــەکانی کۆیلایــەتی بریتــی بێــت لەکۆیلــەبوون بەلــەدایکبوون و فرۆشــتنی منــدالْ وەك کۆیلــە لەلایــەن باوکەکانـەوە بۆ هەتاهـەتایی یان بۆ ماوەیەکی دیاریکراو و داننـەنان بەمنــدالْ و تۆمارنــەکردنی لەلیســتی هاوڵاتییــە ئازادەکانــدا لــەکاتی ئامــاردا، ئــەوا دیلگــرتن و قەرســەنە دوو سەرچاوەی بنــەڕەتی دەرەوە بوون لەپەیداکردنی کۆیلەدا.

بەو ئەنــدازەی چــینی کۆیلــەکان لــەپیادەکردنی هــەر شێوەیەکی کاری سیاسی بێبەشبوون، چینە ئازادەکـان لـەپیادەکردنی ئـەو مافـە بەهرەمەنــدبوون، ئەگەرچــی دەســڵاتەکان بــەگوێرەی بــارودۆخی سیاسی کۆمەڵگا لەکەسێکەوە بۆکەسێکی تر جیاواز بووە.

سـەبارەت بەدامـەزراوە سیاسـیەکان کـە لێپرسـراوێتی دەسـڵاتیان لەسـەردەمی پاشـایەتیدا لەئەسـتۆدەگرت، دەکرێـت جیـاوازی لـەنێوان زیاد لەدامەزراوەیەکدا بکرێت" بەتـەنیشت پاشاوە ئەنجومـەنی پیران و ئەنجومەنی گەل هەبوو.

## یەك: پــاشـــــا

مێـژوی رۆمانیـا ئـەوەمان بـۆ رونـدەکاتـەوە" پاشـا لەسـەر عـەرشی پاشـایایەتی دادەنیشـێت پـاش ئـەوەی لەلایـەن پاشـای پێشـووەوە ئـەو نازنـاوەی پێدەبەخشـرێت، ئەگـەر بـەهۆی مردنـەوە کورسـی دەسـڵات چـۆڵ و پاشــای پێشــوو کەســێکی بــۆ جێنشــینی خــۆی دیــاری نەکردبوو، ئەنجومـەنی پیران بـەم کـارە هەڵدەسـتێت بەمـەرجێك دانـانی

پاشا بۆ هەتاهەتایی بێت و ڕەزامەندی (ئەنجومەنی گەل)ی لەسەر بێت.[272]

پاشا (بەپێی دەسڵاتە ڕەهاکەی) دەسڵاتی فراوان پیادەدەکات: ئایینیو سەربازییو دادوەرییو شارستانی، پاشا ئەڵقەی پەیوەستی نێوان خواوەندو دەستوپێوەندەکانیەتیو ئاشنای ئیرادەی خواوەندەو سەرۆکایەتی مەراسیمی قوربانی بۆ خواوەند دەکات وجەژنەکان دیاریدەکات، لەکاتی جەنگ و دادگای سەربازیدا سەرۆکایەتی سوپا دەکات، بەڵام ئەوەندە هەیە ناتوانێت بەتەنیا بڕیاری ئاشتی یان هەڵگیرسانی جەنگ بدات، دەسڵاتە داوەرییەکانی پاشا لەتێڕوانینی تاوان و ئەو سەرپێچیانەی زیان بەدەوڵەت و نیشتمان دەگەیەنن وەك خیانەتی گەورەو مانگرتنی مەدەنیو سەربازیدا کورتدەبێەوە، هەروەها دەسڵاتی داڕشتنی هەندێك یاسا هەبووە بەمەرجێك ئەو یاسایانە پێچەوانەی دابونەریتی باو نەبن. وەك چۆن مافی دەستێوەردانی هەیە لەکاروبارەکانی کۆمەڵە ناوخۆییەکان ئەگەر هاتوو ناکۆکی کەوتە نێوانیانەوەو ئەو ناکۆکییە مەترسی ئەوەی لێکرا هەڕەشە لەئاسایش و سەلامەتی گەلی ڕۆمانی بکات.

لەرووە مەدەنییەکەوە پاشا سەرۆکی (گەل) سەرۆکایەتی دانیشتنەکانی ئەنجومەنی پیرانی دەکردو ئەندامەکانی دادەمەزراند، لەگەڵ ئەوەی دەسڵاتەکانی فراوان بووە بەڵام بۆی نەبووە بیروڕاکانی بسەپێنێت یان پێچەوانەی دابونەریتی باو بڕیاربدات، پێش ئەوەی

---

272– هەمان سەرچاوەی پێشوو.. لا ١٩٩ . هەروەها بڕوانە: الدكتور. ابراهيم نصحي: سەرچاوەی پێشوو.. لا ٦٩ .

هەر کارێکی گرنگ ئەنجامدا لەسەری بوو ئیرادەی خواوەند لەو بارەوە بزانیت، چونکە ئەم بەراسپاردەی خواوەندو پاش راوێژ پێکردنی بووەتە پاشا، کەواتە دەسڵاتەکانی پاشا لەخودی خۆیو رەچەڵەك و خێزانەکەیەوە نییە، بەڵکو لەخواوەندەو، بۆیە دروشمەکانی دەلالەتێکی ئیلاهییان هەبووە.[273]

## دوو: ئەنجومەنی پیران

ئەنجومەنی پیران هاوشانی پاشا دامەزراوەیەکی گرنگەو گرنگییەکەی لەسەردەمی کۆماریدا بەو پێیەی دەبێتە ئامرازی بنەڕەتی فەرمانڕەوایی لەشاری رۆما زیاتردەبێت، ئەم ئەنجومەنە کە لەسەرەك هۆزەکان پێکهاتووە لەلای ئەنجومەنی گەل ئاماژەی بەو کەسە (هەڵبژێردراو لەلایەن خواوەند) دەکرد کە پۆستی پاشا وەردەگرێت و پیادەی دەسڵاتەکانی پاشای دەکرد پاش مردنی یان نەمانی پاشایەتی بەهەر هۆیەکی ترەوە بێت، لەسەر پاشا بوو لەمەسەلە گرنگەکاندا راوێژی پێبکات، لەبەرامبەردا (ئەنجومەن)ەکە لەسەری بوو ئامۆژگاری پاشا بکات و بەبێ ناچارکردنی بۆ جێبەجێکردنی ئامۆژگارییەکان، بەڵام بەهۆی پێگەی ئەنجومەنەکەو ئەزمونی چەندین ساڵەی زۆر ستەم بوو بیربۆچونێك پشتگوێ بخرێت کە ئەندامەکانی لەسەری کۆکن. بەڵگە لەسەر بایەخی ئەنجومەنەکە کاتی مردنی پاشا دەردەکەوێت، دەسڵاتی بۆ دەگوازرێتەوەو یەکێك لەئەندامەکانی وەك فەرمانڕەوای کاتی دادەمەزرێنێت، تا ئەو کاتەی پاشای نوێ دیاریدەکرێت.[274]

---

273– محمد مدقل: سەرچاوەی پێشوو.. ل ٣٠٠ .

274– بڕوانە: الدكتور. ابراهيم نصحى: سەرچاوەی پێشوو.. ل ٩٧ .

## سێ: ئەنـــجومـــەنی گـــەل

گشت پیاوە ئازادەکان ئەوانەی توانای هەڵگرتنی چەکیان هەیە لەخۆدەگرێت، تەنیا ئەوان هاوڵاتین و، دەسڵاتەکانی ئەم ئەنجومەنە ئەگەرچی لەسەردەمێکەوە بۆ سەردەمێکی تر گۆڕانی بەسەردا هاتووە، بەڵام بەگشتی: پێشنیازکردنی یاساو مەسەلەکانی ئاشتیو هەڵگیرسانی جەنگ و ئیمزاکردنی هاوپەیمانێتیو دەنگدان لەسەر هەندێك پرۆژەی تایبەت بەکاروبارەکانی مەدەنیو دادوەرییو دەرکردنی بەیاسا دەگرێتەوە.[275]

ەنجومەن لەسەر بانگێشتی پاشا کۆدەبێتەوەو کاتێك مەسەلەی پەیوەست بەئایین گفتوگۆی لەبارەوە دەکرێت کاهینی مەزن مافی سەرۆکایەتیکردنی دانیشتنەکانی ئەنجومەنەکەی هەیە

بەبەراورد لەگەڵ رۆڵی ئەنجومەنی گەل لەچوارچێوەی دەسڵاتداو ئەو تایبەتمەندیانەی ئەنجومەنی پیران لێیان بەهرەمەندبووە، ئاستی چاکەدانی دەسڵاتی ئەنجومەنەی دواینمان بۆ روندەبێتە بەپێوانە لەگەڵ ئەو دەسڵاتانەی بەئەنجومەنەکانی گەل بەخشرابوون.

---

275– بڕوانە: محمد مدفل: سەرچاوەی پێشوو.. لا ٢٠٤ .

بەندی دووەم

# سەردەمی کۆماری

سەرەتاکانی سەردەمی کۆماریی پەیوەستە بەنەمانی دوایەمین پاشاکانی لاترۆسکی لەرۆماو بەردەوامبونی ئەم قۆناغە تاکو راگەیاندنی سیستمی ئیمپراتۆریی لەسەدەی یەکەمی زایینیدا.

هاوکات لەگەڵ کۆتایهاتنی فەرمانڕەوایی پاشایەتیو هاتنەکایەی سیستمی کۆماریی لەرۆما دوو مەسەلەی دێتەئاراوە" یەکەمیان: ئاڵۆزکانی رۆما بەزنجیرە جەنگێکەوە کە چینی ئەرستۆکراتی لەتوانایدا نەبوو بارەکەی لەئەستۆبگرێت کە بووە هۆی زیادبونی ئەو ئەرکانەی خرابوونە ئەستۆی رەشۆك.. مەسەلەی دووەمیان: قۆرخکردنی پۆستی گشتیو ئەندامێتی ئەنجومەنی پیران و کۆمەڵە ئایینەکانە لەلایەن ئەرستۆکراتەکانەوە کە بووە هۆی هەڵایسانی ململانێی توند لەنێوان هەردوو چینی (ئەرستۆکرات و تەواوی گەل) بەدانناني ئەرستۆکرات بەداواکارییەکانی گەل تایبەت بەزەرورەتبوونی چەسپاندنی یەکسانی لەمافە ئایینیو سیاسیو مەدەنییەکان و دوبارە دابەشکردنەوەی زەوییەکانی دەوڵەت لەنێوان تەواوی هاوڵاتیاندا بەبێ تێڕوانینی چینەکانیان کۆتایهات.[٢٧٦]

276- سەبارەت بەزانیاری تایبەت بەدیاردەکانی ململانێی هەردوو چینی ئەریستۆکراتیو خەڵکی رەشۆک، بڕوانە: ابراهیم نصحی: سەرچاوەی پێشوو.. لا ١٩٥ . هەروەها بڕوانە:

- Adcock, op., cit.. p 19-36.

چینی ڕەشۆك تەنیا ئەو كاتانە فشارەكانی بۆ سەر چینی ئەرستۆكرات بەئامانجی بەدەستهێنانی دەسكەوتی نوێی سیاسی دەستپێكرد كە تیایدا هەستی بەوەكرد ڕەگەزی سەرەكی بواری بەرهەمهێنانە (بەوەی ئەو بنچینە ئابورییەیە كە دەوڵەتی لەسەر بەندە)و ئەو ڕەگەزە مرۆییە كە ناكرێت لەبەرگریكردن لەڕۆمادا دەستبەرداری ببێت، ئەرستۆكراتییەكانیش تەنیا ئەو كاتانە داواكارییەكانی ڕەشۆكیان پەسەندكرد كە تیایدا دەركیان بەقورسایی ئەوان ( ڕەشۆك ) كرد لەهەردوو بواری ئابوریی‌و سەربازیدا.[٢٧٧]

سروشتییە ئەم پەرەسەندنە گرنگە ڕەنگدانەوەی لەسەر سیستمی سیاسی ڕۆمان هەبێت، بەپێی ئەمە دامەزراوە سیاسیەكان ئەوانەی نوێنەرایەتی ئەرستۆكراتەكانیان دەكرد لەگەڵ ئەو دامەزراوە سیاسیانە تێكەڵ دەبوون كە ئەندامیان لەچینی ڕەشۆك وەرگرتبوو.

كاتێك دەسڵات لەناوخۆدا بووە كۆماریی، ڕۆما بەئاراستەی داگیركردنی دەرەكی‌و فراوانخوازیدا هەنگاوی هەڵگرت، سەرەتا شارە ئیتالییەكانی دراوسێ خستەسەر وڵاتەكەی،[٢٧٨] .. بەكردەوە

---

277– بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: محمد محفل (القسم الثانی- الفصل الاول): سەرچاوەی پێشوو.. لا ١٦٥ و لاپەڕەكانی دواتر.

278– هەندێك لەم شارانە وەك هاوپەیمان پەسەند كراون و لەفەرمانڕەوایی مەدەنیدا هەندێك سەربەخۆی پێڕەوا دەبینرا، لەكاتێكدا سەبارەت بەهەندێك لەدەوڵەتانی تر دەسڵات یان تەوەتا بەدەست ئەو كەسانەوە بووە كە ناوی نیستماری نێردراو لەلایەن ڕۆمایان لێنراوە یان تەوەتا بەدەست كارمەندەكانی ڕۆماوە بووە، ئەوانەی بەوالی یان سەرۆكی شارەوانی ناودەبران.. بڕوانە:
- Gettell, op., Cit.. p 65.

لەسیاسەتی دەرەوەدا، لەگەڵ شارەکانی تردا تیۆری هاوسەنگی هێزەکانی پەیڕەودەکرد، کە بووە هۆی فراوانبوون و دواتر دامەزراندنی ئیمپراتۆرییەتێکی فراوان.

رۆما سێستمێکی سیاسی مەرکەزیی بەئامانجی بەردەوامبونی ئیمپراتۆرییەتەکەو بەهێزییەکەی پیادەدەکرد، دەوڵەتی بەسەر چەند ویلایەتێکدا دابەشکردو لەسەر هەریەکەیان فەرمانڕەوایەکی رۆمانی بەدەسەڵاتێکی فراوانەوە لەکاروبارە سیاسیو مەدەنییەکاندا دامەزراند، دانیشتوانی ویلایەتەکان هیچ گرەنتییەکیان لەبەرامبەر ئەم دەسەڵاتە فراوانانەدا نەبووە، جگە لەمافی تۆمەتبارکردنی روکەشیانەی فەرمانڕەوا، بەمەرجێك دوای تەواوبونی ماوەی حوکمڕانی فەرمانڕەوابێت و تۆمەتبارکردنەکە لەرۆما بێت.[279]

بەباسکردنی ئەو دامەزراوە سیاسیانەی سەردەمی کۆمارییان پێجیادەکرێتەوە ئەوەمان بۆ روندەبێتەوە" دەسەڵاتی پاشا لەم سەردەمەدا دراوەتە دەستەیەکی تر کە کۆنسوڵەکانە، رۆمانەکان ئەم سێستمەیان داهێنا کە بەهۆیەوە ئەنجومەنی گەل هەموو ساڵێك دوو کۆنسوڵ هەڵدەبژێرێت و ماوەی سەرۆکایەتی هیچکامیان تازەناکرێتەوە، مەگەر دوای تێپەڕبونی دە ساڵ بەسەر تەواوبونی ماوەی کارکردنیان لەکۆنسڵیەت.[280]

دەسەڵاتی هەردوو کۆنسوڵ هاوتای ئەو دەسەڵاتە نەبووە کە پێشتر پاشا هەیبوو: دەسەڵاتی ئایینیان لێسەندرایەوەو بەدەستەیەك

---

279– بڕوانە: مقدمة الدكتور. محمد فتح الله الخطيب في سباين، ج٢ : سەرچاوەی پێشوو.. ١٩٧ .

280– بڕوانە: الدكتور. ابراهيم نصحي: سەرچاوەی پێشوو.. لا ١٥١ و لا ١٩٧ .

لەکاهینەکان سپێردرا، لەگەڵ ئەوەشدا دەکرێت بەگەورەترین پیاوی کارگێڕیو فەرمانڕەوایی دابنرێن کە دەسڵاتی مەدەنیو سەربازیی فراوانیان هەبووە: سەرکردایەتیکردنی سوپاو بەڕێوەبردنی چالاکییە سەربازییەکان لەدژی دوژمنانی رۆماو، لەم پێناوەدا لەگەڵ ئەنجومەنی پیران رێکدەکەون. ئەمانەش لەکاتێکدا دەبێت کە ئەنجومەکانی خاوەن دەسڵات رەزامەندییان لەسەر راگەیاندنی جەنگەکە دەربڕیوە.

هەردوو کۆنسوڵ دەسڵاتی سزادانی سەرپێچکارەکانیان (بەبێ دادگایکردن) و سزاکە تا سزای لەسێدارەدا دەچێت، لەگەڵ مافی بانگێشتی سازکردن و سەرۆکایەتیکردنی دانیشتنەکانی ئەنجومەنی پیران و، ئەرکی چاودێریکردنی هاوڵاتیانی بیانیو بنەبڕکردنی ئاژاوەو نەهێشتنی کێشە ناوخۆییەکان لەئەستۆی ئەماندایە.[٢٨١]

هاوشان لەگەڵ کۆنسوڵەکان دوو دەستەی ئەنجومەنی پیران و ئەنجومەنی گەلیش هەبوە، ئەنجومەنی پیران لەسەردەمی کۆماریدا دەسڵاتەکەی لەسەر حسابی دامەزراوە سیاسیەکانی تر فراوان بوە، ئەم ئەنجومەنە هەندێك لەتایبەتمەندییەکانی ئەنجومەنی گەلی دابڕی و رۆلێکی کرداریی پیادەکردوە" ئیتر لەمەسەلەکانی تایبەت بەرێکخستنی ئیمتیازاتە داراییو سیاسیو کۆمەڵایەتییەکان بێت یان مەسەلەکانی پەیوەست بەچاودێریکردن و ئاراستەکردنی پەوەندییەکانی دەرەوەو مامەڵەکردن لەگەڵ ئەو دەوڵەتانەی لەسایەی رۆمادا بون.. ئەنجومەنەکە دانیشتنەکانی لەگەڵ دۆست و دوژمنەکانی رۆما بەڕیوەدەبرد، پێشوازیدەکرد لەباڵیۆزو نوێنەرانی

---

281– بڕوانە: محمد محفل: سەرچاوەی پێشوو.. ل ٢٨٤-٢٨٥ .

بیانیو باڵیۆزانی رۆمای دادەمەزراندو زانیاری پێدەبەخشین، دواجار هیچ شەڕێکی نیزامیو رێکەوتنێکیش بەبێ راوێژی ئەو نەدەبو، ئەگەر رەزامەندی لەسەر بەندەکانی ناو رێکەوتنامەکە دەرنەبڕیایە، بەڵام راگەیاندنی جەنگ لەدەسڵاتی ئەنجومەکەدا نەبوە، سەرکردەو فەرمانڕەوای هەرێمەکان راپۆرتی خۆیان بۆ ئەنجومەن بەرزدەکەنەوە، وەك چۆن سکاڵای دژ بەفەرمانڕەواکانیش هەر ئاراستەی ئەو دەکرا، هەروەها ویلایەتەکانی دابەشدەکردو کاری سەرکردەکانی پەسەند دەکردو ئەو مەرجانەشی دیاریدەکرد کە بەسەر شکستخواردوەکاندا دەسەپێنرا، ئەم تایبەتمەندیانە لەگشت جێگەکانی تردا تایبەتمەندی ئەنجومەنی گەل بون.[٢٨٢]

282- بڕوانە هەمان سەرچاوەی پێشوو.. لا ٣١٢ . لەگەڵ: فوستێل دی کولانج: سەرچاوەی پێشوو.. لا ٤٩٨ .

# سەردەمی ئیمپراتۆریی

ئەم سەردەمە بەئیمپراتۆر ئۆگۆستۆس (Augustus)[٢٨٣] دەستپێدەکات، ئۆگۆستۆس کۆتایی بەو شەڕە ناوخۆیانە هێنا کە وڵاتی رۆما گرتەوەو لەسەدەی یەکەمی پێش زایینیدا گەیشتبووە لوتکە، ساڵی (٢٧ی پێش زایین) دامەزراندنی سیستمی ئیمپراتۆرییەتی لەسەر بنەمای بونی ئەنجومەنی پیران و ئەنجومەنی گەل و فەرمانڕەوایانی هەڵبژێردراو راگەیاند ـ ئەگەرچی سەرەتا لەسەر دامەزراوەکانی سیستمی کۆماری مایەوە ـ بەڵام زۆری نەبرد بەرە بەرە لەم بنەمایانە لایداو تایبەتمەندییەکانی پاشایەتی رەهای پەسەندکرد، ئیمپراتۆر ـ کە پشتگیریی رەهای گەلی بەدەستهێناوە ـ دەرکی بەوەکرد کە ناکرێت بنەما کۆنانەکانی فەرمانڕەوایی بکرێنە روانگە بۆ بەڕێوەبردنی بارودۆخە هەنوکەییەکانی لەئیمپراتۆرییەتێکی بەرفراواندا، بۆیە دەبێت کۆمەڵە بنەمایەکی نوێ

---

283– ئۆگستس (٤٥) ساڵ لە (٢٧ ی پێش زایین تا ١٤ ی زایینی) فەرمانڕەوایی کرد، ئۆگستس کە مانای گەورەیە نازناوی ئەمریەتی، هەروەها بەپێودانگی ئەوەی سەرکردەی باڵایە بەئیمپراتۆر (Imperatoy)یش ناسراوە، ئەوەندە هەیە نازناوی (سەرۆک - Princeps) تەنیا نازناوێکە بەشێوەیەکی گشتی لێینراوەو ئەو دەسەڵاتەی کە هەیبووە لەرووە فەرمییەکە کات دیاریکراو بووەو دەبوو داوای دووبارەکردنەوەی بکردایە، ئۆگستس بەشداری بەئەنجومەنی پیران کردوە لەبڕیاردان لەکاروبارەکانی فەرمانڕەوایداو ئەگەرچی سەرووەری بۆ خودی ئۆگستس بووە کە بەئەندامی یەکەمی ئەنجومەنی ناوبراو دابنرێت.. بڕوانە: هارتمان و باراکلاف: الدولة و الامبراطورية فی العصور الوسطی، ترجمة و تعلیق جوزیف نسیم یوسف، دار المعارف، القاهرة-١٩٦٦ .. ل ٧١ .

دابنرێت بۆ بەڕێوەبردنی ئەم ئیمپراتۆرییەتە، لەگەڵ پارێزکاری ( بەڕواڵەت ) لەرێکخستنە کۆنەکاندا.[٢٨٤]

لەم سەروبەندەدا، ناوی فەرمانڕەوایی تایبەت بەسەر ئەم سێستمە نوێیەدا سەپێنرا، بەهۆی ئەو دەسڵاتە گرنگانەی کە ئەوکات ئەنجومەنی پیران هاوشان لەگەڵ ئیمپراتۆر پیادەی دەکرد لەسەر حسابی تایبەتمەندێتی سەرۆکی هەڵبژێرداروو ئەنجومەنە کۆنەکانی گەل، ئەم ئەنجومەنانە بەتەواوی دەسڵات و سایەی ونکرد، وەك چۆن فەرمانڕەوا هەڵبژێردراوەکانیش ملکەچی ئەنجومەنی پیران بون.

لەگەڵ ئەمەشدا لەکۆتایی ماوەی فەرمانڕەوایی ئۆگۆستۆسدا ئەم سێستمە پەرەی سەند بەرەو چەسپاندنی هەرچی دەسڵاتە بۆ ئیمپراتۆر: ئەنجومەنی پیران ئەو تایبەتمەندییانەی لەدەستدا کە پێشتر لەچوارچێوەی پەوەندییەکانی دەرەوەدا پیادەی دەکردو چیتر راگەیاندنی جەنگ و بەستنی هاوپەیمانێتی لەدەستیدا نەما، وەك چۆن ئەو دەسڵاتەی هەڵبژاردنیشی لەکیسچو کە لەئەنجومەنی گەل زەوتی کردبو، بەتەنیا پەیوەست بو بەدیاریکردنی ئەو کاندیدانەی کە لەلایەن ئیمپراتۆرەوە دادەمەزران و بەشێوەیەکی تەدریژی ئیمپراتۆر دەسڵاتی بۆخۆی قۆرخ دەکرد، بەچەشنێك فەرمانڕەوایی بووە فەرمانڕەواییەکی تاکگەرا.[٢٨٥]

---

284– سەبارەت بەو دیاردانەی چاکسازیی کە ئۆگستس ئەنجامیداون بۆ نمونە بڕوانە: ارستوفتنزف: تاریخ الامبراطورية الرومانية" الاجتماعی و الاقتصادی، ترجمةو مراجعة: زکی علیو محمد سلیم سالم، مکتبة النهظة المصرية، القاهرة–١٩٥٧، الفصل الثانی، الفصل الثانی عشر.

285– بڕوانە: الدکتور. ثروت بدوی: سەرچاوەی پێشوو.. ل ٩٤ . هەروەها بڕوانە:

ئەم قۆناغە کە بە (سەردەمی باڵای ئیمپراتۆرییەت) ناودەبرێت تاکو ساڵی (٢٨٤)ی زایینی درێژەی کێشا، کاتێك لەسەردەمی ئیمپراتۆر دیوقلیتان،[286] دامەزراندنی (ئیمپراتۆرییەتی خوارەوە) راگەیەندرا، لەم قۆناغەدا کە تاکو سەردەمی جستنیان بەردەوام بو، ماکی پاشایەتی رەها بەسەر فەرمانڕەواییەوە دەرکەوت و هەروەها ماکێکی دەستوریشی وەرگرت، لەکاتێکدا ئیمپراتۆرەکانی قۆناغی پێشو سێستمە تۆلیتاریەکانی خۆیان لەژێر پەردەی پاراستنی خەسڵەتەکانی کۆماریی کۆندا دەشاردەوە، لەگەڵ داننان بەهەندێك لەدەسڵاتە رۆتینییەکانی ئەنجومەنی پیران.. ئیمپراتۆرەکانی دواتر خۆیان لەو خەسڵەتانە دەربازکردو ئەنجومەنی پیران گۆڕا بۆ ئەنجومەنی (شارەوانی) تایبەت بەشاری رۆما، لەدەرەوەی ئەو شارە هیچ دەسڵاتێکی نەماو لەسەردەمی ئیمپراتۆر قۆستەنتین (٣٠٦-٣٣٧

---

- Gettell, op., cit.. p 65.

[286] - دیۆقلتیان کورسی عەرشی ئیمپراتۆرییەتی رۆمانیای لەنێوان ساڵەکانی (٢٨٤-٣٠٥)دا بەدەستەوە بووەو دەستەپێشخەر بووە لەئەنجامدانی چەند چاکسازیەکدا بۆ بەرێگەگرتن لەو روخانەی روبەڕوی دەوڵەت دەبونەوە، چاکسازییەکانی چەند لایەنێکی ئیداریی‌و سەربازیی‌و کاروبارەکانی فەرمانڕەوایی لەخۆدەگرت، وەك چۆن بایەخی بەلایەنی دارایی داوەو کاری بۆ بەرزکردنەوەی شانی ئیمپراتۆرییەت کردوە تاکو هاوشێوەی خواوەند/پەرستراوی لێهاتوە، پاش ئەوەی هەستیکرد یەك ئیمپراتۆر ناتوانێت بەتەنیا کارەکانی فەرمانڕەوایی‌و لێپرسراوێتییەکانی لەئەستۆ بگرێت، بەشێوەیەکی تیۆری هەستاوە بەدابەشکردنی ئیمپراتۆرییەت بەسەر دوو بەشدا، لەژێر باری ئەو بارودۆخە نوێیەدا مایەوە کە بەهۆی شاڵاوە داگیرکارییەکانی بەربەرەکان و دەرکەوتنی دیانەتی مەسیحیەتەوە لەسەر شانۆی روداوەکان زەقبوبونەوە، دیۆقلیتان ساڵی (٣٠٥) دەستی لەکورسی دەسڵات هەڵگرت و قوستەنتینی گەورە عەرشی ئیمپراتۆری گرتەدەست کە فەرمانی پێکراو ئەو کارە قورسە لەئەستۆ بگرێت.. بۆ نمونە بڕوانە: تشارلز وورث: الامبراطورية الرومانية، ترجمة: رمزی عبدة جرجیس، القاهرة-١٩٦١ .. ل ١٩٤-٢٠٠ .

زایینی) ئەنجومەنێکی هاوشێوە لەشاری قوستەنتینیەش دامەزرا، وەك چۆن فەرمانڕەواکانیش دەسڵاتی راستەقینەیان بەدەستەوە نەماو دامەزراندنیشیان بوە یەکێك لەتایبەتمەندییەکانی ئیمپراتۆر کە بەشێوەیەکی تەواو ملکەچی فەرمانەکانی بون و بەمەش گشت دەسڵاتەکان لەدەستی ئیمپراتۆردا کۆبووەوە.

لەمیانەی ئەم قۆناغەدا ئایینی مەسیحی دەستی بەبڵاوکردنەوە کرد، بەچەشنێك بووە ئایینی زۆرینەو بەتایبەت دوای ئەوەی ئیمپراتۆر قوستەنتین بنەماکانی پەیڕەوکرد.

وەرگرتنی کورسی دەسڵاتی ئیمپراتۆر بنەمای جێگیری نەبوە، بەڵکو بەگوێرەی بارودۆخی سیاسی هەنوکەیی گۆڕانی بەسەردا هاتوە" لەکاتێکدا دیۆقلیتان پێی وابو وەرگرتنی دەسڵاتی ئیمپراتۆرییەت لەرێگەی هەڵبژاردنی بەتواناترین و کارامەترین کەسەوە بێت، ئیمپراتۆر قوستەنتین دەیخواست بەدەستهێنانی پۆستی ئیمپراتۆری بەڕێگەی بۆماوەیی بێت لەچوارچێوەی خێزاندا بەبیانوی ئەوەی ئەم مافە لەخواوەندەوە وەردەگرێت، پاش کۆچی دوایی ئیمپراتۆر جولیان سوپا دەستی لەدامەزراندنی ئیمپراتۆر وەردەداو تەنانەت هەندێك لەئیمپراتۆرەکان لەبنەڕەتدا ئەفسەری سوپا بون.[٢٨٧]

ئیمپراتۆرییەت یەکگرتویی خۆیی تا ساڵی (٣٩٥) پاراست، کاتێك دابەشبو بۆ ئیمپراتۆریەتی خۆرئاواو پایتەختەکەی رۆماو ئیمپراتۆریەتی خۆرهەڵات کە قوستەنتینییە پایتەختی بو، لەکاتێکدا رەگەزی ئەڵمانی ئیمپراتۆرییەتی خۆرئاوای ساڵی (٤٧٦) روخاند، تورکەکان ساڵی (١٤٥٣) ئیمپراتۆریەتی خۆرهەڵاتیان لەناوبرد.

---

287- بڕوانە: الدکتور. ثروت بدوی: سەرچاوەی پێشوو.. ل ٩٥ .

# بەشی پێنجەم

## نموونە لەبیری سیاسی رۆمانی

لەچوارچێوەی شارستانییەتی رۆمانیدا دەكرێت ئاماژە بەكۆمەڵە نمونەیەكی بیری بكرێت كە بەشدارییە بیرییەكانی بەڵگەی رون پێكدەهێنن كە پێكەوە رەنگدانەوەی زیاتر لەهەقیقەتێكمان بۆ دەردەخەن: ئەم نمونە بیرییانە لەوانەیە رەنگدانەوەی ئاستی كاریگەری بیری سیاسی یۆنانمان بۆ دەربخات لەقۆناغی گەشەسەندیداو لەو دارشتنە سیاسیە بیرییانەی كە رۆمان پێشكەشیان كردوە، لەوانەیە لەقۆناغی دواتردا رەنگدانەوەی ئاستی كاریگەری بیری سیاسی یۆنانمان بۆ دەربخات لەقۆناغی پایزیدا لەسەر ئەم دارشتنە لۆژیكیانە، دواجار ئەم دارشتنە لۆژیكییانە دەبنە سەرەتا بۆ بیرۆكەی نوێ كە دواتر فەلسفەی مەسیحی تەبەنی كرد.

هەریەك لە پۆلیب و شیشرۆن و سنیكا لەخۆیاندا نمونەیەكی گوزارشتكەر لەسەر یەكێك لەم راستیانە پێكدەهێنن، پێویستە ئاشنای روانگە لۆژیكییەكانیان بین بۆ ئەوەی بوارمان هەبێت لەبەر رۆشنای ئەو روانگانەدا لەم هەقیقەتە دڵنیا ببینەوە.

# پۆلیب

هەرچ پێوانەیەك بۆ كاریگەریی بیری سیاسی گریكی لەسەر رۆما پێویستە تێیدا ئاماژە بەپۆلیب بكرێت بەوەی ئەڵقەی پەیوەستی نێوان بیری سیاسی یۆنانیو سیاسەتی رۆمانی پێكدەهێنێت.[٢٨٨]

پۆلیب هاوڵاتی دەوڵەتی ئەركادیایە كە ئەندامێكی گرنگی یەكێتی پەیمانی یۆنانییە Achean Leaque لەنێوان ئەو هەزار سەركردەی ئەم یەكێتییەدا بوە كە دەستگیركران و وەك دەستبەسەر رەوانەی رۆما كرا لەئاكامی شۆرشێكدا كە چەند كەسێكی توندڕەوی لایەنگری رۆما لەو یەكێتییەدا پێی هەستابون.. ئەم ئاپۆڕەی دەستبەسەرانە هەرگیز نەدرانە دادگاو بۆ ماوەی هەڤدە ساڵ بەدەستبەسەری مانەوە، بەجۆرێك دوای تەواوبونی ماوەكە ئەوانەی كە مابونەوە (كە ژمارەیان سێسەد كەس بو) ئازادكران.[٢٨٩]

ساڵەكانی دەستبەسەری بەئاسانی بەسەر پۆلیب دا تێپەڕین كە زیاتر وەك میوانێكی رۆما تەماشا دەكرا لەوەی كە تێدا زیندانی كرابێت،[٢٩٠] هاوڕێی نزیكی سیپۆ Seipio[٢٩١] بو، ئەم هاوڕێتییە هەلی

---

288– بڕوانە: الدكتور. ثروت بدوی: سەرچاوەی پێشوو.. لا ٩٧ .

289- Ebenstein, William, op., cit.. p 36.

290- Harmon, op., cit.. p 81.

291– بەزێنەری قرتاجەیەو چاكەی دەستپێكردن بەرێوشوێنەكانی تێكەڵكردنی نمونە پێویستەكانی ئایدۆلۆژیا كە ئەفزەلیەتی ئەدەبیو بیرییەكی ئەوتۆی بەخشییە رۆما كە لەگەڵ بەرفراوانبونی داگیركارییەكانیدا بگونجێت، سیبۆ

بۆ رەخساندو رێگەی بۆ کردوە بکاتە ناوەندی باڵای سیاسی لەرۆما، ئەم پەیوەندییە دۆستانەو هاوڕێتییە بەتینانە توانیان لەلایەکی دیکەوە خۆشەویستی رۆما لەدڵی پۆلیبدا دروست بکەن، بۆیە بووە هاوپەیمانیو لایەنگری تەواوی خۆی بۆ سێستمەکەی دوپاتکردوە.[٢٩٢]

پۆلیب بەگوڕوتینەوە مێژو و دامەزراوەکانی رۆمای خوێندو بەسێستمی دەوڵەتی رۆما سەرسام بو، بەخشندەیی سیپۆ هەلی بۆ رەخساند لێکۆڵینەوەی مێژویی قوڵ و نایاب ئەنجام بدات، بەجۆرێك لەمیانەی شاندە سەربازییو دیبلۆماتییەکاندا بەشداری گەڕانی کرد لەهەندێك لەبەشی کیشوەرەکانی ئەورپاو ئاسیاو ئەفەریقا، لەئاکامدا چل کتێبی دانا، کە جگە لەپێنج کتێب و چەند بەشێکی کتێبەکانی تری هیچی بەدەست ئێمە نەگەیشتوە.

پۆلیب لەکتێبەکانیدا باسی لەگرنگترین قۆناغەکانی مێژویی سیاسی رۆما کردوە، لەکاتی سەرکەوتنی بەسەر مەقدۆنیاساڵی (٢١٠) پێش زایین و بەرە بەرە گۆڕانی لەدەوڵەتێکی بچوکەوە بۆ ئیمپراتۆرییەتێکی جیهانیو کتێبەکانی بەرەسەنایەتیو کارامەییو

---

زۆر بەوریاییەوە بەم کارە هەستاو بەبێ ئەوەی پایەباڵایی رۆمای لەبیر خۆی بردبێتەوە، سیبۆ هیچ کتێبێکی بەجێنەهێشتوە، بەڵام ژیانی سیاسی کە لەسەر پێگەی کەسایەتی بەندەو لەسەر هاوکارییەکانی خۆشبەختی" بەرەنگاربونەوەیە لەگەڵ بیروبۆچونەکانی کاتۆن (Caton)، وەك چۆن هاوڕی یۆنانییەکانی سیبۆ لەنمونەی بانیتیۆس و پۆلیب رۆڵێکی گەورەیان گێڕا لەداڕشتنی بیری سیاسی نوێدا.. بڕوانە: توشار: تاریخ الفکر السیاسی: سەرچاوەی پێشوو.. لا ٥٨ .

292- Elliot, William and Neil, Mcdonald., Western Political Beritage, Prence- Hall INC., Englewood Clifts, N.J., 1963.. p 86.

وردبونەوە جیادەکرێتەوە، بەجۆرێك ئەو مافەی پێبەخشیوە لەگەڵ هیرۆدۆست و (سیۆدیدس)[293].. ببێتە یەکێك لەگەورەترین مێژونوسە کۆنەکانی یۆنان.. مەبەستی پۆلیب ئاشکراکردنی هۆیەکانی مەزنی رۆما بوە، ئەوەشی دۆزییەوە کە بەوەڵامی ئەوەی دەزانی کە هۆکارەکان بریتی نیین لەگەورەیی سەرکردەکان و سەرکەوتنە سەربازییەکانی، بەڵکو لەبنەڕەتدا دەگەڕێتەوە بۆ مەزنی جێبەجێکردن و پیادەکرنی بەتواناو هۆشمەندانەی بۆ گشت کاروبارە سیاسیەکانی.. هەروەها قەشەنگیو گەورەیی دەستورە (تێکەڵ) کەی کە لەو مەترسیانە دەربازی دەکات کە هەمیشە چوارچێوە ناتێکەڵەکان روبەڕوی دەبنەوە: دەوڵەتی پاشایەتی پیرۆز، دەوڵەتی ئۆلیگارشیەو دەوڵەتی دیموکراسی.

بەمشێوە تیۆری دەستوری تێکەڵاو MixedConstitution دەبێتە روانگەیەکی گەوهەری بیروبۆچونەکانی پۆلیب و بەڵگەکانی پابەندبون پێوەی لەبیرۆکەی ئەو خولەوە وەردەگرێت کە پێشتر بیریارەکانی گریك پێشکەشیانکردبو، ئەو دەوڵەتەی پشت بەیەکێك لەسێ شێوازە باوەکەی فەرمانڕەوایی دەبەستێت (شێوازیی پاشایەتی یان شێوازی ئەرستۆکراتی یان شێوازی دیموکراسی) بێگومان ئەو دەوڵەتە بەرەو گەندەڵی دەچێت.

پاشایەتی بەزۆرداریی کۆتایی دێت و ئەرستۆکراتی دەبێتە کەمینەو ئۆلیگارشیو دیموکراسی دەگۆڕێت بۆ فەرمانڕەوایی ئاژاوە، بۆ پشتڕاستکردنەوەی ئەم گریمانەیە ئاماژە بەسیستمی فەرمانڕەوایی سپارتە دەکات کە سێ شێوازیی فەرمانڕەوایی پێکەوە

293- Ebenstein, William, op., cit.. p 35.

تێکـــەڵکردوە: پاشــــایەتیو ئۆلیگارشــــییەو دیموکراســـی.. ئـــەم فەرمانڕەواییە چانسی بەردەوامیو سەقامگیریی هەبوە زیاتر لەهەر سیستمێکی فەرمانڕەواییو لەهەر یەکێك لەدەوڵەتە شارەکانی گریك.. لێرەوەو بەجێبەجێکردنی لەسەر ئیمپراتۆرییەت پۆلیب بیرۆکەی سیستمی تێکەڵاو وەك باشترین شێوازی فەرمانڕەوای پێشکەشدەکات و باشترین جۆرەکانی دەستوریش ئەوەیانە گوزراشت لەگەوهەری ئەم سیستمە دەکات.[294]

پۆلیب ئەوەشی رونکردوەتەوە کە رۆما دەتوانێ بەپەنابردنە بەر دەستوری تێکەڵاو سنورێك بۆ لادانی سروشتی بەرەو گەندەڵی دابنێت، لەم دەستورەدا رەگەزە سادەکانی شێوە حکومییەکان لەهێزی یەکسان بەهرەمەند دەبن (بەجۆرێك هێزی ئەم تێکەڵاوییە رێگەمان نادات بڵێین ئەم سیستمە پاشایەتییە یان ئەرستۆکراتییەو یان دیموکراسییە) هەریەك لەمانە توانای هەیە رێگە لەزیادەڕەوییەکانی ئەوانیتر بکات و نەهێڵێت دەسڵاتی خۆی بەسەر رەگەزەکانی تردا بسەپێنێتو لەحاڵەتی رودانیدا (باڵادەستی) ئەوا دورترین هەڵوێستی چاوەڕوانکراو ئەوەیە کە توتالیتێری بەو ئەندازە نابێت کە لەگەڵیدا شۆڕش بجوڵێنێ یان ئۆلیگارشییە بەرادەیەك بێزاری خەڵکی ببزوێنێ یان دیمکراسیەتی دسپلینەکراو بکاتە رێگەیە بۆ ئاژاوە، بۆیە ئەم سیستمی (تێکەڵ)ە بواری بەرەو پێشچون و بزاوت دەدا، بەڵام ناگاتە ئەو ئاستەی کۆنترۆڵ نەکرێت.[295]

---

294- Harmon, op., cit.. p 81-82.
295- Ibid.,

بیرۆکەی سیستمی تێکەڵ (بەبڕوای پۆلیب) لەسیستمی رۆمادا بەدیهاتوە، دەستوری ئەم وڵاتە هەریەك لەسیستمی پاشایەتی‌و سیستمی ئەرستۆکراتی‌و سیستمی دیموکراسی لەچوارچێوەی یەك سیستمی تێکەڵدا کۆکردوەتەوە، ئەگەر لەمیانەی کۆنسوڵەکانەوە تەماشامانکرد بڕیاری ئەوەی بەسەردا دەدەین کە پەیڕەوی لەسیستمی پاشایەتی دەکات و ئەگەر لەمیانەی دروستبونی ئەنجومەنی پیرانیشەوە لێی بڕوانیین دەبینین دەستوری ئەرستۆکراتییە، بەڵام ئەگەر لەگۆشەنیگای ئەنجومەنەکانی گەلەوە تەماشامانکرد دەڵێین دەستوری دیموکراسی‌یە.[٢٩٦]

ئەوەی لەکۆتایدا ئاماژەی پێبدرێت سەبارەت بەتیۆری سیستمی تێکەڵ پرەنسیپ و گەوهەری روانگە بیرییەکانی پۆلیبە بەمشێوە:

١. خولی حکومەتەکان و ئەو گەندەڵیی‌و داڕوخانەی پێی دەگات مەسەلەیەکی بڕاوەیە، واتە یاسایەکی نەگۆڕەو دابەشکردنی شەشی حکومەتەکان دیاردەیەکی پەیوەستە بەئەزمونی یۆنانەوە بەتەنیا.

٢. ئەو یاسای کۆنترۆڵی خولی حکومەتەکان دەکات ـ بەگوێرەی وێناکردنی پۆلیب ـ بەسەر حکومەتی تێکەڵدا جێبەجێنابێت.

٣. حکومەتی تێکەڵ لەسەر بنەمای هاوسەنگی‌و یەکسانی چینە کۆمەڵایەتییەکان دادەمەزرێت، نەك لەئەنجامی هاوسەنگی هێزی سیاسییەوە وەك ئەوەی ئەرستۆ بۆی چوە.[٢٩٧]

---

296– بڕوانە: الدکتور. ثروت بدوی: سەرچاوەی پێشوو.. ل ٩٧-٩٨ .

297– بڕوانە: الدکتور. ابراهیم درویش: سەرچاوەی پێشوو.. ل ١٩٣ .

کاریگـەریی پۆلیـب بیریارەکـانی سـەردەمی خـۆی تێپەڕانـدوەو بیریارەکانی سەردەمەکانی دواتریشـی گرتوەتـەوە، سەرباری کاریگـەری لەسـەر شیشـرۆن لەمیانـەی ئـەوەی کردویەتییـە یـەکێك لەگـەورەترین و زۆرتـرین کـەس کـە بایـەخ بـەبیری سـەردەمی کـۆن دەدەن، بـیرە سـەرەکییەکانی ـ لەمیانـەی سـەردەمی ناوەڕاسـتەوە ـ کارگەریگـەری لەسـەر بیریـاران هـەبوە بەشـێوەیەکی ئێجگـار جیـاواز لـەوەی لـەلای مارسـیلیۆس بـادو تۆمـاس ئـەکوینی تێبینـی دەکـەین، بـەڵام لـەماوەی نوێـدا هەریـەك لـەلۆك و مۆنتیسـکۆ قورسـاییەکی نوێیـان خستەسـەر بیرۆکـەی هاوسـەنگی دەسـڵاتەکان، وەك چـۆن لەمێـژوی ویلایەتـە یـەکگرتوەکانی ئـەمریکادا پۆلیـب ڕۆڵێکـی بـیری گرنگـی گێـڕاوە لەداڕشتنی دەستوری ئەمریکادا، سەرکردە سیاسیەکانی ئەو قۆناغەی دروستبون (جیفرسۆن ئادمز و ئەوانیتر) بەتـەواوی پۆلیبیان دەناسی، بۆیە پەنایان بردە بەر بیرەکانی لەداڕشتنی ئەو دەستورەدا کە لەسـەر پرەنسـیپی دسـپلین و هەوسـەنگی ئـازادی لەمیانـەی حکومـەتێکی پابەندەوە دامەزراوە.[298]

298- Ebenstein, William, op., cit.. p37.

## شیشرۆن - Cicero

لەلاپەڕەکانی مێژوی ڕۆماندا، ناوی گەلێك لەزانایان و پیاوانی دەوڵەت و سەرکردەی سەربازی هاتوە، بەڵام لەگەڵ ئەمەشدا ناوی فەیلەسوفی سیاسی مەزنی تێدا نەهاتوەو (شیشرۆن)[299].. سەرباری ئەوەی پارێزەرێکی کارامەو پیاوی دەوڵەت خاوەن تواناو وتاربێژێکی کاریگەربو، دەکرێت وەك حاڵەتێکی ناوازە لەم ڕاستییە

---

299– شیشرۆن ساڵی (١٠٦ پێش زایین) لەدایکبووەو ساڵی (٤٣ ی پێش زایین) مردووە، یاسای لەڕۆماو فەلسەفەی لەئەتیناو زانستی هەمەچەشنەی لەفێرگەکانی یۆنان وەرگرتوەو چەندین پۆستی حکومەتی لەئەستۆ گرتوە تاکو گەیشتوەتە پۆستی ڕاوێژکاری دەوڵەت لەساڵی (٦٣ پێش زایین).
شیشرۆن لەناو گەرمترین ڕوداوەکانی ئیمپراتۆرییەتی ڕۆمادا ژیاوەو هاوچەرخ بووە لەگەڵ کۆتاییەکانی سێستمە کۆمارییەکەیدا، هەروەها ڕوخانی ئەم سێستمەی لەسەر دەستی یۆلیۆس قەیسەر بینیوە کە دکتاتۆریەتێکی سەربازیی دامەزراندوە، شیشرۆن بڕوای بەمیانڕەویی سیاسی و سێستمی دەستوریو فەرمانڕەوایی تێکەڵ هەبووەو بەبەنمونەی ڕۆماو نهێنی سەرکەوتنەکانی لەقەڵەمداوە، هەر لەبەرئەمەشە دژایەتی دکتاتۆریەتی (قەیسەر)ی کردوەو بەوە تۆمەتباری کردوە کە هۆی شکستهێنانی ڕۆمایە لەچارەسەری کێشە کۆمەڵایەتییەکانیدا، ئەوانەی لەدواڕۆژەکانی کۆتایهاتنی سێستمی کۆماریدا دەستیان بەسەرهەڵدان کردوە، شیشرۆن لەبەر ڕۆشنایی دامەزراوە دەستورییەکاندا هەبوەکان لەگەڵ ئاراستەی بەرەو سێستمی پاشایەتی لەسایەی حکومەتی تێکەڵدا، چارەسەرگەلێکی بۆ ئەو کێشە کۆمەڵایەتیانە خستەوەتەڕوو.. بەیەك ساڵ پاش تیرۆکردنی (یۆلیۆس قەیسەر) لایەنگرانی ئەنتۆنیۆ ساڵی (٤٣ ی پێش زایین) هەستان بەکوشتنی شیشرۆن.. بڕوانە:
الدکتور. ابراهیم درویش: سەرچاوەی پێشوو. لا ١٩٤ . هەروەها بڕوانە:
- Foster, op., Cit.. p 180.

دابنرێت، تەنیا کەسە کە دەشێت نازناوی فەیلەسوفی سیاسی کارامەی پێببڕێت.[٣٠٠]

بەڵام ئەم نازناوە مانای ئەوە نییە کە نەوترێت بەرهەمە بیرییەکانی شیشرۆن بەشێوەیەکی بنچینەیی رەنگدانەوەی لەسەر سیاسەت هەبوە وەك ئەوەی لەسەر تیۆری سیاسی هەیبێت، ماك و گەوهەرێکی گریکی پێوە دیاربوە، ئەمەش یان لەبەرئەوەی لەبیری فەیلەسوفەکانی پێش خۆیەوە (ئەفلاتۆن و ئەرستۆ) هەڵیهێنجاوە یان لەو بیرانەکەی کە لەسەردەمی خۆیدا سەریان هەڵداوە (رەواقییە)[٣٠١]..هەر لەبەر ئەمەشە بەرهەمە بیرییەکانی (کۆمار .. یاساکان) بەتەواوی گونجاوە لەگەڵ ئاماژەکردن بەو ئاستی پەرەسەندنەی کە لەسەردەمی فەلسەفەی کلاسیکی گریکەکانەوە تیۆری سیاسی لەئامێزگرتوە.

لەگەڵ داننان بەکاریگەری روانگە بیرییەکانی شارستانیەتی گریك لەسەر چارەسەرە سیاسیەکانی شیشرۆن، بەڵام ئەمەش بەمانای ئە وە نایەت کە لاسایکردنەوەیەکی رەهای بیرەکانی پێشتر لەئارادایە ئەگەرچی فەیلەسوفەکانی گریك (ئەفلاتۆن و ئەرستۆ)یش لەبەرهەمە سیاسیەکانیاندا پێشکەشەیان کردبێت، ئەوەی شیشرۆن لەهەردوو کتێبەکەیدا (کۆمار) و (یاساکان)[٣٠٢]دا هێناونی لەبیری

---

300– بڕوانە: سباین: ج٢ : سەرچاوەی پێشوو.. ل ٢٣٤ . بۆ زانینی رای بەرامبەر بڕوانە:

- Ebenstein, William, op., cit.. p 39.

301- Foster, op., cit.. p 181.

302– کتێبی (کۆمار)ی شیشرۆن لەماوەی نێوان (٥٤-٥٢ی پێش زایین)دا بەشێوەی دیالۆگێك داڕێژراوە کە بەگریمانە لەباخچەی شیپیۆی بچوکی ئەفریقیساڵی (١٢١ی پێش زایین) رویداوە، کتێبەکە شەش کتێبی سەرەکی

سیاسی لەزۆر لایەنەوە جیاوازە لەو بیرە سیاسییەی کە ئەفلاتۆن لە "کۆمار"و "یاساکان"یدا باسی لێکردون، لەم بوارەدا تەنیا ئەوەندە بەسە ئەوە بەیاد بهێنینەوە: لەکاتێکدا شیشرۆن هەست یان وشیاری بەجیهان هەبووە Asense of the world هیچ کامێك لەئەفلاتۆن یان ئەرستۆ هەرگیز بایەخیان بەدورکەوتنەوە لەچەمکی دەوڵەتی شار نەداوە وەك دورترین گوزارشت لەرێکخستنی سیاسی، هەروەها لەکاتێکدا هەریەك لەئەفلاتۆن یان ئەرستۆ لەتیۆر سیاسیەکانیاندا هیچ پێگەیەکیان بۆ مرۆڤ دانەناوەو لەبەرئەوەی جیهان بەسەر گریك بەربەرییەکاندا دابەشدەبێت و بەربەرییەکانیش لەتێڕوانینی ئەرستۆدا پلەیەك لەخوار ئاستی گریکە شارستانییەکانن کە مافی بەکۆیلەکردنیان هەیە، دەبینین شیشرۆن تەواو بەپێچەوانەی ئەمەوە گوزارشت لەتێڕوانینێکی جیهانی فراوانتر دەکات کە بەئەزمونە سیاسیو ئیدارییەکانی رۆماو ئیمپراتۆرییەت چاودێری کردوەو

---

لەخۆدەگرێت: هەردوو کتێبی یەکەم و دووەم تەرخانە بۆ مەسەلەی سروشتی کۆمۆنۆیلت و وەسفکردنی مێژوی رۆماو هەوڵدان بۆ ئاشکراکردنی دەوڵەتی نمونەیی‌و پیاوی دەوڵەتی نمونەیی، کتێبی سێیەم بنەماکانی دادوەرییو پێناسەکانی تاوتوێ دەکات، کتێبی چوارەم جەختکردنەوەیە لەسەر فێربون، ئەگەر کتێبی پێنجەم بەتەواوەتی ونبوبێت، ئەوا کتێبی شەشەم بریتییە لەوێناکردنی (خەون)ەکەی شیپیۆ.

بەڵام کتێبی (یاساکان) لەماوەیەکی دواتری نوسینی کتێبی (کۆمار)دا ساڵی (٤٧ زایینی) نوسراوە، کتێبەکە شێوەی وتوێژێکی لەخۆگرتوە لەنێوان شیشرۆن و کونتوس (Quintus) و چەندین کەسایەتی دەربارەی موڵکەکانی شیشرۆن، ئەم کتێبە لەسێ کتێبی سەرەکی لەخۆدەگرێت: کتێبی یەکەم بەشێوەیەکی فەلسەفیانە سەبارەت بەیاسای سروشتی دەدوێ‌و لەکتێبی دووەمدا نمونەگەلێکی ئایینی دەخاتەڕوو کە لەگەڵ هەر حکومەتێک دەگونجێت، بەڵام کتێبی سێیەم هەمان ئەو نمونەگەلانە دەخاتەڕوو بەڵان تایبەت بەیاسای دەستوریی.. بڕوانە:

- Bowle, op., Cit.. p 91-95.

بەئەنگیزە هلینستییەکانی ڕەواقییەکان کە لەناوچەی دەریای سپی ناوەڕاست بڵاوبوتەوە پشتگیری کردوە.[٣٠٣]

ئەم پێشەکییە پوختە هانمان دەدات پرسیار دەربارەی دیارترین ئەو بیرۆکانە بکەین کە بەرهەمە بیرییەکانی شیشرۆن لەخۆی گرتبون و ڕەنگدانەوەی ئەو هەقیقەتانەی پێشەوە بون، لەچوارچێوەی وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارانە پێویستە چەمکی دەوڵەتی تەواو و سروشتی لەلای شیشرۆن ڕونبکەینەوە، سەرباری توێژینەوەی تیۆری یاسای سروشت.

## یەکەم: بنەماکانی دەوڵەتی تەواو

چەمکی دەوڵەت لەلای شیشرۆن لەسەر دوو پایەی بنەڕەتی بەندە، کە بریتین لەبیرۆکەی دەستوری تێکەڵ و بیرۆکەی پەرەسەندنی مێژویی خولی دەستورەکان.

١. بیرۆکەی دەستوری تێکەڵ خۆی لەدەستوری ڕۆمادا دەبینێتەوە بەوەی لەتێڕوانینی شیشرۆنەوە تەواوترین ئەوەیە کە دەشێت بەهۆی ئەزمونی سیاسیەوە سیستمێکی فەرمانڕەوایی ئەوتۆی پێ بەدیبهێنرێت کە هەریەك لەسەقامگیریی‌و کەماڵی لەخۆیدا کۆکردبێتەوە.

گەوهەری ئەم بیرۆکەیە لەسەر بنەمای دابەشکردنی حکومەتەکان بۆ پاشایەتی‌و ئەرستۆکراتی‌و دیموکراسی (گەل) بەندە، لەکاتێکدا دەسڵات لەسیستمی پاشایەتی‌دا لەدەستی یەك کەسدا کۆدەبێتەوە، ئەم دەسڵاتانە لەسیستمی ئەرستۆکراتیدا

303- Ebenstein, William, op., cit.. p 40.

لەدەستی کەمینەیەکدایە لەتوێژێکی دیاریکراو. بەڵام سیستمی دیموکراسی (گەل) سەرجەم دەسڵاتەکان لەسایەیدا دەکەوێتە دەست تەواوی گەل.

کاتێك شیشرۆن بەراورد لەنێوان ئەم سیستمانەدا دەکات، سیستمی پاشایەتی بەچاك دەزانیو لەروی چاکییەوە لەدوای ئەو سیستمی ئەرستۆکراتی دێت، هەرچی سیستمی دیموکراسییە خراپترین چەشنەکانی فەرمانڕەواییە، سیستمی نمونەیی ئەو سیستمەیە کە هەر سێ سیستمەکەی تێدا کۆبوەتەوەو سیستمێکی میانڕەوەی لێپێکهاتوەو گشت رەگەزەکانی گونجاون لەگەڵ یەکتر،[٣٠٤]

کەواتە شیشرۆن ئەو سیستم یان دەستورە تێکەڵەی دەوێت کە لەسەر بنەمای تێکەڵکردنی هاوسەنگیی نێوان رەگەزەکانی هەڵهێنجراو لەسیستمی پاشایەتیو سیستمی ئەرستۆکراتیو سیستمی دیموکراسی (گەل) پێکهاتوەو لەروانگەی کۆکردنەوەی نێوان سێ سیستمەکە لەکۆکردنەوەی نێوان دوو سیستم باشترە.. وەك ئەوەی ئەرستۆ کردویەتی کاتێك سیستمە تێکەڵەکانی لەئەنجامی تێکەڵکردنی تەنیا هەردوو سیستمی دیموکراسیو ئۆلگارشییە پێکهێناوە، بڕوابونی شیشرۆن بەلایەنە باشەکانی دەستوری تێکەڵ ئەگەرچی لەریشاڵەکانیدا بۆ ئەرستۆ بگەڕێتەوە، بەڵام بەو مانایە نییە نەوترێت بەهەمانشێوە دیراسەی مێژوی رۆمانی کردوە کە ناکرێت چاودێریکی زیرەك و کارامەی وەك شیشرۆن هەڵەی تێدا بکات.

---

304- Ibid., p 41.

٢. بەڵام بیرۆکەی پەرەسەندنی مێژویی خولی دەستورەکان بنچینەکەی بریتییە لەوەی حکومەتەکان هەمیشە لەبەردەم روبەروبونەوەی گەندەڵیدان کە لەکۆتایدا دەبێتە هۆی شۆڕشە یەك لەدوای یەکەکان، فەرمانڕەوایی پاشایەتی ناکرێت گەندەڵ نەبێت و پەرەنەسێنێت بۆ فەرمانڕەوایی زۆرداریی و فەرمانڕەوایی ئەرستۆکراتی دوچاری داڕوخان دەبێت و دەگۆڕێت بۆ فەرمانڕەوایی ئۆلیگارشییەو سێستمی دیموکراسیش هەڵدەگەڕێتەوە بۆ فەرمانڕەوایی (رعاع) ئاژاوەگێڕ.[٣٠٥]

## دووەم: سروشتی دەوڵەت

شیشرۆن لەو بڕوایەدایە دەوڵەت بەرهەمی سروشتی غەریزەی کۆمەڵایەتی مرۆڤە، ئەم لەم بیربۆچونەیدا بەشێوەیەکی گشتی لەگەڵ بیرۆکەی رەواقییەکان بۆ دەوڵەت یەکدەگرێتەوە بەوەی دامەزراوەیەکی عەقڵانی قبوڵکراوە، هاوکات لەگەڵ ئەبیقۆرییەکان

---

[305]– سبیان لەمبارەوە دەڵێت: شیشرۆن لەبەدبەختی ئەو رەسانایەتییەی لەدەستدا نەبووە کە یارمەتیدەری دەبوو لەئەفراندنی تیۆرەکی نوێدا کە دەدرایە پاڵی و رۆڵی دەبوو لەدەوڵەمەندکردنی بیری سیاسی بەنمونەیەکی نوێی پشت ئەستور بەریشاڵی رۆمانی ئازاد لەهەر کۆنترۆڵێکی سەرچاوە گریکییەکان، تیۆرەی پۆلیپ دەربارەی خولی مێژوو و کارلێکی لەسەر دەستور، هەروەها پەرەسەندنی ئەم دەستورانە لەخراپەوە بۆ چاک.. بایسی رێزگرتن و سەرسامییە بەرامبەر بەم تیۆرە لەبەرامبەر ئەو دروستیەی لۆژیک کە خەسڵەتی بنەڕەتی بووە، بەڵام تێبینییە ئەزمونگەرییەکان کە بووە هۆی دانانی ئەم تیۆرە پشتی بەرێڕەوی روداوەکانی ناو شارە دەوڵەت بەستوە، ئەمەش راستییەکە هەرگیز لەبیری شیشرۆن نەچووەتەوەو لەوانەیە لەوەش گەیشتبێت کە ئەم تیۆرە لەگەڵ بیروڕاکانی خۆی تایبەت بەمێژویی رۆمانی ناگونجێت، بۆیە دەکرێت بوترێت شیشرۆن ئەم تیۆرەی دانەڕشتوە زیاتر لەوەی جارێکیتر بەخراپی لەبارەیەوە بدوێ، هاوکات ئەوەی رابردوو کە زیاتر رونی لۆژیکی و هەماهەنگی لەگەڵ مێژوی دەوڵەتە شاردا هەیە.. بڕوانە سباین: ج٢: سەرچاوەی پێشوو.. ل ٢٣٨ .

پێچەوانە دەبێتەوە کە دەوڵەتیان بەبونەوەرێکی دروستکراو زانیوە کە لەئەنجامی بەرژەوەندییە خودییەکانی تاکەکەسەکان دێتەئاراوە.[٣٠٦]

سەرباری رێکەوتنی شیشرۆن لەگەڵ رەواقییەکان سەبارەت بەدیاریکردنی دەلالەتی دەوڵەت، لەگەڵ ناکۆك بوە کاتێك وای بۆچوە کە دەوڵەت دامەزراوەیەکی سیاسی جیاوازە لەکۆمەڵ و جیای کردوەتەوە لەحکومەت، دەسڵاتی سیاسی بۆ گەل بڕیاردراوە کە لەحکومەت پێکهاتوە، بەمەرجێك ئەم حکومەتە وەك جێگری (گەل) پیادەی دەسڵات بکات.

دەوڵەتیش وەك ئەوەی شیشرۆن لێی تێگەیشتوە، بریتییە لەکەسێکی مەعنەوی کۆمەڵە کەسێك لەخۆدەگرێت کە بەهاوبەشی لەنێوان خۆیاندا خاوەنی دەوڵەت و یاساکەین، بەم هۆیەوە بەوتەیەکی پڕبایەخ پێناسەی دەکات بەوەی (**بەرژەوەندییە هاوبەشەکانی خەڵکی**)یە، لەلێرەدا مەبەستی لەخەڵکی ئەوانەیە کە بەژمارەی زۆر کۆدەبنەوەو رێکەوتنی هاوبەش دەربارەی یاساو مافەکان و پابندییەکان و ژیانی هاوبەش و سروش لەکارکردنی هاوبەش یەکیاندەخات لەپێناو بەدیهاتنی سودی هاوبەشدا.[٣٠٧]

کەواتە، ئەم دەوڵەتە، لەو دامەزراوە دەچێت کە لەخاوەندارێتییەکەیدا گشت هاوڵاتیان ئەندامن و هەڵدەستێت بەپێدانی بەرهەمی یارمەتیدەر هاوبەش و فەرمانڕەوایی دادوەر، سێ ئەنجام لەسەر ئەمە دێتەئاراوە، ئەوانیش:

---

306- Getteli, op., cit.. p 74-75.

307- بڕوانە: سباین: سەرچاوەی پێشوو.. ل٢٤٢ .

١. لەبەرئەوەی دەوڵەت و یاساکەی موڵکی خەڵکی یەکگرتون، هێزەکەی لەهێزی کۆمەڵە تاکەکەسێکی یەکگرتووەوە سەرچاوە دەگرێت، خەڵکی هاوشێوەی رێکخراو خۆی فەرمانڕەوای خۆی دەکات و ئەو هێزەیە کە لەتوانایدا پارێزگاری لەبون و درێژە بەمانەوەی بکات.

٢. بەکارهێنانی هێز بەشێوەیەکی یاسایی تەندروست لەراستیدا بەکارهێنانی هێزی گشت خەڵکییە، فەرمانبەری گشتی کاتێك کارەکانی ئەنجام دەدات پشت بەو دەسڵاتە دەبەستێت کە بەهۆی پۆستەکەیەوە هەیەتی‌و پشتگیریشی لەمەدا ئەوەیە کە خۆی بەبەشێك لەو یاسایە دەزانێت.

٣. خودی دەوڵەت و لەناویشیدا یاساکەی، هەمیشە ملکەچی یاسای خواوەند یان یاسای سروشتی دەبێت، ئەو یاسا باڵایە کە لەسەروی هەڵسوکەوتەکانی مرۆڤ و رێکخراوە دنیاییەکانەوەیەو، بەکارهێنانی هێز هیچ نییە جگە لەکارێکی نەخوازراوە لەسروشتی دەوڵەتدا کە ناکرێت دابرێژرێت مەگەر بەهۆی پێداویستی زۆرەوە بەو هێزە بۆ جێبەجێکردنی پرەنسیپەکانی دادوەریی‌و راستی.[٣٠٨]

دەسڵات بەپێی ئەوەی خراوەتەڕو لەگەڵەوە سەرچاوە دەگرێت، فەرمانڕەوا بەبێ گەڕانەوە بۆ یاسا پیادەی ناکات و بیانوی بنەڕەتی بونی (واتە دەسڵات) ئامانجێکی ئەخلاقییە.[٣٠٩]

---

308– هەمان سەرچاوەی پێشوو.. ل ٢٤٣ . بەراوردی بکە لەگەڵ: الدکتور. درويش: سەرچاوەی پێشوو.. ل ١٩٨-١٩٩ .

309– بڕوانە: سباين: سەرچاوەی پێشوو.. ل ٢٤٣ .

## سێیەم: تیۆری یاسای سروشتی

لەوانەیە گەورەترین شتێك شیشرۆن بەشێوەیەکی کرداریی لەپەرەسەندنی بیری سیاسیدا بەشداری تێدا کردبێت تیشك خستەنە سەر تیۆریەی ڕەواقییەکانی لەیاسای سروشتدا، بەشێوەیەك دایڕشتنەوە کە بەرەو بیری خۆرئاوای ئەورپای برد، لەسەردەمی خۆیەوە تاکو سەدەی نۆزدەیەم ئەو ماکەی بەسەروە ما.. سەرەتا کەوتە دەست یاساناسانی ڕۆماو ئنجا پاپاکانی کڵێسا، هەندێك لەبڕگە گرنگەکانی ڕاڤەکردنەکەی وەك هەمیشە لەسەدەکانی ناوەڕاستدا وەك سەرچاوە بۆ سەلماندن پشتی پێدەبەسترا.[٣١٠]

تیۆری شیشرۆن دەربارەی یاسای سروشت لەو وتەدا کورتدەبێتەوە کە بونی یاسای سروشتی گشتی لەواقیعی چاودێری خواوەند بەگشت جیهان سەرچاوەدەگرێت، وەك چۆن لەسروشتی عەقڵانیو کۆمەڵایەتی مرۆڤیشەوە سەرچاوەی گرتوە، ئەو سروشتەی کە خەڵکی لەخواوەندەوە نزیك دەکاتەوە و لەم تیۆردا بیرۆکەی دەستوری دەوڵەتی جیهان هەیە، واتە تەنیا دەستورێك لەگشت جێگەکاندا.. گۆڕانی بەسەردا نایەت لەپابەندکردنی گشت خەڵکیو سەرجەم نەتەوەکان بەفەرمانەکانییەوەو هەر دەستورێکیش بەپێچەوانەی بڕگەکانی ئەم دەستورەوە دەربچێت شیاوی ئەوە نییە ناوی یاسای لێبنرێت: چونکە هیچ کەسێك فەرمانڕەوا بێت یان ژێردەستە ناتوانێت لەچاکە خراپە بەرهەم بهێنێت.[٣١١]

---

310– بڕوانە: هەمان سەرچاوەی پێشوو.. ل ٢٣٩ .

311– بڕوانە: الدکتور. علی عبدالمعطی محمد: الفکر السیاسی الغربی: سەرچاوەی پێشوو.. ل ١١٠-١١١ .

کەواتە شیشرۆن لەو بڕوادایە، یاسای سروشتی هاوتایە لەگەڵ عەقڵ و ئەمەی دواییان (عەقڵ) خۆی لەو سروشتەدا دەبینێتەوە کە خودی ئەنگیزەی عەقڵانییەتە، ئنجا هەریەك لەعەقڵی مرۆڤایەتیو سروشت لەسەرچاوەیەکی باڵاوە هەڵدەقوڵێن کە سەرچاوەی هێزی خوداییەو دواجار یاسا کۆمەڵە خەسڵەتێکی گشتگیرو جیهانیو جێگیرو ئەزەلی هەیە، بۆیە راست نییە گۆڕانکاری لەم یاسادا بکرێت یان بەشێکی لەکاربخرێت یان بشێوێنرێت ویان لەگرنگییەکەی کەم بکرێتەوە.

بۆ دورخستنەوەی هەر ئاڵۆزییە کە لەوانەیە کار لەبێگەردی سروشتی یاسای سروشتی بکات، شیشرۆن بەگوزارشتێکی پوخت ئەم یاسایە پەسندەکات و دەڵێت:

لێرەداو لەواقیعدا یاسایەکی هەق هەیە بریتییە لەیاسای بەڵگەنەویستیو بیرکردنەوەی تەندروست، یاسایەکە لەگەڵ سروشتدا کۆکەو بەسەر هەمو خەڵکیدا جێبەجێدەبێتو یاسایەکی نەمرەو گۆڕانی بەسەردا نایەت، پێویستە بەگوێرەی بەندەکانی گشت خەڵکی پابەندییەکانیان جێبەجێبکەن بەرامبەر ئەو بەندانەی قەدەغەکردنن، وەك چۆن کاتێکیش خەڵکی دەکەونە هەڵەوە، هەڵەکانیان دەستنیشان دەکات.. ئەو یاسایە ناکرێت بڕگەکانی بەداڕشتنی یاسای مرۆڤکرد لەکاربخرێت، وەك چۆن ناشکرێت سنور بۆ چوارچێوەی جێبەجێکرنی دابنرێت یان لەکارخستنی بڕگەکانی.. تەنانەت ئەنجومەنی پیران و کۆمەڵەی گەل ناتوانن ناچارمان بکەن دەست لەئەرکەکانی سەرشانمان بەرامبەر بەم یاسایە فەرامۆش بکەین.. ئەم یاسایە بۆی نییە بڕیارێك بەسەر رۆماو بڕیارێکی تر بەسەر ئەتینادا بسەپێنێت و وەك ناکرێت بۆ ئەمڕۆ بڕیارێك و بۆ

سبەینێ بڕیارێکی تری هەبێت، جگە لەیەك یاسای نەمری نەگۆڕ هیچ یاسایەکی دیکە نییەو بەسەر گشت خەڵکیو بۆ هەمو کاتێك دەست دەدات، خەڵکی جگە لەسەردارو فەرمانڕەوایەك هیچی تری نییەو ئەویش خواوەندە کە یاساکەی داڕشتوەو راڤەو چاودێری دەکات، ئەوەی سەرپێچی بەندێکی ئەم یاسایە دەکات.. شایستەی ئەوەیە توندترین سزا بدرێت، ئەگەرچی خۆیشی لەسزاکانی سەرپێچیکردن لەیاسا دەستکردەکانیش بەدور گرتبێت.[312]

کەواتە جیهان بەگوێرەی ئەم وێناکردنەوە یەك جیهانەو یەك یاسای هەیە کە بۆ هەمو نەتەوەیەك و گشت کاتێك دەستدەدات، لەبەرئەوەی خاوەن یەك سروشتەو ئامانجی بەدیهاتنی دادوەریی‌و چاکەیە مادامێکی لەسروشتی خواوەندی دادوەرو چاکەوە سەرچاوەی گرتوە.

تاکەکەسەکان لەسایەی ئەم یاسادا یەکسانن، بەڵام واتای یەکسانی نییە لەسامان و زانیاریی‌و توانا زاتییەکاندا، هیچ دانایییەکی تێدا نییە گشت خەڵکی لەم تایبەتمەندییانەدا لەدەوڵەتێکی دیاریکراودا یەکسان بن.. ئەو یەکسانییەی شیشرۆن لێرەدا مەبەستییەتی ئەوەیە گشت تاکەکەسەکان یەکسان بن لەخاوەندارێتی عەقڵ و بیروباوەڕیان سەبارەت بەبنەماکانی ئابڕو یان (الخسه)، هەر ئەمەشە لەگەڵ بیربۆچونەکانی ئەرستۆدا نایەتەوە کە جەخت لەسەر جیاوازیی تاکەکەسەکان دەکاتەوەو لەئەستۆگرتنی دەوڵەت لەکەمینەیەکدا کورتدەکاتەوە کە شایستەی پۆست و سامان و رەچەڵکی هەیە، بەجۆرێك لەتوانایدا بێت لێپرسراوێتی

---

312– سباین: سەرچاوەی پێشوو.. ل ٢٣٩-٢٤٠ .

فەرمانڕەوایی لەئەستۆبگرێت.. لەکاتێکدا شیشرۆن جەخت لەسەر یەکسانبونی گشت تاکەکەسەکان دەکاتەوە لەمافە یاساییو یەکسانبون لەبەردەم خواوەندداو لەبەردەم یاسای باڵادا،[٣١٣] .. و هەر ئەمەشە دواتر بیری مەسیحی پەیڕەوی لێکردوە.

ئەمە بەواتای ئەوە نایەت شیشرۆن بڕوای بەدیموکراسیەتی سیاسی هەبوبێت، بەڵکو ویستویەتی هەندێك لەکەرامەت بەتاکەکەسەکان ببەخشێت کە بریتییە لەگرنگترین مافەکانی مرۆڤ، تەنانەت کۆیلەکان پێویستە پشکیان تیایدا هەبێت، چونکە ئەوان بەتەنیا بریتیی نین لەئامێرێکی زیندوە، وەك ئەوەی ئەرستۆ باسیکردوە سەردارەکانیان بەمەبەستی بەرهەمهێنان بەکاریان بهێنن.

لەراستیدا ئەو بیرانەی شیشرۆن پێشکەشی کردون سەبارەت بەیەکێتی جیهان ی‌و یاسای جیهانی‌و یەك دەسڵاتی جیهانی‌و بەدرێژایی سەردەمی ناوەڕاست پرەنسیپی سەرەکی بیری سیاسی بوە.[٣١٤]

---

313- هەمان سەرچاوەی پێشوو..

314- Getteli, op., cit.. p 76.

بەندی سێیەم

## Seneca - سینێکا

ئەگەر شیشرۆن نوێنەرایەتی بیری ڕەواقییەی کردبێت لەساڵەکانی کۆتایی سەردەمی کۆماریدا، ئەوا سێنیکا،[315] (٤پێش زایین-٦٥ زایینی) گوزارشتی لەو بیرەی ڕەواقییەکان کردوە لەساڵەکانی یەکەمی سەردەمی ئیمپراتۆریی، گومانی تێدا نییە بیرەکانی سێنێکا ماکێکی ئایینی ئاشکرایان پێوەدیارە، لەکاتێکدا

---

315- سێنێکا لەقورتبە لەئەسپانیا لەدایکبووە، لەسەرەتای تەمەنیەوە هاتوەتە ڕۆماو فەلسەفەو یاسای خوێندوە، بەڵام پاش ئەوەی میراتێکی گەورەی لەباوکیەوە بۆ ماوەتەوە وازی لەخوێندنی یاسا هێناوەو لەبەرئەوەی بەوتارەکانی هەریەک لەکالیکۆلاو کلۆدیۆسی تورەکردوە بۆ ماوەی هەشت ساڵ (٤١-٤٩ زایینی) بۆ کۆرسیکا دورخراوەتەوە، لەوێ دوچاری نەخۆشی ڕەبۆ بووەو تراژیدییەکانی داناوە، سێنێکا گەڕێنراوەتەوە سەر خزمەتەکەی لەلایەن باوکییەوە نیرۆن (ئەگرپینا - Agripina) کە هەر لەتەمەنی یانزە ساڵییەوە مامۆستاو ڕابەری بووە، بەزنجیرەیەک نامە دیلۆگی لەگەڵ کردووەو تیایاندا سروشتی فەلسەفەی ڕەواقییەی ڕونکردوەتەوە، کاتێک نیرۆن بووە ئیمپراتۆر سێنێکا بڕێکی زۆری خستە سەر سامانەکەی، بەڵام لەگەڵ ئەمەشدا ژیانێکی ئاسایی ژیاوەو نەیتوانی نمونەی ژیانی ڕەواقییە بگوزەرێنێت کە نوسینەکانی لەپێناویدا تەرخانکردبوو، پاشا سوتانە گەورەکەی ڕۆما ساڵی (٦٤ زایینی) سێنێکا بڕی زۆری پارەکەی تەرخانکرد بۆ بونیادناوەی ڕۆماو سەرباری ڕۆڵی گرنگی وەک ڕاوێژکاری نیرۆن بڕیاری پاشەکشەی داو لەکۆتایدا سەرکەوتو بوو لەمانەوەی لەماڵدا، بەجۆرێک توێژینەوە زانستییەکانی (توێژینەوەکانی تایبەت بەسروشت) و کامڵترین بەرهەمەکانی تری (توێژینەوە ئەخلاقییەکان)ی لەماڵەوەدا نوسیوەو کاتێک سێنێکا بەسوکایەتییەوە وەڵامی نێردراوێکی نیرۆنی دایەوە، بڕیاری کوشتنی دەکرد: بەهێمنی قوڕگی کردووەو ئنجا شەرابێکی ژەهراوی خواردو ئەمیش هاوشێوەی سۆکرات بەوە کۆتایی بەژیانی هێنا.

بەرهەمــە بیرەکــانی شیشــرۆن لەچوارچــێوەی بازنــەی یاســاییە ئەبستراکتەکە دەرنەچوە.

لەمیانــەی بــەراوردکردن لــەنێوان بیرەکــانی هەریــەك لــەدوو کەسـایەتییەکە (شیشـرۆن و سـێنێکا) خۆمـان لەبـەردەم خـاڵی زۆری پێکگەیشـتن و جیاوازیـدا دەبینینـەوە، هـەردوکیان لـەو بـڕوادا بـون سروشت ئەو بنچینەیە پێشکەش دەکات کە پێویستە تاکەکەسەکان لەسـایەیدا بـژین، هـەردولایان پرەنسـیپی یەکسـانی مرۆڤایـەتییان پەسـەند کـردوە، بەچاوپۆشـی لـەوەی سـێنێکا زۆر رونـتر لەشیشـرۆن بەرگری لەم پرەنسیپە کردوەو جەختی کردوتـەوە لەسەر ئاماژەکردن بـەوەی کـە جیـاوازیی نێـوان سـەردارو کۆیلەکـەی تـەنیا مەسـەلەیەکی زاراوەیـەکی یاساییەو تـەنیا بەدبەختییـە مـرۆڤ دەکاتـە کۆیلـە، بۆیـە سـێنێکا زۆر بەتونـدی هاوشـێوەی شیشـرۆن و رەواقییـە یەکەمـەکان ئـەو وتـەی ئەرسـتۆی رەتکردوەتـەوە کـە پێـی وایـە مرۆڤـەکان بەسروشت یەکسان نین.[٣١٦]

رەواقیبـونی سـێنێکا بەشـێوەیەکی زۆر تونـد دەردەکـەوێت ئەگـەر بەراورد بکرێت لەگەڵ راواقیبونی شیشـرۆندا، شیشـرۆن گەشـبین بـوە بەرامبەر ئەوەی گەڕانەوەی مـەزنی بـۆ رۆمـا پەیوەسـتە بەخستنەگەڕی ئـەو چاکسـازییەی کـە بـەرەو هێـزو یـەکێتی کۆمارەکـەی دەبـات، بـەڵام سـێنێکا هـەروەها بـڕوای وابـوە کـە کۆسـار باڵـاترە لـەئیمپراتۆر، بـەڵام لەگــەڵ ئەوەشــدا ئومێــدی لاوازبــو ســەبارەت بەگەڕانــەوەی گیــانی ســەردەمی کــۆن بــۆ ســەردەمی ئیمپراتــۆریی،[٣١٧].. لــەبارودۆخێکی

316- Mcdonald, Western Political theory, op., cit.. p 74-75.
317- Ibid.,

هاوشێوەدا پاشایەتی رەها تەنیا سیستمێك دەبێت کە لەتوانایدایە فەرمانڕەوایی بپارێزێت، (خسە)و داڕوخانی تەواوی خەڵکی دیموکراسییەتی کردوەتە کارێکی مەحاڵ، کارەکان بەشێوەیەك خراپ بون جێگەیەك بۆ پرسیارکردن نەماوە کە ئایا پێویستە فەرمانڕەوایی رەها بێتەئاراوە، بەڵکو پرسیارەکە بەمشێوەی لێهاتوە کە لەاوانەیە لەرێگەلادەر بێت؟

رەشبینی لەلای سێنێکا گەیشتە ئەندازەیەك بانگەشەی ئەوە بکات" پشت بەستن بەلەرێگەلادەرێت باشترە لەوەی پشت بەجەماوەر ببەسرێت، و جەماوەری گەل بریتییە لەخراپەو گەندەڵی کە زۆر دڵڕقانەتر لەفەرمانڕەوای لەرێگەلادەر دەردەچێت و ئنجا ئاشکرایە کارامە بون لەسیاسەتدا نابێتە نەسیبی پیاوێکی چاك ئەگەر سەرچاوەی چاکەی لەناخی خۆیدا لەناو نەبردبێت و پیاوی چاك و عاقڵ لەتوانایدا نییە لەسایەی ئەم بارودۆخەدا بەنزیکبونەوەی لەئەرکە سیاسیەکان خزمەت بەڕۆڵەکانی هۆزەکەی بکات، بەم هۆیانەوەو چەندین هۆی دیکەوە سێنێکا بایەخێکی گەورەی بەجیاوازیی سیستمەکانی فەرمانڕەوایی نەداوە، وەك چۆن شیشرۆن کردویەتی، بەلای ئەمەوە لەبەرئەوەی هەمویان دەستەوەستانن لەبەدیهێنانی چاکە بۆ ئەوانیتر کەواتە هەمویان لەخراپەدا یەکسانن، چاکبون یان گەندەڵبونی حکومەت بەگوێرەی تێڕوانییەنەکانی سێنێکا تەنیا پێوەرەکانی سود بڕیاری لەسەر دەدەن.[٣١٨]

ئەمەش بەو مانایە نایەت سێنێکا لەو بڕوادا بێت پیاوێکی دانا دەبێت لەو کۆمەڵگەیە بکشێتەوە کە تیایدا دەژی، بەڵکو

---

318– سباین: سەرچاوەی پێشوو.. لا ٢٥٧ .

جەختیکردوەتەوە لەسەر ئەوەی پیاوی چاك پێویستە بەئەرکە ئەدەبییەکەی خۆی هەڵسێت ئەویش بەپێشکەشکردنی خزمەتەکانی لەهەر وێنەیەکدا بێت و لەم هەڵوێستەیدا لەگەڵ شیشرۆن یەکدەگرێتەوەو لەئەبیقۆرییەکان دوردەکەوێتەوە کە وای بۆدەچون سودە تایبەتییەکانی خۆیان لەسەر حسابی بەرژەوەندی گشت بەدیبهێنن، سێنێکا -جیاواز لەشیشرۆن و فەیلەسوفە سیاسیو کۆمەڵایەتییەکان- وێنای بونی وەزیفەیەکی کۆمەڵایەتی کردوە بەبێ داواکردنی پۆستێکی سیاسی لەدەوڵەتدا یان کارێکی خاوەن مۆرکێکی سیاسی.[٣١٩]

ئەم وێناکردنە وای لەسێنێکا کرد لەو بڕوادا بێت کە دوو جیهان بۆ مرۆڤەکان لەئارادایە ئەوانیش جیهانی بچوك (جیهانی ئەو دەوڵەتەی کە تیایدا دەژی) و جیهانی گەورەتر (پێکهاتوە لەگەشت بونەوەرە عاقڵەکان کە مرۆڤایەتی بەیەکترەوە دەبەستێتەوە) پەیوەندییە مەعنەوییو ئاینییەکان لەجیاتی پەیوەستییەکانی یاسای سیاسی تیایدا باوە.

بێگومان ئەم بیروڕایانە لەگەڵ ئەو بیروڕایانەدا زۆر لەیەکدەچن کە دواتر مەسیحییەکان پێشکەشیانکردوە، باوەڕبونی سێنێکا بەکۆمەڵگایەکی ئاینی سەربەخۆ لەکۆمەڵگای سیاسی هاوتایە لەگەڵ روانگە بیرییەکانی مەسیحییەکان کە جەخت لەسەر بونی دوو دەسڵات دەکاتەوە: یەکەمیان ئاینیو دووەمیان زەمەنی، لەلایەکی دیکەوە لەم هەڵوێستەیدا لەگەڵ فەلسەفەی کۆنی یۆنانیدا

319– هەمان سەرچاوەی پێشوو . بەراوردی بکە لەگەڵ:
- Harmon, op., cit.. p 87.

یەکناگرێتەوە کە پێی وابوە دەوڵەت تەنیا ئامرازێکە بوار بۆ مرۆڤ دەرەخسێنێت بگاتە کەماڵی ئەخلاقی، هەر ئەمەش شیشرۆن دوپاتیکردوەتەوە کەوا پابەندبونی ئەخلاقی تاکەکەس لەوەدا بەدیدێت کە ئەم تاکەکەسە تەنیا خزمەتی وڵاتەکەی بکات.[٣٢٠]

کاتێك سێنێکا هەڵویستی بەرامبەر بەدەوڵەت دەردەبڕێ، تێبینی دەکەین پێچەوانەی بیروباوەڕەکانی پیش خۆیەوە کە هەریەك لەئەفلاتۆن و ئەرستۆ خستویانەتەڕو، دەوڵەت بەلای سێنێکاوە مەرجی پێویست نییە لەپەرەسەندنی چاکەو ژیانی چاکەدا وەك چۆن بیریارەکانی گریکی کۆن وای بۆ دەچون، بەڵکو ڕەنگدانەوەی سروشتی مرۆڤی خراپەکارەو لەمیانەی گەشەپێدانی ئەم بیرەوە سێنێکا تیرۆرییەکی لەبارەی سەردەمی ئاڵتونی یان (حاڵەتی سروشتی) داڕشت کە وای لێچاوەڕوان دەکرێت رۆڵێکی گرنگ لەمێژوی بیری سیاسیدا بگێڕێت.

ئەم تیۆر، تیۆری سەردەمی ئاڵتونی لەو بۆچونەی سێنێکادا پوختدەبێتەوە کە پێیوایە بونی سەردەمی ئاڵتونی پێش سەردەمی شارو دەوڵەت کەوتوەو مرۆڤ لەو سەردەمەدا (ئاڵتونی) بەختەوەریی‌و بەرائەتی خۆی پاراستوەو عاشقی ژیانێکی سادەی خاڵی لەگشت کەمالیاتەکانی شارستانییەت و تێچونەکانی‌و رواڵەتەکانی بوە، ئەو سەردەمە چاوچنۆکی تێدا نەبوە کە لەئارەزویی خاوەنداریێتی تایبەتەوە سەرچاوەی گرتوە، هەر بۆیە ئەنیگزەی تاکەکەسی لەئارادا نەبوەو تاکەکەسەکان هەستیان بەپێویستبونی یاساکان یان ئامرازەکانی ملکەچکردن نەکردوە، تاکەکەسەکان بەهۆی

---

320- Ibid.,

ساوێلکەیی‌و دڵپاکییان گوێڕایەڵی عاقڵ وپیاوچاکەکانییان بون، عاقڵەکانیش ئەو دەسڵاتەیان بەمەبەستی بەدەستهێنانی سودە تایبەتەکانی خۆیان بەکار نەدەهێنا، بەڵکو پێش هەر شتێك خزمەتی بەرژەوەندی گشتییان دەکرد لەمیانەی شوێنکەوتنی بڕیارەکان و بنەما سروشتییەکانەوە، لەبەرئەوەی هەمیشە تەنیا بڕیاری دادپەروەرە.[٣٢١]

لەگەڵ دەستپێکردنی ئارەزویی تاکەکەسەکان لەخاوەنداریتی‌و تەنانەت چاوچنۆکی کۆنترۆڵی ناخی فەرمانڕەواکانی کردو گۆڕینی بۆ کەسانێکی سودگەرایی‌و لەرێگەلادەری تۆتالیتێرو تاکەکەسەکان کەوتنە هەوڵی ئەوەی چۆن موڵکەکانیان بەرفراوان بکەن، ئنجا بونی یاساکان و جێبەجێکردنی زۆرە ملێ و رێکخستنی موڵکایەتی تایبەت هاتەئاراوە، سێنێکا ئەم دیاردە خراپەی داناوە بەوەی کە ئەنگیزەی مرۆڤی گومڕا هێناوییەتە کایەوە، پیاوی چاك لەو بڕوادا نییە بونی حکومەت و یاسای خاوەنداریتی پێویست بێت، ئەم دیاردانە گوزارشتێکی رونە لەونکردنی ئەو پاکییە لەلایەن مرۆڤەوە.[٣٢٢]

سێنێکا لەم بیروڕایەیدا کۆکە لەگەڵ سروشەکانی کەڵێسای مەسیحیدا کەپێی وایە مرۆڤ پێش ئەوەی دابەزێتە سەر زەویی لەبەهەشتدا ژیاوەو ئەم بەهەشتە هاوشێوەی ئەو سەردەمی ئاڵتونی‌یە کە سێنێکا بڕوای بەبونی هەبوە، ئەو تایبەتمەندییانەی مەسیحییەکان داویانەتە پاڵ بەهەشت هیچ جیاوازییەکیان نییە

---

321- Ibid.,

322– هەروەها بڕوانە: سباین: سەرچاوەی پێشوو.. ل٢٦٠ .

لەگەڵ ئەو تایبەتمەندییانەی سێنێکا سەبارەت بەسەردەمی ئاڵتونی، نەبونی موڵکداریی تایبەت ماکی سێستمی کۆمەڵایەتییە تیایدا، وەك چۆن هیچ جۆرە یاسەیەك یان دیاردەیەکی زۆرەملێی دەسڵاتی تێدا نەبوە، ئایا ئەمە هەمان ئەو تایبەتمەندییانە نیین کە سێنێکا دابونیە پاڵ سەردەمە ئاڵتونییەکەی؟

لەراستیدا سێنێکا لەروانگەی ئەم تیۆروە نەیویستوە هێرش بکاتە سەر خاوەنداریێتی یان یاسا و یان حکومەت، بەڵکو ویستویەتی دەریبخات کە ئەم سێستمانە لەڕوی ئەخلاقەوە تەواو نین، بەڵکو سێستمن بەپلەی دووەم، ئەگەر بتوانرێت مرۆڤایەتی بگەڕێندرێتەوە بۆ پاکیەتیەکەی یەکەمی، ئەوکات دەگەڕێتەوە بۆ ئەو کۆمەڵگەی کە پێویستی بەم چەشنە لەسێستمانە نابێت، بەڵام ئەگەر تاکەکەسەکان گەیشتنە پلەیەکی ترسناك لەگەندەڵی ناکرێت بەبێ ئەم سێستمانە ژیان بگوزەرێنن، تەنانەت پێویست و سودمەندیش دەبێت، مانای ئەوەیە دەوڵەتی نوێ ناتوانێت دەستبەرداری سێستمی موڵکداریی تاکەکەس یان هەر چەشنێکی تری سێستم یان یاساکان ببێت.

وێناکردنی سێنێکا بۆ حکومەت وەك چارەسەرێکی سەرکەوتوی ئەو خراپەی کە لەناخی مرۆڤایەتییەوە سەچاوەی گرتوە، وەك بەڵگە لەسەر ئاستی گۆڕانکاری بیروڕا بەرامبەر بەبەها بیرییە مەعنەوییەکان دەهێنرێتەوە، ئەم بیرە نوێیە بەتەنیا لەپیرۆز ڕاگرتنی سێستمە سیاسیەکانی بیری گریکی دەرنەچوە، بەڵکو دەرچویی ئەو پەرەسەندنەشە کە بیری شیشرۆنی پێگەیشتوە، بێگومان بیروڕاکانی سێنێکا زۆر جیاوازە لەوێناکردنی کۆن کە خۆی لەو بۆچونەی ئەرستۆدا دەبینێتەوە کە پێیوایە دەوڵەتی شار ئەو وێنەیە کە

پێویسته ژیانی شارستانی لەسەر بونیادبنرێت، هەروەها تەنیا هۆیە بۆ گەیشتن بەتایبەتمەندییەکانی مرۆڤ لەبەرزترین پلەکانی پێشکەوتن و پەرەسەندنیدا، ئەو گۆڕانکارییەی سینێکا لەبیروباوەڕی خۆیدا سەبارەت بەئەرکەکانی دەوڵەت هێنایەکایەوە بەشێوەیەکی فراوان بەرامبەر دەوەستێتەوە لەگەڵ ئەو پەرەسەندنەی تیۆرکانی شیشرۆندا تێبینی دەکرێت دەربارەی یەکسانی مرۆڤایەتی.[٣٢٣]

لەکۆتایدا دەتوانرێت ئەوە بوترێت ئەو بیروڕایانەی هەریەك لەسینێکاو شیشرۆن پێشکەشیان کردوە بوە هۆی هەڵوەشاندنەوەی بیری کۆن هەر لەبنچینەوە: بیرۆکەی یەکسانی گشتی، بیرۆکەکانی مرۆڤایەتیو شۆڕشکردن لەدەوڵەت لای سینێکاو داننان بەبونی هێزێکی کاریگەر کە هەوڵی راستکردنەوەی ڕێڕەوی ژیان و پوختکردنەوەی لەخراپەی ئەوانەی لەسەر زەویدان، گشت ئەمانە رێگەخۆشکەر بون بۆ دەرکەوتنی بیرەکانی پاپا یەکەمەکانی کلێسا، لەچوارچێوە گشتییەکەیدا وەك گوزارشتێك لەئاستی کاریگەری ئەم بیرانەی لەسەری هەیان بووە.

---

323– هەمان سەرچاوەی پێشوو.. ل ٢٦٢-٢٦٣ .

## بەشی شەشەم

# بنەما یاساییو پەیوەندییە نێودەوڵەتییەکانی رۆما

شارستانییەتی رۆما کۆمەڵە سیستمێکی یاسایی چەسپاندوە کە تا رۆژگاری ئەمرۆ زۆرێك لەسیستمە یاساییەکان پشتی پێدەبەستن، لەبەرئەوەی پێشتریش رونمانکردوە،[٣٢٤] کە ناکرێت بیری سیاسی لەسەر چوارچێوەی هەڵسوکەوت لەگەڵ دەسڵات بەواتای سیاسیەتی ناوخۆدا کورتبکرێتەوە، بەڵکو گشت ئەو شتانە دەگرێتەوە کە پەیوەستن بەپێوەندییە نێودەوڵەتییەکان و جوڵاندنی هێزە سیاسیەکان لەسەر ئاستی دەرەوە، ئەم بەشە بۆ لێکۆڵینەوە لەسێ لایەنی سەرەکی تەرخاندەکرێت کە بریتین لە: لایەنی یاسایی شارستانییەتی رۆماو تیۆری پەیوەندییە نێودەوڵەتییەکانی رۆما، ئنجا بەشداریکردنی بیری سیاسی رۆما کارێکی گونجاو دەبێت لەگەڵ روانگەی خستنەڕوی پێشکەشکراودا.

---

324– بڕوانە پێشەکی ئەم کتێبە.

# یاساکانی رۆما

ئەو قۆناغە کلاسیکییەی کە هاوچەرخی پەرەسەندنی زانستی رۆمانیا بوو هەردوو سەدەی دووەم و سێیەمی زاینییە، دانراوی گەورە زانایان لەو سەردەمەدا لەئیسنکلۆپیدیای ئیمپراتۆر جستنیان دا کۆکرانەوە کە لەساڵی ٥٣٣ بڵاوکراوەتەوە.[٣٢٥]

یاساناسان، ئەوانەی بیروبۆچونەکانیان لەم ئیسنکلۆپیدیادا تۆمارکراوەو ئەوانەی کە سێستمەکەی جستنیان لەسەدەی شەشەمدا پیادە دەکرد، دانیان بەسێ شێوازی یاساییدا ناوە کە ئەوانیش بریتیین لە:

[325] بیرۆکەی نوسینەوەی یاسای رۆمانی دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی (٤٦٢ پێش زایین) ئەو دەمانەی رۆمانەکان دەستیانکرد بەدروستکردنی لیژنەو ناردنی ئەو لیژنانە بۆ شارەکانی یۆنان بەمەبەستی سود وەرگرتن لەیاساکانی ئەو شارانە، ئەم لیژنانە ساڵی (٤٥٠ پێش زایین) هەوڵەکانی خۆیان خستەگەڕو توانیان ڕێساگەلێکی ڕێکوپێک دابڕێژن و لەسەر دوانزە تابلۆ (The twelve tables) جێگیری بکەن و لەگۆڕەپانێکی گەورەدا دای بنێن، یاساکانی دوانزە تابلۆکەو بەندە یاساییەکانی تریش کە دواتر داڕێژرابون بەمەبەستی ڕێکخستنی پەیوەندییە یاساییەکانی دەوڵەتی رۆمانی بۆ نزیکەی هەزار مانەوە، تا ئەو دەمەی ئیمپراتۆر (جەستنیان) هەڵیوەشاندەو لەجێگەیدا کۆمەڵە یاساییە بەناوبانگەکەی خۆی دانا، سەبارەت بەپەرەسەندنی یاسای رۆمانیاو تابلۆ دوانزەییەکە بڕوانە: محمد مدڤل: سەرچاوەی پێشوو.. ل٢٤٨-٢٥٦ .

١. **یاسای شارستانی** – Jus civile

٢. **یاسای گەلان** – Jus gentius

٣. **یاسای سروشتی** – Jus nastural

یاسای شارستانی: بریتییە لەیاسای ئەهلی دەوڵەت یان ئەو کۆمەڵە بنەمایە لەسەر هاوڵاتیانی رۆما جێبەجێدەکرا، یاسای گەلان مەبەست لێی ئەو بنەما رێکخراوەی پەیوەندییەکانی رۆمایە لەگەڵ نەتەوەو گەلانی تردا، بەڵام یاسای بیانییەکان هاوکاتە لەگەڵ پەیدابونی دەوڵەتی رۆمانی لەسەر شێوازی ژمارەیەك بنەمای سەربەخۆ لەیاسای گەلان، ئەم یاسایە بەسەر ئەو هەرێمانەدا جێبەجێدەکرا کە راقی نەبوون یان هێشتا مافی هاوڵاتی بونی رۆمایان بەدەست نەهێنابو.[٣٢٦]

لێرەدا پێویستە ئاماژە بەجیاوازی نێوان یاسای گەلان و یاسای سروشتی بکرێت کە سەبارەت بەزانایانی رۆما هەمیشە لەپلەی یەکەمی کارەکانیاندا نەبووە، بەڵکو هەردوو یاساکە گوزارشتیان لەیەك مانا دەکرد، ئەویش ئەو پرەنسیپە گشتیانەی گەلە جیاوازەکانی جیهانە کە دانی پێدانراوە یان کۆمەڵە پرەنسیپێکی لۆژیکییە کە دەقی یاسایی نەگۆڕ ناگرێتەوە، بەڵام جیاوازیی (لەنێوان ئەم یاسادا) بووەتە راستییەکی واقعی پاش ئەوەی یاسادارێژەرانی رۆما سێستمی کۆیلایەتییان کردە پێوەری ئەم جیاوازییە: سروشت ئەوە دوپاتدەکاتەوە، هەموو خەڵکی بەئازادیی

326– بڕوانە: الدكتور. نزارالطبقجلی: سەرچاوەی پێشوو.. ل ١٤٧–١٤٨ .

لەدایك دەبن و یەكسانن لەكاتێكدا یاسای گەلان ڕێگە بەكۆیلایەتی دەدات و قبوڵی دەكات.[٣٢٧]

ئەندازەی جیاوازیی نێوان هەردوو یاسا ناوبراوەكە لەهەر ئاستێكدا بێت، یاسادارێژەرەكان گومانیان لەبونی یاسایەكی باڵاتر لەو یاسایانەی كە لەلایەن دەوڵەتەوە دانراون نەبووە، ئەو یاسا گشتیو نەگۆڕو پیرۆزە، بیرۆكەی بونی ئەم یاسا (باڵا)یە لەمیانەی سەدەكانی ناوەڕاستدا تەشەنەیكردو لەسەدە نوێكاندا روی لەكزی كرد.

یاسادارێژەرانی ڕۆمان لەو بڕوادا بوون كە سروشت كۆمەڵە پرەنسیپێكی دیاریكراوی داناوە پێویستە لەبنەما یاسییە دانراوەكانیشدا هەبن، یاسای سروشت بەگوێرەی لۆژیكی ئەو یاساداڕێژانە ڕاڤەكاری پرانسیپەكانی دادوەریی گشتییە، ئەویش پرەنسیپە سروشتییە نەمرەكانە كە بڕیار لەسەر ڕێزگرتنی پەیماننامەكان و دادوەریی لەمامەڵەی نێوان تاكەكەسەكان و پاراستنی ناكامەكان (لەمنداڵان) و پارێزگاریكردن لەژنان دەدات لەگەڵ داننان بەو داخوازییانەی لەسەر بنەمای خوێن و خزمایەتی هاتونەتە كایەوە.[٣٢٨]

ئەم پرەنسیپانە هاندەر بوون لەهەنگاونانی یاسای ڕۆما بەرەو پێشەوە، كۆمەڵە پەیمانێكی ناچاریی ڕێكەوتنی نێوان تاكەكەسەكان هاتەكایەوەو دەسڵاتی باوك بەسەر كوڕەكانیدا تێكشكاو ئافرەتی شووكردو پێگەیەكی یاسایی بەدەستهێنا كە لەگەڵ مێردەكەیدا

327- بڕوانە: سباین: سەرچاوەی پێشوو.. لا ٢٤٧ .
328- هەمان سەرچاوەی پێشوو.. لا ٢٤٩ .

لەروی بەڕێوەبردنی موڵك و پەروەردەكردنی منداڵەوە یەكسانی دەكات، كۆمەڵە ڕێوشوێنێكی هێنایە ئاراوە بۆ پاراستنی كۆیلەكان لەتوندوتیژی سەردارەكانیان و هەروەها بۆ ئاسانكردنەوەی كۆیلایەتیو ئازاد كردنیان.[329]

وەك چۆن یاسای رۆمانی تیۆرێكی بوژاندەوە كە پێیوایە فەرمانڕەوا دەسڵاتەكەی لەگەلەوە وەردەگرێت، ئالپین Alpein ئەم تیۆرەی لەم وتەدا كورتكردوەتەوە: ئیرادەی ئیمپراتۆر بریتییە لەهێزی یاسا بەو پێیەی گەل گشت دەسڵات و تواناكانی بۆ گواستوەتەوەو سەربەستی كردوە لەمامەڵكردن بەو دەسڵات و توانابیە.[330]

پێویستە ئەوەش رون بێت ئەم تیۆرە فەرمانڕەوایی پاشایەتی رەها داناڕێژێتەوەو داڕێژەری مافپێدانی دەسڵاتی رەهای نوێنەرایەتیكردن نییە كە دواتر بەسەروەری گەل تەفسیركرا، بانگەشەی ئەوەی كە ئەم تیۆرە مەبەست لێی چەسپاندنی سەروەری رەهای گەل بووە لەسەردەمی رۆماندا، بانگەشەیەكی بێ بنەمایە، وا بەبیردا هاتووە كە مەبەستی ئالپین لەم وتەدا ئەو بانگەشەیە بووە.

وتەكەی ئالپین تەنیا ئەو بیرۆكەی شیشرۆنی هەیە كە پێیوایە گەل خاوەنی یاسایە، ئەم وتەیەكە لەسەر سروشتی یاسای عورفیش جێبەجێدەبێت كە هێزی خۆی لەوەوە وەردەگرێت گوایە لەو نەریتانەوە سەرچاوەی گرتوە كە لەگەڵ گەلدا پەرەیان سەندوە، ئەم

---

329– بڕوانە: الدكتور. بطرس غالی و الدكتور. محمود خیری عیسی: سەرچاوەی پێشوو.. ل ۸۸ .

330– بڕوانە: سباین: سەرچاوەی پێشوو.. ل ۲٥۱ .

تیۆره بیروڕای یاساداڕێژەرانی رۆمامان سەبارەت بەسەرچاوەکانی یاسا بۆ روونده‌کاتەوه، ئەوان لەو بڕوادا بوون یاسا یان ئەوەتا لەدەستەیەکی گەلەوە یان لەدەستەیەکی نوێنەرایەتییە یان بەبڕیارێك لەئەنجومەنی پیران و یان بەیاسایەك لەخودی ئیمپراتۆرەوه سەرچاوە دەگرێت، لەگشت ئەم حاڵەتانەدا پێویستە یاسا لەلایەن دەستەیەکی لێپرسراو و پسپۆڕەوە دەربچێت و لەئاکامدا سەرچاوەکانی بگەڕێنەوە سەر گەل، هەریەك لەحکومەت ئیتر دەستەیەکی نوێنەرایەتی بێت یان ئەنجومەنی پیران یان خودی ئیمپراتۆر بەپلەیەکی دیاریکراو بەرێگەیەك کە دەستور رونیکردوەتەوە نوێنەرایەتی گەل دەکەن و ئەمەش تەنیا پایەیە کە لەدەرچواندنی یاسادا پشتی پێدەبەسترێت.

# تیۆری

## پەیوەندییە نێودەوڵەتییەکانی رۆما[٣٣١]

تیۆری پیوەندییە نێودەوڵەتییەکانی رۆما زۆر سەرەتایی و دەمارگیرانە بوو لەوەی کە شارستانییەتی یۆنانی پێدەناسرێتەوە، رۆما بیرۆکەیەکی کۆنی زیندوکردەوە کە جەنگ بەپێوەندی سروشتی نێوان دەوڵەتان دەزانێت، لەگەڵ ئەمەشدا لەرێکەوتنەکانی ئاشتیدا،[٣٣٢] تەنیا بەوە ئیکتیفای نەدەکرد کۆتایی بەجەنگەکە بهێنێت، بەڵکو هەندێك هاوپەیمانی هەمیشەیی لەگەڵ دوژمنە کۆنەکانیدا دروستدەکرد.

مامەڵەکردنی رۆما لەگەڵ وڵاتانی دراوسێ لەسەرەتادا لەسەر بنەمای یەکسانی بەرێوەدەچوو، بەڵام زیادکردنی هەندێك برگە بۆ پەیمانەکانی دواتر هەندێك دیاردەی پاشکۆیەتی هێنایەکایەوە، بەجۆرێك دان بەپێشکەوتویدا نراو ئەمەش هانمان دەدات کە بڵێین

331– دەربارەی ئەم ماوەیە بڕوانە:

- Getell, op., cit.. p 79-77.

332– ئەو رێکەوتننامانەی رۆما ئیمزای دەکردن، دوو جۆر بوون: بەپێی جۆری یەکەمیاندا هەردولا بەلێهاتوو دادەنرێن و لەشەرەکانیاندا پێویستیان بەیەکتر دەبێت و بەگوێرەی جۆری دووەمیان" رۆما بەهاوپەیمانی پایەباڵا دادەنرێت و لەسەر لایەنی دووەمە لەشەرەکانی هێرش بردن و بەرگری کردندا هاوکاری رۆما بکات و رێز لەهەژمونەکەی بگرێت، بێگومان جۆری دووەمی هاوپەیمانێتییەکان مانای لەدەستدانی سەروەرییە سەبارەت بەلایەنی دووەمی هاوپەیمانەکان و دابەزاندیانە بۆ ئاستی پاشکۆکانی رۆما.. بڕوانە: الدكتور. ابراهيم نصدی: سەرچاوەی پێشوو.. ل ١٠٣ .

سیاسیەتی دەرەوەی رۆما وابەستەی ئەو پێودانگە زیرەکانە بووە بۆ بەرژەوەندی تایبەت بەکارهاتوون،[333] رۆما هەمیشە (لەکاتی رێزگرتنی دادوەریی‌و رەوایەتی جموجوڵە نێودەوڵەتییەکانیدا) بنەماو پێوەری تایبەت بەخۆی جێبەجێکردوە، راگەیاندنی جەنگی دادوەرانە بۆنمونە بەدەر لەمەراسیمە ئایینی‌و سێستمە یاساییەکانی رۆما نەدەکرا.

فراوانبونی رۆماو گۆرانی بۆ ئیمپراتۆرییەت لەزۆر باردا لەرێگەی دیبلۆماسیەت یان هونەریی بەرێوەبردنی دەوڵەت و جەنگدا پێکەوە بووە،[334].. سیاسیەتی رۆما لەسەر بنەمای نانەوەی ئاژاوە لەنێوان دەوڵەتە ناکۆکانداو ئنجا هاوکاریکردنی لاوازترینیان بۆ

---

[333] بەو مانایە رۆڵی بیروباوەڕ یان ئایینزا لەبڕیاردانی پەیوەندییەکانی رۆما لەگەڵ وڵاتانی تردا بێ بایەخ بووە، کاتێک کاتی زەرور دێتە پێشەوە بوارێک بۆ دامەزراندنی مەزهەبی سیاسی نامێنێتەوەو بەتایبەت لەکاتێکدا پیاوانی دەوڵەت لەبنەڕەتدا جەنراڵی سوپای جەنگاوەر بن لەگشت بەرەکانەوە، سەرباری ئەمەش زەرورەتێکی نێجگار پێویست لەئارادایە لەلایەن رۆمانەکانەوە بۆ ریسواکردنی گشت ئەو شتانەی دەکەونە دەرەوەی چوارچێوەی سنورەکانییەوە، هەر بۆیە ئاسایی دەبێت ئەگەر بیر لەداڕشتنی بیروڕاکانیان بکەنەوە سەبارەت بەو گەلانەی کەوا دادەنرا لەخواری ئەوەوە بن" بەشێوەی پرەنسیپ یان مەزهەب و تەنیا بەوە ئیکتیفا دەکەن بەوشیاری تەواوە بۆ بەڕیوەبردنی.. بڕوانە: جان توشار: سەرچاوەی پێشوو.. لا ٥٤ .

[334] ئەمە ئەوە دوپاتدەکاتەوە کە ئەو دوو پرەنسیپەی سیاسەتی رۆمانی پەیڕەوی لێدەکرد، بریتین لە: لەخۆگرتن (الضم)و هاوپەیمانێتی، ئەو کۆمەڵگانەی پرەنسیپی یەکەمیان بەسەردا جێبەجێدەکرا هەمان مافەکانی هاوڵاتیبونی رۆمایان بەکاملی یان بەناتەوایی پێدەبڕا بەگوێرەی ئەو بارودۆخەی خستنەسەرەکەی تیا رویداوە، بەڵام ئەو کۆمەڵگانەی پرەنسیپی دووەمیان بەسەردا جێبەجێدەبێت لەڕوی تیۆرەوە بەدەوڵەتی سەربەخۆ دادەنران و گەلەکانیشیان لەلایەنی سیاسیەوە بەهاوپەیمان تەماشا دەکران و لەڕوی یاساییشەوە بەبێگانە لەقەڵەم دەدران.. بڕوانە: هەمان سەرچاوەی پێشوو.. لا ١٣٧ .

شکستپێهێنانی بەهێزەکەیان بەڕێوەدەچوو، دواجار هەردوو دەوڵەتی دەخستە ژێر ڕکێفی خۆیەوە، ڕۆما زۆر بەوردی سەرچاوە تایبەتەکانی دابینیدەکردو ئەگەر بوار هەبوایە سەرچاوەی هاوپەیمانەکانی بەکاردەهێناو بەهێنانەوەی بیانوو خۆی لەگشت پەیماننامەکان دەدزییەوەو لەژێر چەتری ویژداندا پیادەی ستەمی دەکرد، تەنانەت پاش ئەوەی ئیمپراتۆریەتەکەی دامەزراند لەسەریبو بەهەردوو هۆکە جەنگ و ئاشتی مامەڵە لەگەڵ دراوسێکانیدا بکات، پێشوازی دەکرد لەباڵیۆزو نێردراوی هێندستان و سکسیا Scythiaو پاشایانی میدییەکان و لایبرییەکان و بەدرێژای سنوری باکور شەڕی لەگەڵ ئەڵمانەکان ڕاگەیاندو لەگەڵ ئەمانەشدا ڕۆما وەك هاوتا یان یەکسان مامەڵەی لەگەڵ ئەم گەلانەدا نەکردوە.. تیۆری ڕۆما پێیوابوو ئیمپراتۆرییەت تەنیا دەوڵەتی ڕەوایەو هەرچی وڵاتانی ترە هیچ بونێکیان نییەو یاسای گەلان Jus gentium بەتەنیا بەسەر ئەو گەلانەدا جێبەجێدەبوو کە هاوپەیمانی ڕۆمان، جگە لەم گەلانە هیچ پەیوەندییەکی یاسایی لەگەڵدا هیچ گەلێکدا ناکرێت پلەی دانپێدانەکەی بەهەر ئەندازەیەك بێت.

ئەم مانای ئەوەیە ڕۆمانەکان بلیمەتییەکی سیاسی لەرادەبەریان نواندوە لەدامەزراندنی ئیمپراتۆریەتەکەیانداو ئەم بلیمەتییە لەدوو لایەندا خۆی دەبینێتەوە: لایەنی یەکەم بەیەك ئاست مامەڵەیان لەگەڵ هاوپەیمانەکانیان نەکردوە، بەڵکو بەگوێرەی پشکی ئەو هاوپەیمانە لەشارستانییەتداو، لایەنی دووەم بەئەندازەی سوربونیان لەبەردەوامیدان بەجەنگەکانیان، پاش شکست پێهێنیان لێبوردەو بەخشندەبون لەگەڵ دوژمنەکانیاندا، لەهەر جێگەیەك هاوپەیمانەکانی ڕۆما ئاستێکی بەرز لەشارستانییەتیان هەبوایە،

بەبیانوی ئەوەی یەکەی سیاسی سەربەخۆن (سەربەخۆبونێکی زاتی) شارەکانیان وەك خۆیان دەهێشتەوە، بەڵام ئەو ناوچانەی لەئاستێکی نزمی شارستانیەتدا بوون رۆمانەکان دانیان بەبونی کۆمەڵگەی هۆزایەتی‌دا دەناو بواریکیان لەهاوپەیمانێتیەکەیاندا بۆ دەرەخساند، بەبێ ئەوەی بەهیچ شێوەیەك دەست لەکاروباری ناوخۆی هاوپەیمانەکانیان وەربدەن، ئیتر ئەو دەستێوەردانە هەر شێوەیەك بێت.[335]

دروستبونی ئیمپراتۆرییەتی رۆما دواتر زەمینەی بۆ پەرەسەندنی یاسای نێوەدەوڵەتی خۆشکرد (ئەگەرچی رۆمانەکان بەهۆی کۆکردنەوەی جیهانی شارستانی لەیەك سیستمی سیاسیدا بایەخێکی کەمیان بەپەیوەندیی نێودەوڵەتی دەدا) داهێنانی هاوڵاتیبونی هاوبەش و پارێزگاریکردن لەئاشتیی رۆمانیو جێبەجێکردنی بێخەوشی ئەبستراکتی دادوەریی بەسەر زۆرێك لەگەلاندا بووە هۆی کۆتایهێنان بەگۆشەگیری کۆنی دەوڵەتان و سنورێکی بۆ ئەو بیرۆکەیەش دانا کە بەسروشت بیانییەکان دوژمنی رۆماو پلەیەك لەخوار گەلەکەیەوەن، تاکەکەسەکان ئاشنابون بەبیرۆکەی باڵایەتی هاوبەش و یاسای جیهانی (ئەم چەمکانە لەسەدەی ناوەڕاستدا ناوبانگیان دەرکرد) ئەم چەمکانە پێویست بوون بۆ هاتنەئارای یاسایەك لەنێوان میللەتاندا، بەهەمان گرنگی ئەم ئاراستەیە یاسای گەلان گرنگی هەبووە بەوەی بەرجەستەبونی رێساو نەریتە گشتییەکانی گەلە جیاوازەکانە، زاناکانی دواتری رۆما لەو بڕوایەدا بوون بنەما گشتییەکانی ئەم یاسایە هاوتایە لەگەڵ

---

335- هەمان سەرچاوەی پێشوو.. لا ١٤٣-١٤٤ .

یاسـای سروشـتداو بۆیـە وەك كۆمەڵـە بنەمایـەكی جیهـانی لەلایـەن هـەموو میللەتانـەوە قبـوڵكراوە، ئـەم بیرۆكانـە لەكۆتاییـەكانی سـەدەی ناوەڕاستدا لەلایەن داڕێژەرانی یاسای نێودەوڵەتییـەوە پـەرەی پێدراو لەچـالاكییە نێودەوڵەتییەكانـدا جێبـەجێكرا، بـەرە بـەرە زەمینـەی خۆشكرد لەبـەردەم چـەمكی خێزانـی نێودەوڵـەتی نـوێو بـەڕێوەبردنی پەیوەندییـەكانی دەوڵـەتانی ئـەم خێزانـە بەپێی كۆمەڵە پرەنسیپێكی یاسایی‌ی دیاریكراو.

# بەشداریی رۆما لەبیری سیاسیدا

مەودای بەشداری یاسایی شارستانیەتی رۆمانیمان بۆ رونبووە، بەئەندازەیەك دەتوانین بڵێین ئەم شارستانییەتە تا ئەو پەڕەکەی توێژینەوەی یاسایی بەخۆیەوە بینیوەو ئەوەی زانستی رۆمانی پێشکەشی کردوین، تاکو ئەمڕۆش هیچ شارستانییەتێکی تر پێشکەشی نەکردوین، بێگومان مەودای بەشداری رۆما لەچوارچێوەی بیری سیاسیدا پێویستە بەهەڵوەستە لەسەرکردنێکی هاوشێوەیە، ئەگەرچی لەبەندەکانی تردا شتێکمان لەبارەوە خستوەتەڕو.

ئەگەر لایەنی یاسایی بەلاوە بنرێت، بێگومان ئەو سەرمایە بیرییەی شارستانییەتی رۆمانی پێشکەشی کردوە بێسنورەو کاتی ئەوە هاتوە چاو بەو بیرە کلاسیکیانەدا بخشێنرێتەوە کە ماوەیەك پێش ئێستا رۆڵ و کاریگەریو بەشداری بنەڕەتیانەی کولتوری رۆمانی لەبونیاتنانی بیری سیاسی نوێدا رەتکردوەتەوە.

لەوانەیە راست بێت شارستانییەتی رۆمانی کۆمەڵە ناوێکی مەزنی وەك ئەفلاتۆن و ئەرستۆی پێشکەش نەکردوە، لەبەرئەوەی رێبازو ئاراستەی فەلسەفی بەخۆیەوە نەبینیوە، بەڵام ئەم شارستانییەتە کۆمەڵە چەمکێکی بەرهەمهێناوە کە بووەتە هۆی دروستبونی چەندین لێکەوتەی سێستماتیکی کە کارلێکی کردوە لەگەڵ روداوەکان و پەیوەست بووە بەپەرەسەندن و گۆڕانکارییە سیاسیەکانەوەو بەمەش بەرەو سەردەمی رۆشنگەریمان دەبات و

لێوەی سەرجەم هەوڵە بیرییەکانی بونیاتی دارشتنەوەی توێژینەوەی سیاسی سەرچاوەی گرتوە، کۆمەڵێك نمونە بۆ دوپاتکردنەوەی ئەم تێبینییە دەهێنینەوە.[٣٣٦]

### یەك: سێستمی کۆیلایەتی

ئەم سێستمە لەلایەن گشت بیریارە سیاسیەکانەوە وەك سێستمێکی بەرجەستە مایەوە تاکو سەردەمی شیشرۆن، تەنیا لەسەر زاری ئەم وتاربێژە رۆمانییە (شیشرۆن) تێبینی دەکەین بۆ یەکەمجار سەرمایەیەکی راستەقینەی بیری هاتەکایەوە سەبارەت بەپرەنسیپی نایەکسانی سروشتی کە بیری رۆمانی لەرێگەی ئەفلاتۆن و ئەرستۆوە وەریگرتبو، دەستپێك لەم سەرمایەوە دوو ئاراستە دەبینین:

**ئاراستەی یەکەم:** لەبازنەی بیرۆکەی مرۆڤایەتیدا دەخولێتەوەو بریتییە لەبیرۆکەیەکی کۆنی نەریتەکانی شارستانیەتی رۆمانی‌یە سەربەخۆ لەنەریتە یۆنانییەکان پەیدابوە، زیاتر خۆی لەبازنەی سیپیۆ ئەفریکی Scipio Afyicanu دا لەسەرەتای سەدەی دووەمی پێش زاییندا گەشەی کردوە. ئەوەندە هەیە راستەوخۆ تێکەڵ بەبیری فەلسەفی نەبووە،. بەڵکو لەسەر دەستی سێنێکا چووەتە ئەو بوارەوە، راستە شیشرۆن ئاماژەی پێکردوەو توێژینەوەی لەسەر ئەنجامداوە، بەڵام سێنێکا کردویەتییە بنچینە بۆ راڤەکردنی سێستمی کۆمەڵایەتی" هاوڵاتی ئەندامە لەو سێستمدا:

336- بەتێروتەسەلی بڕوانە: الدکتور. حامد ربیع: ابحاث فی النظریة السیاسیة: سەرچاوەی پێشوو.. ل ١٤٦-١٤٧ .

سیستمی سیاسی کە بەدەوڵەت ناودەبرێت، ئنجا کۆمەڵگەی جیهانی کە بەمرۆڤایەتی ناوی دەبات و ئەم بیرۆکانە دواتر لەلایەن بیری مەسیحی وەریگرتون بۆ ئەوەی بیانکاتە بنچینەی تیۆرە سیاسییەکانی، بەلانی کەمەوە لەمیانەی ماوەی یەکەمی پەرەسەندە مێژووییەکەیدا.

ئاراستەی دووەم: تایبەتە بەئازادیی کە دەدرێتە پاڵ نەریتە فقییەکان و لەنوسینەکانی هەندێك لەفەقیهەکاندا رەنگدانەوەی دەبێت، ئەوانەی دەیناسێنن بەوەی (ئازادیی) مۆڵەتێکی سروشتییە بوونی خۆی لەیاسایەکی باڵاو مەزنتر لەیاسا دانراوەکانەوە وەردەگرێت،[٣٣٧] .. نەریتەکانی رۆمانەکان لەم روانگەوە بەسەرچاوەی راستەوخۆ دادەنرێن کە شۆرشی فەرەنسی پرەنسیپە سەرەکییەکانی(ئازادییو برایەتیو یەکسانی) لێوە وەرگرتوە.

## دوو: بیرۆکەی گرێبەندی کۆمەڵایەتیو بیرۆکەی نوێنەرایەتیکردنی سیاسی

هەر راڤەکردنێکی هەریەك لەم دوو بیرۆکەیە لەنەریتەکانی شارستانییەتی رۆمانییەوە نەبێت سەرچاوە ناگرێت، تیۆری گرێبەندنی سیاسی کە بڕیارە لەسەردەستی هۆبز و لۆك و رۆسۆ ببێتە بنچینەیەك بۆ تیۆری دیموکراسییەتی نوێ، سەرچاوەی راستەوخۆو ریشاڵە راستەقینەکانی پێویستە لەنوسراوەکانی شیشرۆندا بۆی بگەرێین،[٣٣٨] .. کاتێك پەیوەندی نێوان گەل و

---

337- بەمەبەستی بەراوردکردنی ئەم لایەنە بڕوانە: دلیل بیرنز ، الفصل الثالث: سەرچاوەی پێشوو..

338- Gettele, op., cit.. p 68.

چینەکانی فەرمانڕەوا دەناسێنێت بەوەی ڕێکەوتنی نێوان گەل و چینە بەهێزەکانە.

ئەم چەمکە چەمکێکی گەلێك گرنگتری پێوە وابەستەیە کە بیرۆکەی نوێنەرایەتیکردنی سیاسییە، یۆنانەکان بیرۆکەی نوێنەرایەتیکردنیان لەناو دەسەڵاتدا ڕەتکردوەتەوەو پرەنسیپی لەبری یەکتریان لەکاری سیاسیدا وێنانەکردوە، تەنیا فەقیهەکانی ڕۆما ئەم تیۆرەیان داڕشتوەو هەر ئەوان کردویانەتە بنچینە بۆ بونیادی سێستمی سیاسی کە هەڵبژاردن یەکێك دەبێت لەڕێگەکانی گەیشتن بەدەسەڵات.

## سێ: بەشداریی ناراستەوخۆ لەپێشکەشکردنی چوارچێوەیەکی بیری بۆ فەلسەفەی سیاسی نوێ

**زیاتر لەبیرۆکەیەك گوزارشت لەم بەشدارییە دەکەن:**

**یەك:** بیرۆکەی پاڵەوان پیاوی سەرکردە کە لەئاستی مرۆڤ بەرزدەبێتەوە بۆ ئەوەی ببێتە سیمبول و گوزارشت بکات لەگروپێکی سیاسی کە هیواکانی گەل و هێزەکانی مێژویی تێیدا چڕدەبێتەوەو، بیرۆکەیەکی خۆشەویستە لەسەر نەریتەکانی سەدەی یەکەمی پاش زایین: یۆلیۆس قەیسەرو ئۆگستس، ئەمانە هیچ نین جگە لەوێنەیەکی راستەقینەی ئەو هەقیقەتە بیرییە، هەردوکیان درێژەپێدەری (ئەسکەندەریی مەکدۆنی)ین لەگەڵ جیاوازیدا: یەکەمیان لەناوچو لەبەرئەوەی پشتی بەهەقیقەتی شارستانی نەبەست، بەڵام پاڵەوانەکانی ڕۆما سەرکەوتن، چونکە ئەوەی بەرزیکردنەوە وشیاری کۆمەڵ و بیرۆکەی سەرداریێتی ڕۆماو ئەم چەمکە دواتر چوارچێوەی بیری سیاسی پێکدەهێنێت بۆ فەلسەفەی

رۆمانتیکی ئەڵمانیا و بەشێوەیەکی تایبەت بیرەکانی هێگڵ و نیچە، بەمشێوە هیتلەر لەلایەك و مۆسۆلینی لەلایەکی ترەوە دەتوانن لوە بگونجێن، چونکە هەریەك بەشێوازەکەیەوە نەریتەکانی سەدەی یەکەمی پاش زایین دوبارە دەکاتەوەو بەهەمانشێوە ئەم چوارچێوە بیرییە دزە دەکاتە ناو بیرەکانی ماکش ڤێبەری ئەڵمانیو مۆسکای ئیتالی لەبونیادی تیۆری چینە دەستەبژێرەکاندا، راستی ئەو لێکولێنەوە بەرونی لەوتارەکانی شیشرۆندا دەردەکەوێت، بەچەشنێك پرەنسیپی بەرزبونەوەی مەعنەویی چینە باڵاکانی کردوەتە پایەیەك لەهێرشکردنە سەر سێستمە دیکتاتۆرییەکاندا پشتی پێدەبەستێت.

**دوو:** بیرۆکەی سەروەرییو پرەنسیپی دەسڵات و ئەفسانەی ئاشتی رۆمانی Pax.Romana کە بنچینەی دارشتنی تیۆری پەیوەندییە نێودەوڵەتییەکان بوە لەماوەی سەرداریێتی بەریتانیا لەسەدەی رابردوداو ئەمرۆ جارێکیتر بەسەرەتایەکی ترسناکەوە لەدوای ١٩٦٧ وە بەناوی ئاشتی ئەمریکی Pax Ameycana دەردەکەوێتەوە.

سێ: لێکۆڵینەوەی بنەماکانی چالاکیی سیاسی، پرەنسیپی حزبایەتیو بیرۆکەی ئایدۆلۆژیای سیاسیو رێکخستنی یاسایی زانیارییو ئەوشتانەش کە پێوەی گرێدراون لەبیرۆکەی پرۆگرامی چاکسازییو گۆرانی سیاسی، گشت ئەم چەمکانە ناتوانین باسیان لێوە بکەین بەبێ شیکردنەوەی دەلالەتەکانیان لەرۆشنایی واقیع و ئەزمونی رمانییەوە، تەنانەت مێژویی نویو بزوتنەوە شۆرشگێرییەکانی جیهانی سێیەم (سەدەی هەژدەهەم) لەسەر جێبەجێکردنی واقعیعی رۆمانی بەرێوەچون بەڵام بەشێوازێکی نوێ.

## دەروازە

مەبەست لەسەدەی ناوەڕاست ئەو ماوەیە کە لەچارەکەی کۆتایی سەدەی پێنجەمی زایینییەوە دەست پێدەکات و تاکۆتایی سەدەی پانزەیەم درێژەی دەکێشێت[٣٣٩].. ئەم ماوەیە جیاوازە لەسەردەمەکانی پێش خۆیی‌و هەروەها ئەو سەردەمانەش کە دوای ئەو هاتوون، ئیتر جیاوازییەکە لەڕوی گوزارشتی فەلسەفییەوە بێت یان لەڕوی دەرکەوتنی دامەزراوەیەکی نوێ (کڵێسا)وە بێت کە ڕۆڵی نزیکبونەوەی گێڕا پەیوەندی نێوان بیروباوەڕە فەلسەفییەکان و لەنێوان بارودۆخە کۆمەڵایەتی‌و سیاسیەکاندا بەشێوەیەکی توندوتۆڵتر لەماوەی پێش سەدەکانی ناوەڕاست یان سەدەکانی دواتر.

ئەم ماوەی (ناوەڕاست)ە وەك ئەڵقەیەکی گەیاندنی بێگیانی نێوان شارستانییەتی کلاسیکی‌و شارستانیەتی نوێ تەماشادەکرێت، لەماوەی نێوان کەوتنی ئیمپراتۆرییەتی ڕۆمای خۆرئاوا ساڵی (٤٧٦) زایینی و تا دۆزینەوەی ئەمریکا لەکۆتاییەکانی سەدەی پانزەیەمدا روبەڕوی پردێك دەبینەوە کە دەبێت تێی پەڕێنین تەنیا بەمەبەستی پارێزکاریکردن لەبەردەوامبونی مێژویی، ئەم ماوەیە کە دەناسرێتەوە بەوەی گەورە فەیلەسوفان خۆیان تەرخانکردوە بۆ دامەزراندنی بینای کاتۆلیکی یان چاککردنی ئەو نەنگییانەی بەسەریدا هاتون (کە لەمیانەیەوە

---

339– بڕوانە: برتراند راسل: تاریخ الفلسفة الغربية، الكتاب الثانى، الفلسفة الكاثوليكية، ترجمة: الدكتور. زكى نجيب محمود، مطبعة لجنة التأليف و الترجمة و النشر، القاهرة-١٩٦٨ ل ١ . بەراوردی بکە لەگەڵ پێناسەکەی: الدكتور. عبد الحميد متولى: سەرچاوەی پێشوو.. ل ٨٨ .

ململانێی نێوان دەسڵاتی ئایینیو دەسڵاتی مەدەنییدا تەشەنەدەکات کە لەروی بیری سیاسییەوە جگە لەقەیرانی رێکخستنی پەیوەندی هەردوو دەسڵاتەکە روبەڕوی هیچ کێشەیەك نابێتەوە: بریتییە لەماوەی ململانێی نێوان دەسڵاتەکان لەروی واقعیی سیاسییەوەو هەروەها سەردەمی سەلماندنی سەروەرییە لەمیانەی گۆڕانکاریی سیاسییەوە تا ئەو ئەندازەی راڤەی (سیاسی) بگاتە ئەوەی بوترێت" کاتۆلیکە یەکەمەکانی بەمانای تەسکی وشکە شتێکیان نەبوە ناوی (تیۆری سیاسی) لێبنرێت.[٣٤٠]

ئەم دە سەدە گەشەسەندنێکی ئاشکرای بەخۆیەوە بینی، ئیتر ئەو پەرەسەندنە تایبەت بێت بەدیاریکردنی پێگەی کڵێسا بەرامبەر بەدەوڵەت یان دیاریکردنی پێگەی دەوڵەت پێش کڵێسا.

ئەو ماوەی تاکو سەدەی دەیەمی زایینی درێژە دەکێشێت بریتییە لەسەردەمی ململانێی شارستانی، بەچەشنێك داگیرکاری کە لەلایەن بەربەرەکان (جەرمان )ەکانەوە لەباکورەوە بەسەر ئەورپای رۆمانیدا هات و لەباشورەوە لەلایەن شارستانییەتی ئیسلامییەوەو لەمیانەی ئەمەو لەنێوان ئەو فشارەی کە رەنگدانەوەی ژیانی سەرەتاییەو ئەو توندوتیژییەی کە هەڵگری باوەڕە لەلایەکی ترەوە، دەبوو شارستانییەتی کڵێسا لەچاوەڕوانی سەردەمی دواتردا هەڵوێستی ملکەچی وەربگرێت.

---

340- بڕوانە: الدکتور. حامد ربیع: ابحاث فی النظریة السیاسیة: سەرضاوەی ثێشوو.. ل ١٥٧-١٥٨ . ئنجا بەراوردی بکە لەطەلَ: الدکتور. علی عبدالمعطی محمد: الفکر السیاسی الغربی، دار الجامعات المصریة، القاهرة-١٩٧٥ .. ل ١٣٢ .

ئەم سەردەمی (یەکەم)ە، سەردەمی دوپاتکردنەوەی دەسڵاتی کڵێسایە لەچوارچێوەی ئیمپراتۆرییەتدا لەمیانەی دەستپێوەگرتنی ئاشکرای دامەزراوە (کڵێسا) بەپرەنسیپێك کە بانگەشەی کەمکردنەوەی دەسڵاتی زەمەنی ناکات، بەو ئەندازەی کە دڵسۆزیی و گوێڕایەڵی بۆ دوپاتدەکاتەوە: پەسەندکردنی دەسڵات تەنانەت ئەگەرهاتو ستەمکاریش بێت و ڕەتنەکردنەوەی تەنانەت ئەگەر لەلایەن بێ باوەڕیشەوە بێت، ئەو پرەنسیپە کە دەسڵاتی کڵێسا لەپیادەکردنی کردارییانەی خۆیدا جەختی لەسەرکردوەتەوە[341].. سەرباری ئەمەش ئاراستەیەکی تەدریژی بەرەو بەدەستهێنانی دەسەکەوت لەلایەن دەسڵاتی زەمەنییەوە هەیە کە بەرە بەرە لەکۆتاییدا کردییە دەسڵاتێك بەرامبەر بەدەسڵاتی کڵێسا، ئەگەر هەندێکجار بەسەریشدا زاڵ نەبوبێت.

ئەم کایە ڕێگر نابێت لەوەی کە باس لەسێستمی دەرەبەگایەتی بکەین وەك دیاردەیەك کە ئیمتیازەکانی کڵێسای لەسەر بەندە، ئەم سێستمە بەرە بەرە یارمەتیدەر بو لەقورسکردنی تای تەرازووەکە لەلایەنی گیانییەوە بەسەر لایەنی زەمەنیدا، بەڵام ئەو ماوەی کە دوای سەدەی دەیەم دێت و تا سەدەی سیانزەیەم درێژە دەکێشێت ماوەی پەرەسەندنی هێزو دەسڵاتی کڵێسایە: خۆمان لەبەردەم بونیاتێکی نوێی سێستمی سیاسیدا دەبینینەوەو دەسڵاتی زەمەنی لەناوخۆدا چۆك لەبەردەم دەسڵاتی ئایینی کڵێسادا دادەدات کە تەنانەت لەدەرەوەشدا لەهەڵوێستی بەرگریدا نەمابووە، ئەم دەسڵاتە بووە هەقیقەتێکی ئیستفزازی و لەو حەشارگە دەرچو کە بۆ ماوەی

---

341- بڕوانە: الدکتور. حامد ربیع: سەرچاوەی پێشوو.. ل ۱٥۹ .

چوار سەدە ناچارکرابو لەنێوان دیوارەکانیدا خۆی حەشاربدات و ببێتە داگیرکارێکی رزگارکەر نەك تەنیا بۆ دەربازکردنی زەوییەکانی لەسەقڵییەو ئیسپانیا لەچنگی داگیرکارە عەرەبەکان، بەڵکو تەنانەت بۆ چەسپاندنی رێسای سیاسیەکانی سێستمی کاتۆلیکی لەسنوری ئیسلامداو لەدەوربەری کەنارەکانی دەریای سپی ناوەڕاست.[٣٤٢]

لەم ماوەدا، بەدەربڕینێکی تر، تێبینی دیاردەکانی هەڵکشانی ململانێی نێوان کڵێساو پیاوانی دەوڵەت دەکەین، بەچەشنێك تیۆرکەی گلاسیۆسی یەکەم[٣٤٣] (تیۆری دوو شمشێر) کە جۆرێك لەیەکسانی لەنێوان هەردو دەسڵاتەکەدا: ئایینیو زەمەنی بووە مەسەلەیەکی کۆتایهاتو، کڵێسا بەئاشکرا بانگەشەی ئەوەی دەکرد کە دەسڵاتی باڵای ئایینیو دنیاییەو لەو بڕوادا بو کە دەبێت

---

342ـ هەمان سەرچاوەی پێشوو.. ل ١٥٨ .

343ـ بەبنەچە ئەفەریقاییەو هاوچەرخی (ئادوکر)ە، ئەو دژواریانە ژیاوە کە بەهۆی شەڕەکانی نێوان خۆیو پاشا (سیۆدریک) ڕوبەڕوی دەبوونەوە، تێڕاونییەکانی خۆی سەبارەت بەهەردوو دەسڵاتە لەنامەیەکدا دەربڕیوە کە ئاراستەی ئیمپراتۆر (ئەناستاسیوسی یەکەم) ئیمپراتۆری خۆرهەڵاتی کردوەو تیایدا هاتوە: ئەی ئیمپراتۆری مەزن" دوو هێز هەن کە فەرمانڕەوایی جیهان لەنێوان خۆیاندا بەشدەکەن، ئەوانیش دەسڵاتی پیرۆزی پاپاو دەسڵاتی پاشایەتی، ئەوەندە هەیە لێپرسراوێتی دەسڵاتی یەکەم لەلێپرسراوێتی دەسڵاتی دووەم گەورەترە، چونکە لەسەر پاپاکانە رۆژی حساب لێپرسینەوە لەگەڵ پاشاکاندا بکەن.. هەروەها ئیمپراتۆر کوڕی کڵێسایەو ئەرکی سەرشانی فێربونە نەك فێرکردن لەکاروبارەکانی ئایینیدا.

لەڕاستیدا تیۆرەی دوو شمشێر کە جلاسیۆسی یەکەم داڕێژاوە، سەرباری هەوڵەکانی کڵێسا لەکۆتاییەکانی سەدەی یانزەیەمدا بۆ بەدیهاتنی ئەو ئامانجە، هێشتا چانسی جێبەجێکردنی بۆ نەڕەخساوەو لەناکامی ئەم هەوڵەوە چەندین ئەنجامی خراپ ڕوبەڕوی هەردوو دەسڵاتەکە (ئایینیو دنیایی وەکیەك) بوونەوە.. بڕوانە: د. عبدالقادر احمد یوسف: العصور الوسطى الاوربية، المكتبة العصرية، بيروت-١٩٦٧ .. ل ٦٧ .

پارێزگـاری لـەم دەسـڵاتە باڵایـەی بکـات لەمەسـەلەکانی تایبـەت بەپەیوەست بەپوەندییە کۆمەڵاتیو سیاسیەکان، ئەگەر دەویستریێت ئەورپا مەسیحی بێت پێویستە بخرێتە ژێررکێفی دەسڵاتی پیاوانی مەسـیحییەوەو ئەگـەر بویسـترێت کڵێسـا سـەربەخۆ بێـت و ئـەو سەربەخۆیەش بپارێزێت پێویستە لەژێررکێفی سەرکردایەتی پاپادا چەقبگرێت، چونکە ئەمە لەتوانایدا دەبێت دەسڵاتەکەی فراواندەکات بەشـێوەیەك کاروبـارە دنیاییـەکانیش بگرێتـەوە[٣٤٤].. لەبەرامبەریشـدا بەرهەڵسـتکارانی پاپا بانگەشـەی ئـەوەیان دەکـرد دەسـڵاتی دەوڵـەت لـەپیاوەکانی دەوڵەتـەوە سەرچاوەدەگرێت نـەك لـەپیاوانی کڵێسـاوەو دەوڵـەت تەنانـەت پـێش پەیـدانی خـودی ئاییـنی مەسـحیش پایـەکانی پتەو بونیادەکەی سەقامگیر بوە.[٣٤٥]

ئنجـا مـاوەی سـێیەم دێـت کـە لەگـەڵ سـەرەتاکانی سـەدەی چواردەهەمدا دەست پێدەکات لەپێناو ئامادەسازیی یان ئامادەکردن بۆ جیهانێکی هاوچەرخ، بەجۆرێك پەیوەندییە یەکەمەکانی داڕوخانی دەسڵاتی پاپا و دروستبونی سیستمی تۆتالیتری ناخۆیی دەبینین، لەمیانـەی ئـەم مـاوەدا تێبینـی ناتەباییـەکی توندوتیـژو هەڵچـونێکی گـەورە دەکـەین، چـونکە هاوکـات لەگـەڵ بانگەشـەی ئاشـکرای دروسـتکردنی کۆمەڵگایـەکی جیهـانی بـۆ تـەنیا حکومـەتێکی خواوەنـدیی، لەبەرامبـەردا بانگەشەیەکی دیکە هەیە لەسەر بنچینەی دامەزراندنی دەوڵەتی نەتەوەیی.

---

344– جوزيف شترايىر: الاصول الوسيطة للدولة الحديثة، ترجمة: محمد عيتانى، دار التنوير للطباعة و النشر، بيروت– ١٩٨٢ .. ل ٢٤ .

345– الدكتور. على عبدالمعطى محمد: سەرچاوەی پێشوو.. ل ١٢٥ و ل ١٣٥ .

ئەم بانگەشەیان سەرکەوتنی بەدەستهێناو چەندین دەوڵەتی نەتەوەیی دامەزران کە یاساو سیستەمەکانیان بۆخۆیان دارشتبو، هەروەها پلانەکانی ئایندەیان بۆ فێربون و رۆشنبیریو ئابوریی‌و گشت زانستە کۆمەڵایەتییەکانی دیکەش، سەرباری سەربەخۆبونی لەکاروبارە ئایینییەکانیدا، بێگومان هۆکارگەلێکی تێکهەڵو" سیاسی، ئابوریی، بیریو ئایینی رۆڵیان هەبوە لەسەرخستنی ئاراستەی بەرەو دروستبونی دەوڵەتی نەتەوەیی.[346]

ئەم زەمینەسازییە خێرایە، هاندەرمان دەبێت لەوەی کە لەم لێکۆڵینەوەدا نمونە بیری لەهەر سێ ماوەکەی پێشوتر کە پێکەوە سەردەمی ناوەڕاست پێکدەهێنن بهێنینەوەو لەسەر ئەمەش

---

346– هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل ۱۳۹ .

– سەبارەت بەزانیاری تێروتەسەلی ئەم کارەکتەرانە کە بوونەتە هۆی دامەزراندنی دەوڵەتی نەتەوەیی، نوسەر ئاماژە بەوە دەکات" کارەکتەری سیاسی کە دەرکەوتن و تەشەنەکردنی هەستی نەتەوایەتیدا دەبینێتەوە وەک کاردانەوەیەکی ئەو پەرتەوازەبون و نەهامەتییە ناوخۆییانەی بەهۆی شەڕەوە هاتبوونە ئاراوە لەلایەک و هەروەها وەک کاردانەوەیەکی فشارەکانی بیانیو هەوڵەکانی داگیرکردنی دەرەکی لەلایەکی دیکەوە.. کارەکتەری ئابوریی خۆی لەبانگەشەدا دەبینێتەوە کە بەهۆی گەشەسەندنی بازرگانی و لێکەوتەکانی لەئەنجامی دۆزینەوە جوگرافییەکاندا، پێویستە سیستمێکی ناوەندیی بۆ دابنرێت تا هۆیەکانی سەرکەوتنی بۆ فەراهەم بکات.. کارەکتەری فیکریش خۆی لەهەوڵی چاکسازیی بیرە کلاسیکیو ئیدیاڵ و ئەندێشەییەکاندا دەبینێتەوە.. هەرچی کارەکتەری ئایینیە بنەڕەتەکەی ملکەچ نەبونی کڵێسایە بۆ پاپا یان رۆما، بەجۆرێک هەر کڵێسایەک پشت بەو دەوڵەتە دەبەستێت کە لەچوارچێوەی هەرێمەکەیدایەو هەروەها پشت بەو فەرمانڕوایە دەبەستێت کە سەرباری سەرەک دەوڵەتی سەرەک کڵێسایشی بۆخۆی زیادکردبوو.

یەکـەمجار بـاس لـەپاپا یەکەمـەکانی کڵێسـا دەکـەین وەك نمونـەی گوەزارشـتکەر لـەماوەی یەکـەم و تیایـدا جـەخت لەسـەر قەشـە ئۆگوسـتین دەکـەین، ئنجـا بیرەکـانی هەریـەك لەسـان بـەرنارد و جـۆن سالسـبۆری‌و تۆمـاس ئـەکوینی‌و دانتـیّ وەك نمونـەی مـاوەی دووەم تـاوتویّ دەکەین و تـاکو لـەکۆتایی ئـەم بەرگـەدا دەگـەینـە مارسیلیۆس بادۆ ویلیەم ئەوکام و بزوتنـەوەی ئەنجومەنگـەرایی وەك نمونـە بـۆ ئـەو ئاراسـتانە کـە خـەریکبو لەکۆتاییـەکانی سـەردەمی ناوەڕاسـتدا بـاڵ بەسەر بیری سیاسیدا بکێشن.

بەشی حەوتەم

# سروشتی بیری مەسیحیو

# تایبەتمەندییەکانی پەیوەندی نێوان هەردوو

# دەسڵاتی ئایینیو زەمەنی

دەرکەوتنی کڵێسا وە وەك دامەزراوەیەکی سەربەخۆ لەدەوڵەت کە مافی فەرمانڕەوایی رەگەزیی مرۆیی هەبێت لەچوارچێوەی کاروبارە رۆحییەکاندا ترسناکترین روداوی شۆڕشێگێڕانەیە لەمێژوی ئەورپای خۆرئاوادا، ئیتر ئەو روداوە لەچوارچێوەی سیاسیەتدا بێت یان لەچوارچێوەی بیری سیاسیدا، ئەوەی شیاوی تێبینیکردنە ئەو بیرە سیاسیانەی مەسیحییە یەکەمەکان گوزارشتی لەتایبەتمەندییەکی دیاریکراو بەخۆیان نەکرد، بەو ئەندازەی رەنگدانەوەی ئاستی کاریگەرییە بوە کە بیرەکانی پێش خۆیان پیادەی کردوەو ئەگەرچی خۆشیان پێشکەشیان نەکردوە.

هاوشێوەی رەواقییەکان بڕوایان بەیاسای سروشتیو پرەنسیپی یەکسانی نێوان مرۆڤەکان هەبووەو هەروەها پێویستی پابەندبونی دەوڵەت بەدادپەروەرییەوە، پرەنسیپێکی نوێیان بۆ ئەم پرەنسیپانە زیادکرد، ئەو تەوەرەی گشت دیالۆگە بیرییەکانی لەبارەوە کراوە بەدرێژایی ئەو ماوەی تاکو سەدەی دەیەمی زایینی درێژەی کێشاوە، بریتییە لەپرەنسیپی گوێڕایەڵیو رێزگرتنی ئەو دەسڵاتە رەوایەی لەئارادایە، بەبڕوای ئەمان جێبەجێکردنی ئەو وتەی مەسیحە (ئەوەی هی قەیسەرە بیدەن بەقەیسەرو، ئەوەیش هی

خودایه بیدەن بەخودا) و هەروەها کارکردنە بەئامۆژگارییەکەی قەشە پۆڵس کە دەڵێت:

( باگشت دەرونەکان ملکەچی دەسڵاتداران بن، چونکە هیچ دەسڵاتێك نییە لەخواوە نەبێت.. دەسڵاتدار پلەیەکن لەریزبەندی خواداو ئەوەی دژایەتی دەسڵاتدار بکات بەرهەڵستی ریزبەندی خواوەندی کردوەو بەرهەڵستکاران ئیدانە دەکەنە بەشی خۆیان، لەبەرئەوەی فەرمانڕەواکان ئامرازی ترس نین بۆ کردوەی چاکە بەڵکو بۆ خراپەکارییەکانە، ئایا دەتەوێت لەدەسڵات نەترسی؟ چاکە بکەو دەبێتە مایەی ستایشکردنت، چونکە خزمەنکاری خودایە بۆ چاکسازیی، بەڵام ئەگەر خراپەت کرد بترسە چونکە لەخۆڕا شمشێری هەڵنەگرتوە، ئەو خزمەتکاری تۆڵەسێنەوەی خودایە بۆ تورەبون لەو کەسەی خراپەی کردوە، بۆیە دەبێت ملکەچی بێت نەك تەنیا لەترسی تورە بوون، بەڵکو بەهۆی ویژدانەوە، ئێوە لەبەرئەوەی سەرانە بدەن بەخاوەنی سەرانەو زەویانە بدەن بەخاوەن زەویی‌و بەخشندەیش بەوانەی کە بەخشندەییان هەیە).[٣٤٧]

ئەم وشانە بونە تیۆرکی مەسیحی پەسەندکراو، پابەندبون بەگوێرایەڵی مەدەنی بووە چاکەیەکی مەسیحی هیچ یەکێك لەسەرانی کڵێسا نکۆڵییان لێنەکردوە، بریتییە لە(گوێڕایەڵی)فەرمانێکە خواوەند فەرمانی پێکردوەو ئەم وتەیە سیمایەکی نوێ بەبیری مەسیحی دەبەخشێت جیاواز لەسیماکانی تیۆری دەستوری رۆمانی کە پێی وابو دەسڵاتی فەرمانڕەوا لەگەلەوە سەرچاوەدەگرێت.

کەواتە رێزگرتنی دەسڵات، فەرمانێکە مەسیحییەکان نکۆڵییان لێنەکردوە، ئەوەندە هەیە لێرەدا راستییەکی گرنگ دێتەئاراوە ئەویش مەسیحی ملکەچی جۆرێك لەپابەندی دانسقە بو کە

347– بڕوانە: سباین: سەرچاوەی پێشوو.. ل ٢٦٥ .

ڕێساکانی ئەخلاقدا لەسەردەمی بتپەرستی کۆندا بونی نەبوە، مەسیحی بەتەنیا داوای لێنەکراوە ئەوەی هی قەیسەرە بیدات، بەڵکو ئەوەشی هی خواوەندە پێویستە بیدات، ئەگەر ئەرکەکانی بەرامبەر بەفەرمانڕەواکەی لەگەڵ ئەرکەکانی بەرامبەر بەخودا پێچەوانە هاتنەوە پێویستە لەم بارەدا پابەندبونەکە بەئاراستەی دروستکار بێت نەک دروستکراو.[٣٤٨]

لەم پرەنسیپە تیۆرك هاتەوە ئاراوە لەسەر بنچینەی ئەوەی مەسیحی دوو فەرمانڕەوایی هەیە یەکێکیان ئاینیو ئەویتریان دنیایی: مەسیحی لەم دنیادا یەکێکە لەهاوڵاتیانی دەسڵاتی زەمەنی کە لەناودەچێت چەندە تەمەنیشی درێژ بێت و لەژیانی دوایشدا ئەندامە لەعەرشی دروستکاردا.

ئەم بارودۆخە پاڵنەر دەبێت لەوەی کە بوترێت سێستمی مەسیحی گریمانەی سروشتێکی دوانی بۆ مرۆڤ کردوەو هەروەها بونی چاودێرییەکی دوانیش کە چاودێری ژیانی مرۆڤایەتی دەکەن و گونجاوە لەگەڵ ئەم دوانییەدا لەسروشت و چارەنوسدا.

ئەگەرچی جیاوازیکردن لەنێوان لایەنە رۆحیو لایەنە دنیاییەکاندا یەکێکە لەپایەکانی بیری سیاسی مەسیحی، ئەوا ئەم پایە روبەڕوی کێشەی پەیوەندی نێوان دامەزراوە ئاینییەکان و رێکخستنە سیاسیەکان بوەتەوە، ئەمەش لەبەرئەوەی فەرمانڕەوای بتپەرست هەردوو دەسڵاتی زەمەنیو ئاینی لەدەستدا بوە، لەکاتێکدا ئەرکە ئاینییەکان لەتێڕوانینی کەسی مەسیحیدا گەیشتوەتە بەرزترین ئاستی پابەندبونی راستەوخۆ بەرەو خودا،

---

348– هەمان سەرچاوەی پێشوو.. ل ٢٦٧ .

مەسیحی (بەگوێرەی ئەم بارودۆخە ناتوانێت جیاوازی بکات) لەروی بنەماوە مەسەلەی تێکشکانی دەسڵاتی زەمەنی خۆی لەم پەیوەندییەی مرۆڤ لەگەڵ دروستکارەکەی، ئەو مەراسیمەش کە دەخوازێت ژێردەستەکان کۆمەڵە سروتێکی ئایینی بەرزراگرتن بۆ ئیمپراتۆر بەرزبکەنەوە کە لەگەڵ پرەنسیپەکانی ئایینی مەسیحیدا پێچەوانە دەهاتنەوەو ئنجا دەبوو مەسیحی ئەنجامدانی رەتبکاتەوەو لەئاکامی ئەمەدا مەسیحیەت مەسەلەیەکی وروژاند کە بەجیهانی کۆن نامۆ بو، مەسەلەی کڵێساو دەوڵەت و لەمیانەی ئەمەشدا قسەکردن لەسەر دڵسۆزیی‌و فرەییەکەی‌و جیاوازیی وێنەکانی، هەرگیز ئەمە بیری پێشینانددا نەهاتوە.[٣٤٩]

لەئەنجامی ئەمەدا کڵێسا لەروی فەلسەفەو رێکخستنەوە بەهێز بو، کڵێسا تەنانەت پێش ئەوەی چوارچێوەیەکی یاسایی سەقامگیریش بەدەست بهێنێت و کاتێکیش کڵێسا سەقامگیر بو پێداویستی پابەندبون بەدوپاتکردنەوەی سەربەخۆبونی لەمەسەلە رۆحییەکاندا رونبویەوە، پیاوەکانی هەرگیز وێنای توانای بەردەوامبونی بارودۆخێکیان نەدەکرد کە تیایدا کڵێسا بەدەوڵەت نەگاتەوە لەبەر پێداویستیان بەیەکتری، پێداویستی رۆح و جەستە بۆ تێکەڵبون لەژیانی مرۆڤایەتیدا: هاوکاریکردنی کڵێسا لەگەڵ دەوڵەت کارێکی فەرمانپێکراوە، چونکە هەردو دامەزراوەکە بەفەرمانی خودا بۆ فەرمانڕەوایی مرۆڤ هاتونەتە ئاراوە.

هۆکاری سەرەکی دانپێدانانی ئیمپراتۆر (کوستەنتین) بەپێگەیەکی یاسایی تایبەت، بیرکردنەوەیەتی لەتوانای

---

349- هەمان سەرچاوەی پێشوو.. ل ٢٧١ .

هاوکـاریکردنی بـۆ دەوڵـەت و ئـەو کاریگەرییـە سیاسـیانەش کـە لەدەرئـەنجامی پابەنـدبونی ژێردەسـتەکانی کڵێسـا بـۆ فەرمانـەکانی دروست دەبێت.

هەڵوێستی کڵێسا بریتی بووە لـەوەی کە دوو جۆر لەپابەنـدبونی رۆحیو دنیایی هەیـە، ئەم پابەندییانـە هەنـدێکجار بەرامبـەر دەبنـەوە، بـەڵام ئـەم نەگونجانـە ناگاتـە ئاستێك چارەسـەری نـەبێت، لەسـەر ئـەم بنەمایە پێیوایە دوو دامـەزراوەی سـەربەخۆ لەئارادایـە کـە هەریەکـەیان ئـەرکی خـۆی هەیـە، بـەڵام لەگـەڵ ئەوەشـدا، هەمیشـە پێویسـتی بەهاوکارییو پشتگیری ئەویتریان دەبێت.

داننـان بەئیزدیواجیـەت لەرێکخسـتنی کۆمەڵگـەی مرۆڤایـەتیو چاودێریکردنی بەمەبەستی پاراستنی دوو گەورەترین کۆمەڵە بـەهای ئەخلاقی لەسەرەتای سـەردەمی ناوەڕاسـتدا بەتیۆرێك دارێـژرا بـەناوی تیۆری دوو شمشێر The theory of two words[٣٥٠] ئـەم تیـۆرە لـەو روانگـەوە سەرچـاوە دەگرێـت کـە دەڵێـت کاروبـاری رۆح و سـەرفەرازبونی هەتاهـەتایی لەتایبەتمەندییـەکانی کڵێسـان و بوارەکـانی مژەپێـدان و فێرکردنـی قەشـە پێـی هەڵدەسـتێت، بـەڵام هەرچـی روداوە دنیاییـەکانی رۆژانەیـەو پارێزگـاریکردن لەئاشـتیو رژێم و دادوەریـی لەتایبەتمەندییەکانی حکومـەتی مـەدەنین، پێویسـتە لەنێوان ئـەم دوو گروپـەدا پەیوەندییـەك لەبەها ئەخلاقییەکان دروسـت ببێت و پشت بەگیانی هاوکاریو پشتگیریی ببەستێت.

350– سەبارەت بەم تیۆرە بڕوانە:

- Harmon, op., cit.. p 105-106.

دانەری ئەم تیۆرە، گلاسیۆسی یەکەم لەو بڕوادایە کە پێویستە ئیمپراتۆر لەمەسەلە زانستییەکانی پەیوەست بەبیروباوەڕ ملکەچی ئیرادەی قەشەکان ببێت، لەسەر ئەمە کلێسا ئەو لایەنە دەبێت تایبەتمەند دەبێت بەگشت کاروبارەکانی و ئاشکرایە بەبێ ئەمە ناتوانێت سەربەخۆ بێت و فەرمانڕەوایی خۆی بکات.

گلاسیۆس بۆرۆشتن لەگەڵ ئەم پرەنسیپە جەختدەکاتەوە لەسەر ئەوەی کە دەبێت پیاوانی ئاینی لانی کەم سەبارەت بەلێپرسراوێتیان لەمەسەلە رۆحییەکاندا دادگایی بکرێن لەبەردەم داگا تایبەتەکانی کلێسادا نەك لەبەردەم داگا مەدەنییەکاندا، بۆ سەلماندنی ئەم بیروبۆچونەش پێیوایە جیاوازیی نێوان مەسەلە رۆحیو مەسەلە زەمەنییەکان بەشێکی بنەڕەتی بیروباوەڕی مەسیحییەت پێکدەهێنێت، دواجار پابەندبونێکە هیچ حکومەتێکی بەبیروباوەڕ مەسیحی ناتوانێت خۆی لێ دوربگرێت.

کۆکردنەوەی هەردو دەسڵاتەکە (رۆحیو زەمەنی) نەریتێکی بتپەرستانەیە، لەوانەیە لەسەردەمەکانی پێش مەسیحییەتدا رەوایەتی هەبوبێت، بەڵام لەدوای دەرکەوتنی مەسیح هیچ نییە جگە لەهاوبەشیکردنی شەیتان، مەسیح فەرمانی بەجیاکردنەوەیان کردوە وەك هەستکردن بەلاوازیی دەرونی مرۆڤایەتیو بۆ سنوردانان بۆ کیبریاو لەخۆبایی بونەکانیو بەمەش دوایەمین کەسە کە بەشێوەیەکی شەرعی هەردو دسڵاتەکەی کۆکردبێتەوە.

لەمیانەی ئەمەشە نەدەبو کەسێك لەیەککاتداو لەچوارچێوەی ئایینی مەسیحیدا دوو پۆستی (پاشاو قەشە)ی هەبێت لەگەڵ داننان بەپێداویستی هەریەك لەم دەسڵاتانە بەیەکتر: ئیمپراتۆرە

مەسیحییەکان پێویستیان بەپیاوانی ئایینی کڵێسا دەبێت لەپێناو بەدەستهێنانی ژیانی هەتاهەتایداو پیاوەکانی کڵێسایش بەمەبەستی ئەنجامدانی کارە ئایینییەکانیان سود لەهاوکارییەکانی ئیمپراتۆرییەت وەردەگرن.

بەندی یەکەم

# رابەرە یەکەمەکانی کڵێسا

لێرەدا، باس لەسێ کەسایەتی دیار دەکەین کە بۆ قۆناغی دروستبونی بیری مەسیحی دەگەڕێنەوەو نازناوی (مامۆستایانی کڵێسای خۆرئاوا)یان لێنراوە، لەبەرئەوەی ئەمان تەنیا بەچارەسەرکردنی مەسەلە هەنوکەییەکانی سەردەمی خۆیانەوە نەوەستان، بەڵکو- لەپاڵ ئەوەشدا- گوزاشتیان لەتێڕوانیك دەکرد کە چەندین لایەنی گرنگی بیروباوەڕی مەسیحیی لەخۆگرتبوو بووە بەشێکی بنەڕەتی بیری مەسیحی پەیوەست بەپەیوەندی نێوان دەوڵەت و کڵێسا.. ئەم کەسایەتییە بیرییانەش بریتین لە" ئەمبرۆز، قەشە ئۆگوستین و گریگۆری

## یەکەم: ئمبرۆز – St Ambrose

ئەمبرۆز (٣٤٠ – ٣٩٨)[351] دەناسرێت بەوەی سیاسیەتمەدارەو نمونەی ئەو پیاوەیە کە نوێنەرایەتی سەردەمەکەی خۆی دەکات،

351– ژیانی ئیمبرۆز لەماوەیەکی کورتدا لەنێوان سەرکەوتنەکانی کڵێسای کاتۆلیکی لەئیمپراتۆرییەتی ڕۆماو داگیرکارییەکانی بەربەردا گەشەی سەند، لەشاری (Trier) لەولاتی غال کە تیایدا تیپە سەربازییەکانی ڕۆما وڵاتیان لەهاتنی ڕەگەزە جێرمانییەکان دەپاراست، لەتەمەنی سیانزەساڵیدا هاتوەتە شاری ڕۆماو زمانی یۆنانی بەباشی فێربووەو یاسای خوێندوە تاکو شارەزاییەکی تەواوی تێدا بەدەستهێناوە، لەتەمەنی سی ساڵیدا کراوە بەفەرمانڕەوای یەکێک لەشارەکان، پاش چوار ساڵ بەهەڵبژاردنی لەلایەن تێکڕای گەلەوە بووەتە سەرۆکی ئەسقوفەکانی میلان و لێرەوە گۆڕانی بنەڕەتی بەسەر ژیانیدا هاتوە، دوابەدوای

توانی بیرۆکەیەك بۆ پیاوانی ئایینی دابڕێژێت سەبارەت بەپەیوەندی نێوان کڵێساو دەوڵەت، بەشێوەیك بووە سەرچاوە بۆ نوسەرە مەسیحییەکان سەبارەت بەو وتووێژانەی دواتر لەبارەی بابەتەکەوە دروست دەبون.

کڵێسا لەتێڕوانینی ئەمبرۆزدا بریتییە لەتەنیا لایەنی تایبەتمەند بەمەسەلە رۆحییەکانی گشت مەسیحییەکان و لەناویاندا خودی ئیمپراتۆر هاوشێوەی هەموو مەسیحییەکانی تر بەدەر نییە لەوەی یەکێك بێت لەکوڕەکانی، بۆیە پێویستە تێڕوانین بۆ ئیمپراتۆر لەچوارچێوەی کڵێسادا بێت نەك لەسەروی ئەو چوارچێوەوە.[٣٥٢]

ئەمبرۆز ساڵی ٣٨٤ سەبارەت بەمەسەلەکانی بیروباوەڕی مەسیحییەت پەیامێکی ئاراستەی ئیمپراتۆر ( ڤالنتاین) کردو بەبوێرێکەوە بۆی نوسی ( نەریت وابو کە پیاوەکانی کڵێسا دادگایی ئیمپراتۆرە مەسیحییەکان بکەن، ئیمپراتۆرەکان بۆیان نییە دادگایی پیاوانی کڵێسا بکەن) وەك چۆن ئەوەیش دوپاتکردوە، کە چۆن پێویستە گشت رۆمانییەکان خزمەتە سەربازییەکانیان پێشکەش بەپاشاکانیان بکەن، بەهەمانشێوە لەسەریەتی (ئیمپراتۆر) خزمەتەکانی پێشکەشی خودای گەورە بکات.. چونکە ئەویش کوڕی

---

دابەشکردنی گشت سامانەکەی بەسەر هەژاراندا دەستیکردوە بەژیانی تەقەشوف و لەخۆگرتنەوە، لایەنگری کۆنگرەی نیکیاو باڵادەستی کڵێسا بووە لەمەسەلە ئایینیو زەمەنییەکاندا، زۆر ئازایانە بەرەنگاری فرەیی دەسەڵاتی سیاسی لەسەر بەرژەوەندییەکانی کڵێسا بووەتەوە.. بڕوانە: عبدالقادر محمد یوسف: سەرچاوەی پێشوو..

352_ بڕوانە: سباین: سەرچاوەی پێشوو.. ل ٢٧٤ .

کڵێسایەو کەواتە لەچوارچێوەی دامەزراوەکەدایە نەك لەسەرووییەوە.[٣٥٣]

ئەمبرۆز وتوێژی لەسەر ئاستی پابەندبونی خەڵکی نەکردوە لەگوێڕایەڵی دەسڵاتی مەدەنیدا، بەڵام جەختی کردوەتەوە لەسەر ئەوەی کە پیاوی ئایین مافی دیالۆگکردنی لەگەڵ پاشا هەیە نەك تەنیا وەك لێپرسینەوە لێی بەڵکو پابەندی دیالۆگە سەبارەت بەمەسەلەکانی پەیوەست بەئەخلاقەوە، ئەمبرۆز تەنیا بەبانگەشەکردن بۆ ئەم پرەنسیپە نەوەستاوەو ئەوەیشی تێپەڕاندوە باسی لەمەسەلەی جێبەجێکردنی کردوە بەشێوەیەکی کرداریی.[٣٥٤]

ئەمبرۆز دانی بەفراوانبونی دەسڵاتی ئیمپراتۆردا ناوە بەسەر موڵکە دنیاییەکانداو لەناویاندا زەوییەکانی کڵێسا، بەڵام بینایەی خودی کڵێسای تایبەت بەئەنجامدانی سروتە رۆحییەکان ناچێتە

353– بڕوانە: برتراند راسل: سەرچاوەی پێشوو.. ل ٥٦ . لەگەڵ: جان توشار: سەرچاوەی پێشوو.. ل ٩٩ .

354– هەستاوە بەقەدەغەکردنی گێڕانی مەراسیمی قۆچکردن لەبەردەم ئیمپراتۆر (سیۆدیسیۆس)داو بەکافربون تۆمەتباری کردوەو داوای لێکردوە بگەڕێتەوە لەو تاوانەی کە پێشتر ساڵی (٢٩٠) لەکوشتارگەی تسالۆینکادا پێی هەستاوەو بووەتە هۆی کوژرانی حەوت هەزار کەس، بەو مانایەی کە بۆ یەکەمجارە کڵێسا فەرمانێک لەدژی ئیمپراتۆردا دەربکات سەبارەت بەکارێکی تایبەت یان کارێکی فەرمی کە پەیوەندی بەباوەڕەوە نییە، وەک چۆن لەبۆنەیەکی تردا جەختیکردوە لەسەر راگرتنی ئەم مەراسیمە تاکو ئیمپراتۆر لەبڕیارێک بکشێتەوە کە ئیپرۆز بەستەمکردن لەئیمتیازەکانی کڵێسای دەزانی، لەبۆنەی سێیەمیشدا ئەوەی رەتکردوە کڵێسایەک تەسلیم بکات کە ئارییەکان بەفەرمانی ئیمپراتۆر بەکاری بهێنن.. بڕوانە: برتراند راسل: سەرچاوەی پێشوو.. ل ٥٦–٦٠ .

چوارچێوەی ئەو دەسەڵاتانەوەو لەمبارەوە دەڵێت" کۆشکەکان دەگەڕێنەوە بۆ ئیمپراتۆرو کڵێساکانیش بۆ پیاوانی ئایینی.

کاتێك ئمبرۆز دێتە سەر باسکردنی مەسەلەی گوێڕایەڵی دەبینین بەئاشکرا نکوڵی دەکات لەپرەنسیپی بەرهەڵستی کردنی فەرمانەکانی بەهێز، لەجیاتی هێز داوادەکات لەرێگەی پەنابردنە بەر هۆیەکانی دیالۆك و رازیکردن ودوپاتکردنەوەی بیروڕاوە رێگە لەدەستێوەردانە سیاسیەکانی ئیمپراتۆر بگیرێت لەکاروبارەکانی کڵێسادا، دواجار پەنابردنە بەر توندوتیژی وەك شۆرش و یاخیبون پەسەند ناکات و تەنانەت هاندان بۆ توندوتیژیش.

فەرمانڕەوای دنیایی لەمەسەلە رۆحییەکاندا ملکەچی رێنماییەکانی کڵێسا دەبێت و دەسەڵاتی بەسەر موڵکەکانی کڵێسادا لانی کەم دەسەڵاتێکی دیاریکراوە، بەڵام دەکرێت سایەی کڵێسا بەسەریدا لەرێگەی هۆیە رۆحییەکانەوە بپارێزرێت نەك بەبەرەنگاربونەوەی ماددی.[٣٥٥]

## دووەم: قەشە ئۆگوستین – St.Augustine

ئۆگوستین (٣٥٤ ــ ٤٤٠)[٣٥٦].. لەدیارترین قوتابیان و شوێن پێهەڵگرانی ئمبروزە، کاریگەریی بیرەکەی زیاتر بو لەگشت بیرەکانی

---

355– بڕوانە: سباین: سەرچاوەی پێشوو.. ل ٢٧٥ .

356– ئۆگۆستین لەتاجیستا (Tagaste) لەدایک بووە، لەکاری نۆمیدیا (بازاڕی ئۆراس لەجەزائیر لەسەر سنوری تونس) دایکی مەسیحی بووەو باوکی بتپەرست، ئۆگۆستین خوێندێکی فراوانی لەبارەی هونەری (بەیان)ەوە بەدەستهێناوە، ئەم خوێندنە رۆحی شیشرۆنی بەسەردا زاڵ بووە، پێش تەمەنی بیست ساڵی پشتی لەمەسیحییەت هەڵکردوە بەهۆی سادەیی کتێبە پیرۆزەکانی مەسیحییەت لەروی شێوازو فۆرمەوە، لەبەر ئەوەش کە لەگەڵ رێساکانی هەڵسوکەوتی مەسیحییەتدا

سەردەمە کۆنەکان، لەرێگەیەوە زۆربەی بیری کۆن گوازرایەوە بۆ سەردەمەکانی ناوەڕاست، نوسراوەکانی سەرچاوەیەکی دەوڵەمەندی ئەوتۆ بون کە دواتر نوسەرانی کاتۆلیك و پرۆتستانت وەك یەك سودیان لێوەرگرت، لەوانەیە دیارترین بیرۆکە ئۆگوستین دایهێنابێت وێناکردنی بێت بۆ کۆمەڵە میللەتانی مەسیحیەت Christian ommonwealth سەرەڕای فەلسەفە مێژوییەکەی کە پێیوایە ئەم میللەتانە لوتکەی پەرەسەندنی رۆحیی مرۆڤە.

بەهۆی توانا مەزنەکەیەوە ئەم بیرۆکەیە توانی ببێتە بەشێکی سەرەکیی لەبیری مەسیحیەت، سیمای ئەم بیرە نەك بەتەنیا تاسەردەمی ناوەڕاست، بەڵکو تاکو سەردەمی نوێیش درێژەی هەبوە.[357]

کتێبی شاری خودا City of Godی ئۆگوستین کاریگەرییەکی گەورەی هەیە لەبەرئەوەی بەتێروتەسەلی مێژویی مەسیحیەتی خستوەتەڕو لەروی مێژو و ئێستاو ئایندەوە، هەروەها هەوڵێکیشە بۆ وەڵامدانەوەی ئەوانەی کە پێیانوایە روخانی رۆما (مانگی ئاب – ٤١٠ ) لەسەر دەستی سەرکردەی قوت (ئەلئاریك) دەگەڕێتەوە بۆ دەستبەرداربونی خەڵکی لەپەرستنی خواوەندە کۆنەکان و دەستگرتن بەمەسیحیەتەوە، رۆما تا ئەو کاتەی خواوەند (جۆبتر)

---

نەگونجاوە، لەگەڵ سەرەتای لاوێتیدا لەقرتاجە بووەتە مامۆستای بەیان، حەزی زۆری لەفەلسەفە بووەو ئەمەش هاندەری بووە لەوەی پەیرەوی لەمانەوییە (ی فارسی) و دواتریش ئەفلاتۆنیەتی نوێ بکات تا لەئاکامدا باوەڕی بەمەسیحیەتی کاتۆلیکی هێناو ساڵی (٣٨٧) سەرەتا کاهین و ئنجا بەئەسقوفی شاری عەنابەی جەزائیری دامەزرا، بەهۆی زیرەکیو لێوەشاوەیی خۆی بووەتە رابەری رۆحی کاتۆلکیەتی ئەفەریقا.. بڕوانە: الموسوعة الفلسفية: سەرچاوەی پێشوو.. لا ٧٤ .

357– بڕوانە: سباین: سەرچاوەی پێشوو.. ٢٧٥ .

مابو، بەهێزبو، بەڵام کاتێک ئیمپراتۆرەکانی دەستیان لەپەرستنی هەڵگرت، چیتر پارێزگاری لەشوێنکەوتوە رۆمانییەکانی نەکرد.[٣٥٨]

بتپەرستەکان بەڵگەکانیان لەم بوارەدا لەسەر دوو بنەما دارشتبو" یەکەمیان مەسیحیەت داوایکرد پاشەکشە بکرێت لەجیهان و بەمەش هاوڵاتی لەخزمەتکردنی دەوڵەت دورکەوتەوە، دوەمیان چارەنوسی رۆما هەمیشە پەیوەست بوە بەهزری بتپەرستەکان بەپەرستنی خواوەندەکانییەوە، لەبەرئەوەی بڵاوبونەوەی مەسیحییەت کاریگەری سەلبی لەسەر توانایی بەردەوامبونی ئەم بیروباوەڕە بەجێهێشت، ئەم خواوەندە داتاشراوە سزایەکی گەورە بەسەر ئیمپراتۆرییەتدا دادەبەزێنێت، ئەم بەڵگەشیان بەتەواوەتی بەهێز بو کاتێک پێشبینیەکانیان بۆ روخانی ئیمپراتۆرییەت لەسەردەمی فەرمانڕەوایی مەسیحییەتدا لەجێگەی خۆیدابو.

لایەنگرانی بتپەرستی ئاماژەیان دەکرد بەوەی کە بیری مەسیحی کۆک نییە لەگەڵ ماف و ئەرکەکانی هاوڵاتیدا،. کە لەناو بەندەکانیدا هاتوە" ئازار بەئازار وەڵام مەدەرەوە.. هەر کەسێک زلەیەکی لەرومەتی راستت دا رومەتی چەپیشی بۆ بکەرەوە.. هەر کەسێک ناچاریکردی میلێک لەگەڵی بڕۆیت تۆ دوو میلی لەگەڵ بڕۆ..".

ئۆگوستین لەوەڵامی ئەم بانگەشەی بتپەرستاندا دەڵێت ئەو چاکانەی مەسیحییەت بانگەشەی بۆ دەکات هەمان ئەو چاکانەیە کە بتپەرستی بانگەشی بۆ کردوە، ئایا ستایشی سالۆست Sallustی رۆمای نەکردوە لەبەرئەوەی پەیڕەویی لەبنەمای لێبوردن لەکاتی تواناتییدا کردوە؟.. ئایا خەسرەو ستایشی قەیسەری نەکردوە،

---

358- بڕوانە: برتراند راسل: سەرچاوەی پێشوو.. ل ٨٣ .

لەبەرئەوەی ئەمەی دوەمیان هیچ شتێکی لەبیرنەچوەتەوە جگە لەدەست درێژیکردنە سەر خۆی؟..

ئەگەر بگەڕینەوە سەر مێژوی رۆمانی دەبینین ئەو گوزارشتانە زیانیان بەدەوڵەت نەگەیاندوە، وەك چۆن پێویستە لەم بوارەدا فەرمانەکانی ئینجیل بهێنینەوە یاد، لەئینجیلدا راسپاردەیەك نییە داوا لەمسیحییەکان بکات چەکەکانیان دابنێن یان دەست لەخزمەتی سەربازیی هەڵگرن.. ئینجیل رێگری لەهی کەسێك نەکردوە کە خۆی بۆ خزمەتی دەوڵەت تەرخانکردبێت.[٣٥٩]

بیرۆکەی سەرەکی کتێبی (شاری خودا) هاوسەنگی دروستکردنە لەنێوان ئەوانەی کە ناوی (شاری ئەم دنیا) و (شاری خودا) لێنراوە، لەمیانەی ئەم هاوسەنگییەوە دەگەینە ئەوەی کە لەسروشتی هەر مرۆڤێکدا دوو خۆشەویستی هەیە" خۆشەویستی خود و خۆشەویستی خودا، هەر لەبەر ئەمەشە دوو دەوڵەت دروست بون کە گشت کۆمەڵگای مرۆڤایەتییان بۆ دەگەڕێتەوە" شارێکی سەر زەویی و شارێکی ئاسمانی یان شاری خودا، یەکەمیان خراپەکارو ناتەواوەو دوەمیان چاکەکارو تەواوەو لەنێوان ئەم دوو شارەدا، هەر لەسەرەتاوە شەڕێکی گەورە دەستی پێکردوە، یەکەمیان خەبات بۆ سەرخستنی ستەم و پشتگیری خراپەو لەرێگەلادان دەکات و.. دوەمیان کار لەسەر رێگەی دادوەریی و بەدیهاتنی چاکەو دوپاتکردنەوەی باوەڕ،[٣٦٠] دەکات، ئەم دوو جەنگە تا کۆتایی جیهان لەنێوان ئەم دوو دەوڵەتەدا بەردەوام دەبێت و سەرکەوتنی کۆتایی

---

359- بڕوانە: الدکتور. عبدالقادر احمد الیوسف: سەرچاوەی پێشوو.. ل ٦٢-٦٤ .

360- بڕوانە: الدکتور. علی عبدالمعطی محمد: سەرچاوەی پێشوو.. ل ١٤١ .

لەبەشی خودا دەبێت، ئاشتی لەشاری خودادا نەبێت بەدینایەت و بەردەوامیش تەنیا بۆ مەلەکوتی رۆحە، کەواتە راڤەی ئۆگوستین بۆ روخانی رۆما لەو روانگەوەیە کە هەمو شارێکی سەر زەویی بەپێودانگی سروشتی دەسڵاتەکەی لەنیگەرانیو داڕوخان دەبێت کۆتایی پێبێت، بەچەشنێك بنچینەی ئەو دەوڵەتە لەسەر لایەنەکانی سروشتی مرۆڤایەتی بەندە کە جگە لەئارەزوی دەستدرێژیکردن و ئارەزوکردنی کۆنترۆڵکردن و پاوەنخوازیی هیچ ئارەزوییەکی تری نییە.[٣٦١]

لەراستیدا ئۆگوستین مەبەستی نەبوە بڵێت دوو دەوڵەتەکە سەر زەویی و ئاسمانی بەشێوەیەکی کرداریی لەسەر یەکێك لەرێکخستنەکان جێبەجێدەبێت، نە کڵێسا ئەو شارەی خودا بو کە بانگەشەی بۆ دەکردو نە حکومەتی دنیایش ئەو هێزەی خراپە بو کە لەمەملەکەتی شەیتاندا باسیکردوە، بۆیە پێویست نەبو پیاوانی کڵێسا هێرش بکەنە سەر حکومەت بەوەی نوێنەرایەتی مەملەکەتی شەیتان دەکات، ئۆگوستین هاوشێوەی سەرجەمی مەسیحییەکانی دیکە لەو بڕوادا بو گشت دەسڵاتێکی دنیای بەخواستی خودا دروست دەبێت و خراپەی مرۆڤ پاڵی بەم دەسڵاتە (دنیا)ییەوە ناوە پەنابباتە بەر توندوتیژی، ئەم توندوتیژییە وەك داودەرمانێکی ئاسمانی وایە بۆ چارەسەرکردنی خراپەی مرۆڤایەتی.

سەربای ئەمەش ئەوەی بەخەیاڵی خۆیدا نەهێناوە کە ئەم دوو دەوڵەتە لەیەك جیابن، هەردوو دەوڵەتی ناوبراو هەمیشە تێکەڵ

---

361– بڕوانە: سباین: سەرچاوەی پێشوو.. ل ٢٧٦-٢٧٧ .

دەبنەوەو بەدرێژایی ژیان بەیەکدا دەچن و لەڕۆژی دوایدا نەبێت لەیەکتری دانابڕێن.

لەزۆر لایەنەوە کاریگەرترین بیرۆکەی ئۆگوستین ئەو بیرۆکەیە جەخت لەسەر پێداویستی فەراهەمبونی واقعییەت و هێز دەکات لەکڵێسادا لەسەر بنەمای ئەو پرۆژەی کە بۆ دەربازکردنی مرۆڤ نەخشەی کێشاوەو لەپێناو بەدیهاتنی ژیانێکی ئاسمانی بەتەواویی پشتی بەواقعییەتی کڵێسا دەبەست وەك یەکێتییەك کە گشت باوەڕداران لەخۆدەگرێت و هەروەها لەسەر ئەو توانایەی کە سروش و چاودێری خودا لەمێژویی مرۆڤایەتیدا دەیگرێت، بۆیە ئۆگوستین دەرکەوتنی کڵێسای مەسیحی بەخاڵی وەرچەرخانی مێژو دادەنێت، لەبەرئەوەی سەرەتای قۆناغێکی نوێیە لەململانێی نێوان هێزەکانی خراپەو هێزەکانی چاکە، لەم ساتەوەختەوە دەربازبونی مرۆڤ پەیوەست بوە بەبەرژەوەندی کڵێساوە کە لەسەروی گشت بەرژەوەندییەکانەوەیە.[٣٦٢]

کاتێك دێینە سەر پەیوەندی فەرمانڕەوایانی زەمەنیی لەگەڵ لێپرسراوانی کڵێسادا دەبینین ئۆگوستین لەو بڕوادایە کە دەڵێت" پێویستە دەوڵەت دەوڵەتێکی مەسیحی بێت و خزمەتی کۆمەڵگەیەك بکات کە بەهۆی باوەڕی هاوبەشی مەسیحییەوە دروست بوە، کۆمەڵگە بەهۆی ئەم باوەڕەوە دەگاتە ژیانێك کە تیایدا بایەخدان بەرۆح دەکەوێتە سەروی گشت بایەخدانەکانەوە، کۆمەڵگە لەرێگەی مانەوە لەسەر ئەم باوەڕەو پاراستنیەوە بواری بۆ دەڕەخسێت رۆڵێکی گەورەی هەبێت لە بەدیهاتنی دەربازبوندا.

---

362- هەمان سەرچاوەی پێشوو.. ٢٧٧-٢٧٨ .

ئۆگوستین بەهێزەوە بەرگری لەو بیرۆکە دەکات کە دەڵێت پێویستە کۆمەڵە میللەتێك (کۆمۆنۆیلس)ی مەسیحی هەبێت، ئەمەش لەبڕوابونی ئۆگوستینەوە بوە بەوەی کە دەوڵەت ئەگەر مەسیحی نەبێت ناتوانێت دادوەریی فەراهەمبکات، بۆیە هەڵەیە ئەگەر بڵێین دەوڵەت دەتوانێت ماف بۆ گشت خاوەن مافێك دابین بکات، لەکاتێکدا ئەو دەوڵەتە (کە مەسیحی نییە) نەتوانێت مافی خودا لەپەرستن بدات.[٣٦٣]

فەلسەفەی ئۆگوستین لەبارەی مێژووە گەیاندیە ئەو بڕوایەی کە ئیمپراتۆریەتەکانی پێش مەسیحییەت دەوڵەت بون بەڵام بەمانایەکی تەسك و دیاریکراو: هەر دەوڵەتێك دوای دەرکەوتنی مەسیحییەت ناتوانێ بگاتە ئاستی راستەقینەی دەوڵەت ئەگەر خودی ئەو دەوڵەتە مەسیحی نەبێت و هەرگیز هیچ حکومەتێك بواری بۆ ناڕەخسێت دادوەر بێت ئەگەر پەیوەندی بەکڵێساوە نەبێت،[٣٦٤] بەمشێوە سیمای دەوڵەتی مەسیحی پەیوەستی توانای ئەو دەوڵەتە بو لەبەدیهاتنی دادوەریی تیایدا.

ئەم بیرانە بەتێکڕا جەخت لەسەر لایەنگریی بیرۆکەی سەروەریی کڵێساو سەربەخۆیی لەکاروبارە رۆحییەکاندا دەکەن، هەروەها وێناکردنی حکومەت بەوەی موڵکێکی هاوبەشە لەنێوان هەردو دامەزراوەی خاوەندارێتیو کڵێسادا.

---

363- Harmon, op., cit.. p 99.
364- Ibid., p 100.

ئەمە تەنیا مانای سەربەخۆبونی کڵێسا نییە، بەڵکو داننان بەسەربەخۆیی حکومەتی مەدەنیدا دەنێت تا ئەو ئەندازەی لەچوارچێوەی ڕێگەپێدراودا کاربکات.

## سێیەم: گریگۆری[365]

کتێبەکانی قەشە گریگۆری بەهێزترین بەڵگەی پاڵپشتی پێداویستی ڕێزگرتنی دەسڵاتی زەمەنی لەخۆگرتوە، تەنیا کەسە لەنێو پاپاکانی کڵێسادا باسی لەپیرۆزی فەرمانڕەوایی سیاسی کردوە بەزمانێك کە بانگەشەی گوێڕایەڵی سەلبی کردوە.

پوختەی تێڕوانینی گریگۆری لەمبارەوە ئەوەیە فەرمانڕەوای خراپ مافی هەیە نەك تەنیا لەگوێڕایەڵیدا (وەك ئەوەی هەمو نوسەرە مەسیحییەکان بانگەشەی بۆ دەکەن) بەڵکو لەوەشدا کە ئەم

365- بەهێزترین و خاوەن پایەترین پاپاکانە،لەرۆما لەخانەوادەیەکی دەوڵەمەند لەدایکبوە زۆر بەباشی خوێندویەتی‌و ساڵی ٥٧٣ بووەتە عومدەی رۆما، بەڵام زۆری نەبردووە دەستی لەو پۆستە هەڵگرتوە تاکو بەتەواوەتی خۆی بۆ ئایین یەکلایی بکاتەوە، پاپا ئاشنای لێهاتوییە سیاسیەکەی گریگۆری بوو، بۆیە وەک نوێنەری خۆی رەوانەی کوستەنتینیەی کردو لەوێ بۆ ماوەی شەش ساڵ نوێنەرایەتی بەرژەوەندی‌و تێڕوانینە ئایینیەکانی پاپای لەناو ئیمپراتۆر کرد.. لەگەڵ مردنی پاپا ساڵی (٥٩٠) پۆستی پاپای لەئەستۆگرت لەکاتێکدا کڵێسای رۆما هیچ هێزێکی یاسادانانی بەسەر دەرەوەی سنورەکانی ئەبرەشییەدا نەبووە، لەباروۆخێکی ئێجگار دژوارو رارادا گریگۆری هەستا بەبڵاوکردنەوەی مەسیحیەتی کاتۆلیکی.. لەئیسپانیا قوتە خۆرئاواییەکان هاتنە سەر رێبازی کاتۆلیکی، هەروەها (مپیلۆف) پاشای لۆمباردیش ئامێزی بۆ کردەوە، وەک چۆن لەرێگەی قەشە ئۆگۆستین کاری بۆ بەمەسیحی کردنی ئینگلیزە سەکسۆنەکانی ئینگلتەرا کردو لەکارەکانیدا سەرکەوتوبو.. بەم بۆنەوە نازناوی باوکی رۆحی ئەورپای پێبرا.. بڕوانە: الدکتور احمد عبدالقادر الیوسف: سەرچاوەی پێشوو.. لا ٦٩ .

گوێڕایەڵییە بێدەنگ و سەلبی بێت: ژێردەستەکان نەك هەر دەبێت گوێڕایەڵ بن، بەڵکو نابێت هەوڵ بدەن بۆ بڕیاردان لەسەر ژیانی فەرمانڕەواکانیان یان ڕەخنەی لێبگرن یان لێپرسینەوەیان لەگەڵ بکەن.

سەرباری ئەو گەورەیی ئەو دەسڵاتەی گریگۆری پیادەی دەکرد، کە دەسڵاتێکی ئایینیو دنیاییەو لەچوارچێوەیەکدایە کە دەگاتە ئاستی دەسڵاتی پاشاکان، هێشتا جیاوازییەکی رونی شێواز هەیە لەنێوان ئەو وتارانەی ئاراستەی ئیمپراتۆرەکانی دەکردو لەنێوان ئەو وتارە بەرگرییو بوێرانەی پێنوسەکەی ئەمبرۆز دەینوسین، گریگۆری بەشێوەیەکی کرداریی ڕەخنە لەفەرمانەکانی ئیمپراتۆر دەگرێت ئەگەر لەو بڕوادا بێت کە پێچەوانەی یاسایە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا گوێڕایەڵیکردنی ڕەتناکاتەوە، ئەم تیۆری لەوە سەرچاوە دەگرێت کە ئیمپراتۆر دەسڵاتی فەرمانکردنی هەیە، تەنانەت ئەگەر ئەو (فەرمانە) نایاسایش بێت مادامێکی لێپرسراوێتییەکەی لەئەستۆ دەگرێت و ئەگەر ئەو لێپرسراوێتییەی روبەڕوی نەفرەتی ڕۆحی کردوە ئەوا دەسڵاتی فەرمانڕەوا نەك لەهەر لەخواوەندەوەیە بەڵکو بەدەر لەدەسڵاتی خودا، گەورەترین دەسڵاتی سەر زەویە.[366]

366- بڕوانە: سباین: سەرچاوەی پێشوو.. ٢٨١-٢٨٢ .

# سیستمی فیودالی

ئەگەر ململانێی نێوان هەردوو دەسەڵاتی ئایینیو مەدەنی بەیەکێك لەتایبەتمەندییەکانی سەردەمی ناوەڕاست دابنرێت، ئەوا سیستمی فیودالی دیاردەیەکی دیکەیە کە دەکرێت بخرێتە سەر ئەو تایبەتمەندییانە.

مەحاڵە مانای سیستمی فیودالی دیاریبکرێت و ئەمەش لەبەر دوو هۆی سەرەکیی: یەکەمیان ئەوەیە کە کۆمەڵە سیستمێکی زۆری تێرو لەیەکجیا لەخۆدەگرێت و دوەمیان بەشێوەیەکی جیاواز پەرەدەستێنێت لەکات و شوێنی جیاوازدا وێنەی تایبەت وەردەگرێت، بۆیە زۆر ئەستەمە مێژویی فیودالی بەمێژوییەکی دیاریکراو بنوسرێتەوە، بەڵام ئەمەش نابێتە ڕێگر لەبەردەم ئەوەی بڵێین ئەم سیستمە لەسەدەی نۆیەم و دەیەمدا لەئەوروپای خۆرئاوا ناسراوەو ئنجا لەدوو سەدەی دواتردا گەیشتوەتە قۆناغی کامڵبون و ئنجا بەرە بەرە دەستی بەپوچەڵبونەوە کردوە.[٣٦٧]

سیستمی فیودالی بەهۆی دوو کارەکتەرەوە گەشەی کردوە کە هەمیشە بەمەبەستی راڤەکردنی دەوڵەتی فیودالی بەکاردەهێنرێن، ئەو دوو کارەکتەرەش[٣٦٨].. بریتین لە:

---

367- الدكتور.عبدالحميد متولى: الوجيز فى النظريات و الانظمة السياسية و الدستورية: سەرچاوەی پێشوو.. لا ٩١ .

368- بڕوانە: الدكتور. ابراهيم درويش: الدولة" نظرياتها و تنظيماتها: سەرچاوەی پێشوو.. لا ١٢٦-١٢٧ .

١. جوتیارو خاوەن موڵکە بچوکەکان بەشوێن کەسێکی بەهێزی ئەوتۆدا دەگەڕان کە ئاسایش و پارێزگاریکردنی لەلا فەراهەم ببێت، ئەمەش دوای ئەوەی پەیدابونی دەسڵاتێکی ناوەندی بۆ کۆکردنەوەی گشت ئەم یەکە کەشتوکاڵیانە بوبووە کارێکی ئەستەم، بۆیە کەسێتی جەنتڵمان وەك پارێزەری چاوەڕوانکراوی ئەوان دەرکەوت، کۆمەڵە پەیوەندییەکی تێکچڕژاو لەنێوان خاوەن موڵکە بچوکەکان و جەنتڵماندا هاتەکایەوەو ئەمەش پاش پەرەسەندنێکی دورودرێژ بەوە کۆتایی هات جوتیارو خاوەنی موڵکی بچوك خۆی خستە ژێررکێفی کەسی جەنتڵمانەوە لەبەرامبەر ئاسایش و پارێزگاریکردن و بودجەیەکی کشتوکاڵی ئەوتۆ کە بەشی گوزەرانی بکات و رازیی بو بەوەی کە وەك کرێگرتە یان بەکرێچی کار لەسەر زەوییەك بکات کە بەگوێرەی ئارەزوەکانی خۆی بوەتە موڵکی جانتڵمان.

٢. لەئاکامی گشت ئەو بارودۆخانەی پێشوو، خاوەن موڵك و گەورە جەنتڵمانەکان لەپاراستنی دەسڵاتیان روبەڕوی تەگەرەو ئاڵۆزیی بونەوە، ئەمەش لەبەر لاوازی پەیوەستیو هاتوچۆ لەنێوانیانداو لەنێوان خەڵکیدا، بۆیە پێویستیان بەدڵسۆزیی کۆمەڵێك خەڵکی زیاتر هەبوو، بۆ ئەم مەبەستە دەستیان لەبڕێك لەموڵکەکانیان بۆ ژمارەیەك لەجەنتڵمانی بچوك هەڵگرت و ئەمانیش لای خۆیانە بەکرێ دایانە ئەو جوتیارە بچوکانەی کە دڵسۆزی زەوییو جەنتڵمانیش بوون، ئەوەی لای خۆیەوە بەهەمان دڵسۆزیی خۆی بەزەوییو موڵك و گەورە جەنتڵمانەکانەوە بەستوبووە.

هەرچۆنێك بێت لەدامەزراندنی دەوڵەتی فیوداڵدا کۆمەڵێك هۆ پشکیان هەبووە، دیارترینیان: روخانی ئیمپراتۆرییەتی رۆمانیای خۆرئاوا لەسەر دەستی هۆزە جەرمانییەکان ساڵی ٤٧٦ و ئەو ئاژاوە سیاسیەی لێی کەوتەوەو شکستی تەواو لەدامەزراندنی سێستمێکی فەرمانڕەوایی مەرکەزی بەهێزدا کە بووە هۆی دەرکەوتنی ئەنگیزەی ناوخۆییو دەسڵاتێکی فراوانی دایە دەست فەرمانڕەوای هەرێمەکان و ئەمەش یارمەتیدەریان بوو لەوەی سەربەخۆ بن لەدەسڵاتی مەرکەزیو پیادەکردنی چەندین دەسڵات لەچوارچێوەی ئەو هەرێمانەدا، ئنجا لەکۆتایدا، بەخشین لەملکەچی دەسڵاتەکانی پیاوانی دەسڵاتی دادوەرییو پیاوانی کاروباری دارایی لەفەرمانبەرەکانی حکومەتی مەرکەزیی[٣٦٩].. واتە بەڕێوەبردنی کاروباری داراییو بەجێگەیاندنی ئەرکەکانی دادگا لەتایبەتمەندییەکانی گەورە خاوەن موڵکە جوتیارەکان بوون، بێگومان ئەمە ئاکامی بێهێزیی دەسڵاتی حکومەتی ناوەندییە کە بووەتە هۆی زیادبونی لاوازییەکانی ئەو دەسڵاتە مەرکەزییە.

بەڵام ئەو پایانەی سێستمی فیوداڵی لەسەر دامەزراوە بەشێوەیەکی گشتی سیانن: بونی سەردارێکی فیوداڵی خاوەن زەویی و خاوەن دەسڵاتی فەرمانڕەوایی، بونی کۆیلەی زەویی، ئنجا ئابوریی کشتوکاڵی،[٣٧٠].. بەکورتی ئەم پایانە بریتین لە:

---

369– بڕوانە: الدکتور. عبدالحمید متولی: سەرچاوەی پێشوو.. لا ٩١ و لاپەڕەکانی دواتر.

370– هەمان سەرچاوەی پێشوو..

### ١. بونی سەردارێکی فیودالّی خاوەن زەویی‌و خاوەن دەسەڵاتی فەرمانڕەوایی

مافی خاوەنداریّتی زەویی پەیوەستی بووە بەمافی خاوەنداریّتی دەسەڵاتەوە، خاوەنداریّتی‌و دەسەڵات پێکەوە گرێدراون: سەرداریی فیودالّی کە فەرمانڕەوای هەرێمەکەیە (هەمیشە) پێشتر لەلایەن پاشاوە لەپۆستی سەرکردەیی سوپادا دامەزراوە، هاوشان لەگەڵ ئەم سەرکردەدا کۆمەڵە فیودالێکی دیکە (گەورە خاوەن موڵکەکان) هەیە کە لەناو موڵکە کشتوکاڵییە فراوانەکەیاندا هەندێك دەسەڵاتی فەرمانڕەواییان هەبوە (دانای باج، مافی سەرۆکایەتیکردنی دادگا) سەرباری ئەمانە کلێسایش کۆمەڵە فیودالێکی گەورەی هەبوە، پاشا لەدەوڵەتەکەیدا گەورەترین خاوەن موڵکی زەویی بوە تا ئەو کاتەی زەوییەکانی لەسەدەی نۆیەمدا دابەشکرد بەو شێوەی فیودالّی لەباوکەوە بۆ کوڕ بەرێگەی پشتاوپشت بمێنێتەوە.

ئەو دەسەڵاتانەی سەرداریی فیودالّی (فەرمانڕەوا) لێیان بەهرەمەند بوە زۆرن، لەوانە: مافی سەپاندنی باج بۆ حسابی تایبەتی خۆی بەرامبەر پابەندبون بەبەخشینی ئەمانەتێکی دیاریکراو بەپاشا، توانای سازدانی هاوپەیمانی لەگەڵ سەردارە فیوداڵەکانی دیکە، پارێزگاریکردن لەسنوریی فیوداڵەکەدا بەهێزی سەربازیی کە خۆی سەرکردایەتی دەکرد، دەرچواندنی پارە بەناوی خۆیەوە، سەرۆکایەتیکردنی دادگا، دادگاکان بەناوی ئەمەوە بڕیارپیان دەدا نەك بەناوی پاشاوە.

فیوداڵ بەگوێرەی ئەوەی باسکرا، لەگشت دەسەڵاتەکانی فەرمانڕەوایی‌و دادوەریی‌و بەڕێوەبردن بەهرەمەند دەبو، فەرمانڕەوای

راستەقینەی هەرێمەکە بوەو جگە لەدەسڵاتێکی زارەکی پاشا هیچ دەسڵاتێکی بەسەردا نەبوە.

## ٢. بونی کۆیلەی زەویی

جوتیار بەئاستی جیاواز لەپاشکۆیەتی بۆ سەرداریی فیودالی ژیانی دەگوزەراند، هەندێکیان لەچینی (قن) بوون و هەندێکی تریان لەباری جوتیارێکی ئازادەوە نزیك بون، ئەو رەگەزانەی سیستمی کۆیلایەتی زەویی لەسەر بونیادنراوە بریتین لە:

أ. زەویی مولکی سەرداریی فیودالە کە خاوەنداریێتیەکەی لەو کەسە یان یەکێك لەباوباپیرانی وەرگرتوە کە وەك فەرمانڕەوای هەرێمەکە دایمەزراندون، فیودال بەشێك لەزەوییەکەی دەهێڵێتەوە بەمەبەستی بەکارهێنانی لەبەرژەوەندی خۆی، بەڵام بەشەکەی تری بەسەر جوتیاران (کۆیلەکانی زەویی)دا دابەشدەکات بۆ ئەوەی هەریەکەیان لەئاستی خۆیەوە کشتوکاڵی تێدا بکەن.

ب. کۆیلەی زەویی پابەندە بەکشتوکاڵکردنی بەشە زەوییەکەی بەرامبەر بەو بڕە بەرهەمی دەیداتە فیودالەکە، پێویستە بەبێ کرێ کار لەکشتوکاڵکردنی ئەو زەوییەدا بکات کە فیودال پاراستویەتی (سێستمی بێگاری).

ت. (قن) پەیوەستە بەو زەوییەی کە فیودال هەیەتی، ئازادیی جێهێشتنی ئەو زەوییەی نەبوو، وەك بەشێك لەعەقاری زەوییەکە مامەڵەی کڕین و فرۆشتنیان پێوە دەکرا، مافی ئەوەی نەبوو گواستنەوەی بۆ پاشکۆیەتی سەردارێکی نوێ

ڕەتبکاتەوە، مافی ژنهێنانی نەبوو جگە لەچوارچێوەی موڵکەکانی سەردارەکەی.

### ٣. ئابوریی کشتوکاڵی

چالاکیی ئابوریی لەسەردەمی ناوەڕستدا بەشێوەیەکی بنچینەیی لەسەر کشتوکاڵ بەند بوە: کۆڵەکەی سێستم و کۆمەڵگەی فیوداڵییە بەهۆی لاوازیی دەسڵاتی پاشاکان و نەمانی ئاسایش و هەروەها بەهۆی دەرکەوتنی ئیسلام و هێزی عەرەبەوە کە ڕێگر بوو لەبەردەم گەشەسەندنی چالاکی بازرگانی ، بۆیە سێستمی فیوداڵی لەسەر بنەمای ڕێکخستنی بەکاربردنی زەویی‌و دابەشکردنی بودجەی ئەم بەکاربردنە لەنێوان چینە جیاوازەکان، بەبێ ئەوەی قازانێك ببێتە ئامانجی سەرەکیی ئەم سێستمە.

ئەم ڕاستییە هاندەرمان دەبێت لەسەر دوپاتکردنەوەی دوو ڕاستی کە ناوەڕۆکەکانیان دیارترین تایبەتمەندی ماوەیی فەرمانڕەوایی فیوداڵییە، دوو ڕاستییەکەش ئەمانەن:

**یەك:** روخانی دەسڵاتی سیاسی‌و لەناوبردنی بیرۆکەی دەوڵەت، مادامێکی بڕیاریانداوە سەروەریی دەوڵەت بەسەر خودی فیوداڵەکاندا دابەشبکرێت، بەچەشنێك بوونە سەروەرانێکی خاوەن دەسڵاتی رەها لەچوارچێوەی ناوچەکانی خۆیاندا.

**دوو:** لەلایەکی دیکەوە نەبونی بیرۆکەی نەتەوەکان، پەیوەندی نێوان تاکەکەس و دەوڵەت پچڕاو تاك بووە دیلی ئەو فیوداڵییەی کە تیایدا نیشتەجێ بووبوو، ئەوروپا بەسەر دەوڵەتدا دابەشنەکراوە، واتە کۆمەڵگەیەکی فیوداڵی فەرەنسی‌و کۆمەڵگەیەکی فیوداڵی بەریتانی نەبووە، بەڵکو فیوداڵیزم بریتییە لەیەکەی کۆمەڵایەتی‌و سیاسی لەو

ســـەردەماندا، تاکەکەســـەکان لەســـايەی فيودالّيزمـــدا هەســـتيان بەپاشکۆيەتی دەوڵـەتێکی دياريکراو نـەبووە تاهەستێکی نەتـەوەييان لەبەرامبەريـــدا هـــەبێت، بـــەڵکو بـــەو شـــێوەيە تەماشـــای کۆمەڵگـــەی فيودالّييـــان دەکـــرد کـــە کۆمەڵگايـــەکی بێســـنورە و ئـــاييني مەســـيحی يارمەتيـــدەر بـــووە لـــەپێکهێنانی ئـــەم يەکگرتوويـــە لەلايـــەك و بەشداربونيان لەرەچەڵەکی لاتينی لەلايەکی ديکەوە.[٣٧١]

371– بڕوانە: الدكتور. ثروت بدوى: سەرچاوەى پێشوو.. لا ١٠٩-١١٠ .

بەندی سێیەم

# بەشداری عەرەبی ئیسلامی لەبیری سیاسیدا

بیری ئیسلامی دەناسرێت بەوەی کە کۆمەڵە بەهایەکی سیاسییە کە شارستانییەتی ئیسلامی بنەماکانی بۆ داڕشتووە، ئنجا کۆمەڵە ئەبستراکتێکی سیاسی کاملە، واتە بونیادی بیری بۆ وێناکردن و راڤەکردنی بونی سیاسی وەك چۆن گەورە فەیلەسوفان لەمێژوی شارستانییەتی ئیسلامیدا خستویانەتەڕو.[٣٧٢]

ئەم کولتورە بیرییەی عەرەب و موسڵمانەکان کۆمەڵە ناوێکی مەزن لەخۆدەگرێت کە خاوەنی قورسایی‌و ئاماژەن لەمێژوی مرۆڤایەتیدا نەك تەنیا لەبەرئەوەی توانیویانە بەتەواوی چەندین سەردەم بنەخشێنێت و ئەڵقەیەکی پەیوەندیی جێگیر لەنێوان شارستانییەتە جیاوازەکانی مرۆڤایەتیدا دروستبکەن، بەڵکو هەروەها لەبەرئەوەی هەستاون بەداڕشتنێکی نوێی چەمکە سیاسییەکان[٣٧٣].. لێرەدا ئەوەندە بەسە ئاماژە بەناوەکانی وەك فارابی‌و ئیبن سیناو غەزالی‌و ئیبن روشد و ئیبن خەلدون و ئەوانیتر بکەین.

سیمای سەرەکی ئەم بیرە لەوەدایە کە بیرێکی رەسەنە، لەبەرئەوەی عەرەب خۆیان لەبەرامبەر شارستانییەت و ئاراستەکانی

---

372– بڕوانە: الدكتور. حامد ربيع: الفكر السياسي: سەرچاوەی پێشوو.. ل ١٨٨ .

373– هەمان سەرچاوەی پێشوو.. ل ١٨٩ .

تــردا گۆشــەگیر نــەکردوە، بــەڵکو ڕۆڵێکــی گــەورەیان گێــڕاوە بــەهۆی ئەوەی کە خاوەنی شارستانییەتێکن کە داخراو نییە یان بەسروشت دەمـاگیر نییـە، بـەڵکو کراوەیـە" بیری نەتـەوەکانی تـریش وەردەگرێـت بـەو ئەنـدازەی گونجـانی ئـەم بیرانـە لەگـەڵ واقعیـداو ڕۆڵـی هەیـە لەگەشەسـەندنی مرۆڤایەتیـدا،[٣٧٤] هـەر بۆیـە ئـەم شارسـتانییەتە لـەکولتوری یۆنانییـەوە ژمارەیـەکی زۆر چـەمکی وەرگرتـوەو دواتـر لەگــەڵ بــارودۆخ و دابونەریتــەکانی خۆیــدا گونجاندویــەتیو لـەقۆناغێکی دواتـردا ئـەم کولتـورەی گواسـتوەتە بـۆ میللـەتانی تـر، بەشێوەیەکی زیـاتر بێگـەردو وردتـر لـەروی وەڵـامی ئـەو پرسـیارانەی کە پەرەسەندنی گشتی بوونی کۆمەڵایەتی دەی سەپاندن.

لەسەر ئەمە ئەو بانگەشەی کە دەمارگیرەکان بۆ کولتوری یۆنانی یـان کولتـوری دەیکـەن کـە گوایـە فەلسـەفەی عـەرەبی فەلسـەفەی یۆنانییـەو بـەپیتی عـەرەبی نوسـراوەتەوە بانگەشـەیەکی پوچـەو هـیچ بنەمایەکی لەراستییەوە نییـە، تـەنیا بەخستنەڕوی ڕاستیو گەڕانەوە بــۆ بەڵگــە زانســتییەکان پوچــەڵدەبێتەوە، نوســەرانی مەســیحی لەسەدەکانی ناوەڕاست وەك چۆن مۆنتگمری وات دەڵێت:

( **لەڕاستی لایانداوە کاتێك پەردەیەکی ڕەشیان داوە بەسـەر زۆر لایـەنی ژیانی موسڵمانان و هەڵسوکەوتەکانیاندا** ) ئەورپاییـەکان (سەرەڕای هـەوڵی سـەد ساڵەی لێکۆڵـەران کـە بـیرو وێنـاکردنی زیـاتر بابـەتی لـەبارەی موسـڵمانەکانەوە لـەهزری خۆرئاواییەکانـدا دروسـتکردوە) هێشـتا نــاتوانن وەك پێویســت هەســت بکــەن کــە چــەندێك قــەرزاری

---

374- بڕوانە: الدكتور. فاضل زكي محمد: الفكر السياسي العربي الاسلامي بين ماضية و حاضره، دار الحرية للطباعة، بغداد-١٩٧٦ .. ل ١٣٥-١٣٧ .

شارستانییەتی ئیسلامیین.. بەبێ عەرەب مەحاڵ بوو زانست و فەلسەفەی ئەورپایی بەم ئەندازەیە گەشە بکات و عەرەب بەتەنیا گوێزەرەوەی بیری یۆنانی نەبوون، بەڵکو هەڵگری رەسەنی ئەو بیرەش بوون، تەنیا پارێزگارییان لەو زانستانە نەکردوە کە دەستیان کەوتوە، بەڵکو فراوان و پێشیانخستوە، ئەورپاییەکان ناچاربوون لەبەردەم عەرەبەکاندا فێری ئەو شتانە بوون کە دەکرا فێری بین تاکو دواتر هەنگاو بەرەو پێشەوە هەڵگرن.[٣٧٥]

لێرەوە دەکرێت بڵێین قسەکردن لەمەڕ کاریگەرییە زانستیو فەلسەفییەکانی عەرەب پێویستی بەلێکۆڵینەوە لەدوو لایەنی سەرەکی هەیە، ئەوانیش: دیاریکردنی ئەو رۆڵەی عەرەب لەگواستنەوەی دەسکەوتە زانستیو بیرییەکانی گریکدا گێڕاوییەتی؟ ئنجا وەبیرهێنانەوەی ئەوەی کە خۆیان لەبوارەکاندا کردویانە.

بێگومان بزوتنەوەی وەرگێڕان کە عەرەبە موسڵمانەکان بۆ فەلسەفەی یۆنانی ئەنجامیانداوە، بریتییە لەو کەناڵەی هەلی بۆ ئەم فەلسەفە رەخساند کە پاش وەرگێڕانی بۆ زمانی لاتینی لەشارستانییەتی کۆنەوە بگوێزرێت بۆ شارستانییەتی نوێ، ئەم بزوتنەوەی وەرگێڕانە لەبنەڕەتدا هاوکاتە لەگەڵ سەردەمی مەئمون (٨١٣ ــ ٨٣٣)دا کە بۆ ئەم مەبەستە دامەزراوەیەکی تایبەتی دامەزراندو بە (دار الحكمە) ناسرابوو، لەو کاتەوە شەپۆلێکی گەورەی وەرگێڕان دەستپێکرد کە گشت سەدەی نۆیەم و زۆربەی

---

375– مونتغمری واط: اثر الحضارة العربية على اوربا، ترجمة: جابر ابی جابر، مطبعة وزارة الثقافة و الارشاد القومی، دمشق-١٩٨١ .. ل ٣٤ و ل ٩٧-٩٧ .

سەدەی دەیەمیشی گرتەوە، بەجۆرێك سەرجەم بەرهەمە یۆنانییەکان وەرگێڕدران، ئەوانەی جێگەبایەخی عەرەب بوون.

ئەم دەسکەوتە زانستییە مەزنە، دەمانگەیەنێتە ئەو بڕوایە کە بڵێین: بێگومان کولتوری بیری عەرەبی کۆمەڵە فەیلەسوفێکی پێگەیاندوە کە دەکرێت لەریزبەندی گەورە فەیلەسوفانی جیهاندا تۆماربکرێن:

**فارابی** (٨٧٠ - ٩٥٠) رێگەی بۆ یۆنانییەکان خۆشکرد تا بەشێوەیەکی باشتر لەفەلسەفەکەیان تێبگەن، پاش ئەوەی ئەم بیرانە بەچەند تونێلێکی تاریکدا رۆشتن و لێرەو لەوێ پەرتەوازە بوبون، ئەم فەیلەسوفە هات وتوێژەکانی ئەفلاتۆنی خستە پاڵ یەکترو رێکی خستن و لەچوارچێوەیەکی یەکگرتوی کامڵدا دایڕشتنەوە، هەوڵێکی زۆریشی خستەگەڕ بەمەبەستی گونجاندنی ئەفلاتۆن لەگەڵ ئەرستۆداو لەپێناو ئەوەی لەفەلسەفەکانیاندا سەرباری جیاوازیی لەشێوازدا یەکەیەکی کامڵ دروستبکات، خۆیشی کردە ناوبەندێکی ئەو یەکخستنە، هەندێك لەبیرەکانی ئەرستۆی پەسەندکردوە، ئەگەرچی لەزۆر باردا زیاتر بەلای ئەفلاتۆندا دەیشکاندوە.[٣٧٦] فارابی

---

376- بڕوانە: الدكتور. عباس حلمى الحلى: أراء الفارابى فى الدولة و المجتمع الانسانى و التخطيط الاقتصادى،(الفارابى و الحضارة الانسانية) دار الحرية للطباعة و النشر. بغداد-١٩٧٦ .. ل ٤٨٠ .

بەمامۆستای دووەم ناسراوە، چونکە دانراوەکانی مامۆستای یەکەم (ئەرستۆ)ی راڤەکردوە.[377]

**ئیبن روشد** (١١٢٦ ـ ١١٩٨) لەپێشەوەی زۆرێك لەفەیلەسوفە هاوچەرخەکانی خۆیدایە لەنێویاندا ئیبن سینا، رێچکەیەکی فەلسەفی تایبەتی دانەناوە، بەڵام یەکەم راڤەکاری ئەرستۆو دیارترینیانە، بۆیە نازناوی دانتیٚ (راڤەکاری گەورە)ی پێبڕاوە.[378] ئیبن روشد بیروڕاکانی ئەرستۆی پاش چەندین سەدە لەهەمەچەشنەی هەژمونی ئەفلاتۆنی لەفەلسەفەی عەرەبیدا زیندوکردوە، بەکۆششی بیری خۆی هەستاوە بەیەکخستنی بیری لەنێوان لایەنە ئایینیەکان کە پێویستە رێگرێك لەبەردەم روانگەی رەچەڵەکدا دابنێت و لایەنە فەلسەفییەکان کە بەپێی بنچینەکەی تەنیا ملکەچی کۆتە لۆژیکییە تاکگەرا ئەبستراکتەکانە، ئەم پرۆسەیە.. بەتەنیا رێگەی بۆ وەرگرتنی کولتوری یۆنانی لەنەریتە کاتۆلیکییەکاندا خۆشکرد، ئەگەر هەوڵەکانی ئیبن روشدو ئیبن سینا نەبونایە" بوار بۆ قەشە تۆماس ئەکوینی نەدەڕەخسا نەریتەکانی یۆنانی دەست بکەوێت کە سەرچاوەی پەخشبونی راستەقینەی بیری سیاسی خۆرئاوایە، تا لەتونێلە تاریکەکانی چوار سەدەی رابردودا بیگوزەرێنێت و بەسەردەمی رۆشنگەریی بگەیەنێت.[379]

---

377– الدکتور. ناجی معروف: الفارابی و الحضارة الانسانیة: سەرچاوەی پێشوو.. ل ٤٧١ .

378– مونتغمری واط: سەرچاوەی پێشوو.. ل ٩٧ .

379– الدکتور. حامد ربیع: سەرچاوەی پێشوو.. ل ٢٠٥ .

وەك چۆن پێویستە ئاماژە بەكاریگەری **ئیبن سینا** (٩٨٠-١٠٣٧) و **غەزالی** (١٠٥٨ - ١١١١)یش بكرێت: فەلسەفەی ئەرستۆ بەئەندازەیەكی گەورە بەهۆی وەرگێڕانی بەرهەمەكانی ئیبن سیناو بەتایبەت راڤەكردنی لەسەر دانراوە میتافیزیكییەكانی ئەرستۆوە ئاسان بووە، بەكاریگەری غەزالی كە بەڵگەی ئەفلاتۆنییە نوێیەكانی عەرەبی خستوەتەڕو و بەتوندی رەخنەی ئاراستە كردوون، هەندێك لەپیاوانی ئایینی لۆژیكی ئەرستییان كردوەتە بنچینە بۆ میتۆدی زانستی لەلێكۆڵینەوەكانیاندا.[380]

بەهاتنە سەر دیاریكردنی بەشداریی عەرەبی ئیسلامی لەكولتوری بیری مرۆڤایەتیدا، ئەوەندە بەسە ئاماژە بەرەسەنایەتی ئەم كولتورە مەسەلەی بایەخ پێدانی لەلایەن شارستانیەتییەكانی خۆرئاواوە كردوەتە مەسەلەیەكی گەوهەری، لێرەدا جەخت لەسەر ئەو كاریگەرییە دەكەینەوە كە فەلسەفەی عەرەبی لەسەر فەلسەفەی سەردەمەكانی ناوەڕاست بەجێی هێشتوە، بەم پێیەش قەشە تۆماس ئەكوینی هەڵدەبژێرین وەك نمونەیەك كە راسترین گوزارشت لەم راستییە بكات.

فەلسەفەی ئەكوینی لەمیانەی بیرەكانی ئەرستییەوەو لەرێگەی ئیبن روشدەوە كۆمەڵێك زانیاریی لەلۆژیكی ئیسلامییەوە وەرگرتوە، دیارترینیان[381]:

---

380- بڕوانە: مونتغمری واط: سەرچاوەی پێشوو.. ل ١٣٨ .

381- بڕوانە: الدكتور. حامد ربیع: ابحاث فی النظریة السیاسیة: سەرچاوەی پێشوو.. ل ١٦٥-١٦٦ .

**یەك**: گرێدانی نێوان راستییە فەلسەفی‌و راستییە ئایینیەکان، نەك لەسەر بنەمای جیاوازیی‌و ململانێی نێوانیان، بەڵکو لەسەر بنەمای تێکەڵکردن لەگەڵ داننانی راشکاوانە بەوەی کە ناکرێت جیاوازییەکە لەسەر حسابی عەقڵ و بەڵگە بێت، بەمشێوە لۆژیکی زانستی بۆ یەکەمجار چووە ناو نەریتە خۆرئاواییەکان.

**دوو**: تەماشاکردنی دەوڵەت بەوەی کە پێکهاتەیەکی سروشتییە و پەرەسەندنی کۆمەڵایەتی دەیسەپێنێت و بەمەش پێش ئایینەکان هەبوە، سەربەخۆیی شارستانی‌و مێژویی هەیە بەبێ ئەوەی پێچەوانە بێت لەگەڵ پەرەسەندنەکانی دواترداو لەنێوانیاندا ئایینیەکان یان رەتیان بکاتەوە، وێناکردنێکی نوێیە بیری مەسیحی بۆی نەدەلوا بەپشت بەستن ئامۆژگارییەکانی کڵێسا پێی بگات، ئیبن روشدە کە لەرێگەیەوە ئەلبێرتی گەورە (١٢٠٦ ــ ١٢٤٠) و دوای ئەویش ئەکوینی ئاشنای فەلسەفەی یۆنانی‌و فەلسەفەی یۆنانی ببن.

**سێ**: هەروەها، لێرەدا بابەتی گرنگیی کولتوری ئیسلامیی دەردەکەوێت، میتۆدیی بونی قەشە تۆماس ئەکوینی‌و دوای ئەویش فەلسەفەی سەردەمی ناوەڕاست لەمیانەی هەردوو سەدەی سیانزەیەم و چواردەیەم لەسەر بنەمای یەکخستنی نێوان ئەرستۆو ئەفلاتۆن بونیادنراوە، پێش ئەم مێژووە داننانێك بەو ناتەبایەی نێوانیاندا هەبوە: ئەندێشمەندی ئەفلاتۆن لەلایەك و واقعیبونی ئەرستۆ لەلایەکی دیکەوە تا ئەو کاتانەی بیری سیاسی ئیسلامی هات و بەهۆی فارابی‌و دوای ئەویش ئیبن سیناو ئیبن روشدەوە ئەو گونجاندنە هاتە ئاراوە کە بواری بۆ شارستانییەتی کاتۆلیکی رەخساند کولتوریی یۆنانی وەربگرێت بەبێ ئەوەی هیچ پێچەوانەیی یان ناکۆکییەك لەنێوانیداو لەنێوان ئایینەکەدا ببینێتەوە.

ئەم راستییانە کاریگەریی ئەکتیڤیان هەبووە زۆرێک لەبیریارە بەویژدانەکانی خۆرئاوای گەیاندوەتە ئەو بڕوایەی کە بیری عەرەبی ماددەیەکی نوێی پێشکەش بەئەورپاییەکان کردوەو سەرباری ئاسۆ فراوانەکانی جیهانێکی کاملّی نوێی لەبەردەمدا کردونەتەوە.. لەتێکڕای پێشکەوتنەکانی دواتر فەلسەفەی ئەورپا بەئەندازەیەکی گەورە قەرزاریی نوسەرانی عەرەبە.[٣٨٢]

بیریاران و بەهەمانشێوە زانایانی عەرەبی موسڵمان کۆمەڵە بیرو تیۆرکی سیاسی ئەوتۆیان پێشکەش کردوە کە بەڵگەیە نەک تەنیا لەسەر ئەو قوڵیو رەسەنایەتییەی کە پێی دەناسرێنەوە، بەڵکو لەسەر مەودای داهێنانە بیریو کاریگەرییە مرۆڤایەتییەکەیان بەدرێژایی سەردەمەکان، بیرۆکەی کۆمەڵگەی جیهانیو بیرۆکەی دادوەریی،[٣٨٣]..و تیۆری دەست هەڵگرتن لەمافەکانی، فارابی و تیۆری پەرەسەندنی غەزالیو تیۆری جێنشینیو تیۆری ئاوەدانی ئیبن خەلدون، بەسە بەنمونە بهێنرێنەوە.[٣٨٤]

---

382– مونتغمری واط: سەرچاوەی پێشوو.. ل ١٤٠-١٤١ .

383– فارابی لەمیانەی پێناسەکردنی دادوەریی‌دا ئاماژە بەرێزگرتنی پارەو کەلوپەلە ماددییەکان دەکات و نمونەی ئەم تێزە لەلای مامۆستای دووەم تێزێکی نوێیە پاش هەشت سەدە ئنجا لەلای هێگڵ تێبینی دەکەین کە پێیوایە ژیانی سیاسی لەجیاکردنەوەی ئەوانەی هی منن و ئەوانەی هی تۆن سەرچاوە دەگرێت.. ئەو ئەخلاقەی سەرۆکی ئایدیالستە خۆرئاواییەکان بانگەشەی بۆ دەکات، ئەوەیە تاک خواستەکانی بخاتەژێر رکێفی (گشت)ەوە لەسەر ئەوەی دان بەچەند مەرجێکیدا بنرێت لەوانە: خاوەنداریێتی.. بڕوانە: الدکتور. ولید فستق: السیاسة فی الفلسفة الاسلامیة: الفکر السیاسی عند الفارابی، الفکر العربی المعاصر، العدد (١٤-١٥).. ل ١١٢.

384– الدکتور. فاضل زکی محمد: سەرچاوەی پێشوو.. ل ١٤٥ و ل ٢٧٨ .

## بەشی هەشتەم

# پەرەسەندنی
# ململانێی کڵێساو دەوڵەت

سەردەمی ناوەڕاست لەسەدەی سیانزەیەمدا گەیشتە چڵەپۆپەی خۆی، ئەو بەشانەی کۆدەبونەوە بۆ ئەوەی یەکەیەکی‌کامڵ پێك بهێنن هاوکات لەگەڵ روخانی ئیمپراتۆرییەتی رۆمادا گەیشتە ئەو قوناغەی کامڵبون کە دەکرا پێی بگات، تا ئەو کاتەی سەدەی چواردەیەم هات، پاش ئەمە لەگەڵ خۆیدا داڕوخانی سێستم و فەلسەفەکانی هێنا، بەڵام سەدەی پانزەیەم سەرەتای کۆمەڵە سێستم و فەلسەفەیەك دەست پێدەکات کە ئێمە تاکو ئەمڕۆش بەسێستم و فەلسەفەی نوێی دەزانین، ناودارانی سەدەی سیانزەهەم بەئەندازەیەکی گەورە ناوبانگیان دەرکردبو: ئانوسنتی سێیەم، قەشە فرانسیس، فردریکی دووەم، سان برنارد، جون سالسبوری، تۆماس ئەکوینی.. ئەوەی لێرەدا بەلای ئێمەوە بەشێوەیەکی راستەوخۆ گرنگە ئەو فەلسەفەیە کە ئەم سیانەی دوایی پێشکەشیان کردوە لەگەڵ لێکۆڵینەوەی ئەو بیرانەی دانتیٚ خستونیەتەڕو، کە وەك ئاماژەیەك بۆ چونە نێو قۆناغێکی مێژویی نویٚ دیارترین سیماکانی ئەو بیرانەیە کە هەریەك لەمارسیلیۆس باد و ویلیەم ئۆکام پێشکەشیان کردوە.

بەندی یەکەم

# بانگەشەکانی دیاریکردنی دەسڵاتی کڵێساو

# نمونەکانی سەرەتای بەرتەسکبونەوەی

لەچوارچێوەی ئەم ئەنگیزانەدا بیروڕای هەریەك لەسان برنارد و جۆن سالسبوریو تۆماس ئەکوینی دەخەینەڕو لەگەڵ یەجیری دانتی.

## یەکەم: سانت برنارد و جۆن سالسبوری[385]

سانت برنارد بەوی گوزارشتی لەو شەپۆلەی بیری سیاسی ئایینییە دەکرد کە چەندین سەدە دەبوو بەدوای دارشتنەکەیدا دەگەڕا، تیۆری دوو شمشێر بەهۆی ئەم کەسایەتییەوە بووە بەشێوەیەکی زۆر رونبووەوە، توانی لەکتێبەکەیدا بەناونیشانی

---

385– سانت برنارد لەماوەی نێوان ١٠٩١-١١٥٣ دا ژیاوەو رابەری بزوتنەوەیەکی سۆفیگەرانەیە کە لەرێبازی ئەسکۆلایی لایداوە، باوکی جەنگاوەر بووە لەشەرە یەکەمەکانی خاچپەرستاندا کوژراوەو ساڵی ١١١٥ بوەتە سەرۆکی کلێسای کلیرفۆ، لەسیاسەتی کلێسادا خاوەن کاریگەریی زۆر بەهێز بووە، سانت برناردو لایەنگرانی راستییەکی ئایینیان ئاشناکرد بەمەبەستی راگەیاندنی رێبازێك بۆ بەلگەهێنانەوەی عەقڵانی لەئەزمونی زاتیو تێرامانەدا، بەڵام جۆن سالسەبوری گەورەترین نوێنەری تێروانینەکانی کلێسایە، سالسەبوری فەیلەسوفی ئینگلتەرایی لەنێوان ساڵەکانی (١١٢٠-١١٨٠) ژیاوە.. ئەمینی نهێنی سیان لەسەرۆکەکانی ئەساقیفەی کانتەربری بووەو لەکۆتاییەکانی ژیانیدا بەئەسقوفی(شارتەر) دامەزرا.. پیاوێکە ئاوەزی گومانگەراکانی هەیە کاتێك کاروبارەکانی بیروباوەڕی ئایینی دورخستوەتەوە، سیفەتی (ئەکادیمی) دەداتە پاڵ خۆی و رێزگرتنی لەپاشاکان زیادەڕوی تێدا نەبووە (پاشا ئەزانە، کارێکی تاج لەسەرە).. بڕوانە: برتراند راسل: سەرچاوەی پێشوو.. ل ٢١٤-٢١٥ .

دایبڕێژێتـــــەوە بەشـــــێوەیەك Libre de ansiderationne پێگەیـــەکی گـــەورەی لـــەناو کۆمەڵـــدا بەدەســـت بهێنێـــت: هـــەردوو شمشـــێرەکە" ڕۆحـــیو مـــاددی هـــەردوکیان بـــۆ کڵێســـا دەگەڕێنـــەوە، ئەوەنـــدە نـــەبێت شمشـــێری مـــاددی دەبێـــت لەپێناویـــدا لـــەکیلان دەربهێنرێـت لەکاتێکـدا شمشـێری ڕۆحـی کڵێسـا خـۆی لەکیلانەکـە دەریـدەکات، ئەمـــەش بـــەواتای ئـــەوەی کـــە یـــەکێك لەشمشـــێرەکان بەدەســـت پیـــاوی کڵێســـاوەیە و ئـــەویتریان ئەگەرچـــی لـــەژێرڕکێفی ئیمپراتۆردایە بەڵام بەفەرمانی ئەو رادەکێشرێت.[٣٨٦]

**ئانۆسـنتی سـێیەم پـەیڕەوی لـەم بـیرە کـردوە کـە بێگومـان لەبەرژەوەنـدی کڵێسایە**

**( ئازادیی پیاوانی کڵێسا ڕێزی لێناگیرێت، ئەگـەر کڵێسـای ڕۆمـانی وەك چۆن بەتەواوەتی دەسڵاتی بەسەر لایەنە ڕۆحییەکانـدا سـەپاندوە، بەهەمانشـێوە بەسـەر لایەنـە زەمینەکانیشـیدا نەسـەپێنێت.. وەك چـۆن مـانگ ڕوناکییەکـەی لەخۆرەوە وەردەگرێت و لەقەبارەشـدا لـەو بچـوکترە.. بەهەمانشـێوە دەسـڵاتی پاشایەتی پێگەکەی لەدەسڵاتی پاپاوە دەردەگرێت ).[٣٨٧]**

بەهەمان ئاراستە بیرەکانی جۆن سالسبوری هەنگاو هەڵدەگرێت، بـەجۆرێك بانگەشـەی بۆ باڵـابونی هێـزی ڕۆحـی کـردوە بەسـەر هێـزی زەمەنیدا، بۆیە لایـەنگری کڵێسا بوەو بەزمانی کڵێسا قسەی کردوەو بـــەرگری لێکـــردوە، لەکاتێکـــدا هێرشـــی کردوەتـــە ســـەر دەســـڵاتی زەمـــەنیو بەپاشـــکۆی دەســـڵاتی ڕۆحـــی دانـــاوە: هـــەردوو شمشـــێر (ڕۆحـی و مـاددی) سـەر بەکڵێسـان ولێـوەی سەرچـاوە دەگـرن و بـۆی

---

386– جان توشار: سەرچاوەی پێشوو.. ل ١٥٦ .

387– هەمان سەرچاوەی پێشوو.. ل ١٥٧ .

دەگرێنەوە، پاشا شمشێرەکەی (واتە دەسڵاتەکەی) لەکڵێسا وەردەگرێت و ئەمەی دوایین لەتوانایدایە ئەو شمشێرەی لەدەست وەربگرێتەوە (واتە لێسەندنەوەی دەسڵاتەکەی) ئەگەر لەرێساکانی یاسایی خودایی دەرچوو. لەو روانگەوە ئەوەی مافی بەخشینی دەسڵاتی هەبێت، بەهەمانشێوە مافی وەرگرتنەوەیشی دەبێت.[388]

بۆ دوپاتکردنەوەی ئەم بابەتە سالسبوری ڕاڕا نابێت لەوەی کە بڵێت" دەسڵاتی دنیایی پێویستە بکەوێتە ژێرڕکێفی خوداو ئەوانەشی کە راسپاردەو ئامۆژگارییەکانی جێبەجێدەکەن و نوێنەری ئەون لەسەر زەویی، فەرمانڕەوا ئەگەر شتێکی جێگەی ئاماژە نییە ئەگەر بەتەواوی ملکەچی ئامۆژگارییەکانی کڵێسا نەبێت، بۆ سەلماندنی ئەم بیرۆکە سالسبوری بەراوردێکمان پێشکەشدەکات لەنێوان جەستەی سیاسیو جەستەی مرۆڤدا، یەکەمجار جەستەی سیاسی بەجەستەی مرۆڤ دەچوێنێت کە کاراییەکەی پەیوەستە بەباری ئەندامە پێکهێنەرەکانیو گونجاندنی نێوانیان، ئنجا بەراوردی نێوانیان دەکات، بەلای سالسبورییەوە (پێ)یەکان بەرامبەر بەکرێکارو جوتیاران و دەستەکان بەرامبەر بەسوپاو گەدە هەمیشە ئارەزوی تێربون دەکات تا قورسبونی هەرسکردن و بڵاوبونەوەی تێکچون لەگشت بەشەکانی تری لەشدا ـ بەرامبەر بەبەڕیوەبردنی داراییو سەریش بەرامبەر بەپاشا دەوەستێتەوە و دڵیش بریتییە لە(ئەنجومەنی نوێنەران)، واتە ئەفسەرو راوێژکاران و ئەوانەی لەدەوروبەری ئەوانن، بەڵام رۆح بریتییە لەئایین کە پێویستە سروش

---

388– الدكتور.علي عبدالمعطي محمد: سەرچاوەی پێشوو.. ل ١٤٦ .

بۆ جوڵەی ئەندامەکانی جەستەی سیاسی دەربکات و هەروەها ئەو پیاوە ئایینییە کە پاشا لەسەریەتی شوێن بیروڕاکانی بکەوێت.[389]

جۆن سالسبوری ئاماژەی بەکۆمەڵێك بیروڕا کردوە کە بەتێکڕا خزمەت بەو ئامانجە دەکات کە لەفەلسەفە سیاسیەکەیدا کاری لەسەرکردوە، دەکرێت ئامانجی ئەم بیروڕایانە بەمشێوە پوختبکرێتەوە[390]..:

١. ڕێکخستنی دەوڵەت پێویستە بەگوێرەی شێوەی کڵێسا دابمەزرێت کە داوای لێکراوە لەگەڵیدا یەکبگرێت لەپێناو فەرمانڕەوایی جیهان و لەپێناو دەربازکردنی مرۆڤەکان.

٢. ئەرکی سەرەکیی سیاسەتوان بریتییە لەگەشەپێدانی گیانی لێپرسراوێتی لەلای پاشاو راوێژکارەکانیو فەرمانڕەوا زەمنییەکان پێش هەر شتێك ئامرازی چاودێری خودایین، ئەگەر هەڵەی یەکەم نەبوایەو خەڵکی بەبێ هەڵەکردن بژینایە، بێکەڵك دەبون.

٣. بیرباری سیاسی دەبێت تەنیا بەوە واز نەهێنێت فەرمانڕەوایی میسالی پەسنبکات و ڕێسا ئەخلاقییەکانی دەسڵاتی زەمەنی بخاتەڕو، بەڵکو سەرباری ئەمەش لەسەریەتی حساب بۆ گریمانەی دروستبونی فەرمانڕەواییەکی چەوسێنەری بێزراو بکات.. ئەگەر پاشاکان دادوەر بون، پاشا شەرعییەکان وێناکردنێکی تەندروستیان

---

389– جان تۆشار: سەرچاوەی پێشوو.. ل ١٤٤ .

390– بڕوانە: هەمان سەرچاوەی پێشوو.. ل ١٤٥ . لەگەڵ: الدکتور. علی عبدالمعطی محمد: سەرچاوەی پێشوو.. ل ١٤٢-١٤٧ .

بـۆ پۆسـتەکانیان هەیـەو ئـەم وێناکردنـە دەخەنـە خانـەی جێبەجێکردنـەوە بـەجۆرێك پێویسـتە گوێڕایـەڵیان بـین، ئەمـە بـەو مانایـە نییـە دەسڵات قۆرخ بکرێـت، سالسبوری نـەك هـەر تەنیا ڕێگە بەکوشتنی فەرمانڕەوای سەرکوتکار دەدات، بـەڵکو بەبەشـێك لـەدادوەریی‌و کوشتنیشـی بەپێویسـت دەزانێـت، بێگومـان ئـەم بیروبۆچـونە ئاماژەیـەکی ڕاشکاوانەیە بـەمافی شۆڕشـکردن لـەدژی سـەرکوتکاران، هـەروەها بیربۆچـونێکە دیـارترین بیریارەکـانی سـەردەمی نـوێ وەریـانگرتوەو تێهەڵکێشی تیۆرکانیان کردوە.

٤. جیاوازییـەکی ئاشکرا لـەنێوان پاشـاو سەرکوتکاراندا هەیـە، پاشـا لەبەرژەوەنـدی ژێردەسـتەکانی فـەرمانڕەوایی دەکـات، بەڵام سەرکوتکار تـەنیا لەبەرژەوەندی خۆی دەیکات و، پاشا بەگوێرەی یاسا فەرمانڕەوایی دەکات، لەکاتێکدا سەرکوتکار بـەگوێرەی یاسـای دارسـتان فـەرمانڕەوایی دەکـات، واتـە کوێرانەو بەزەبری چەك.. جێگەی ئاماژەیە چەمکی یاسا لای سالسبوری دەگەڕێتەوە بۆ یاسای خوادایی کە گشت یاسا دانراوەکانی لێوە وەرگیراوە، لەم بوارەدا جۆن جەخت لەسەر ئەوە دەکاتە کە دەبێت پاشاکان یاسای خودا بزانن.. ئەگەر خوا نەکردان نەخوێندەوار بون، دەبێت داوا لـەپیاوانی کڵێسا بکەن بەسەریاندا بیخوێننەوە.[٣٩١]

391– جان توشار: سەرچاوەی پێشوو.. ل ١٤٥ .

## دووەم: **تۆماس ئەکوینی**

تۆماس ئەکوینی،[٣٩٢].. بەگەورەترین فەیلەسوفی سەدەی سیانزەیەم دادەنرێت، فەلسەفەکە کە لەسەر بنەمای یەکخستنی نێوان عەقڵ و باوەڕ دامەزراوە،[٣٩٣].. لەگشت پەیمانگا فێرکارییە کاتۆلیکییەکاندا دەوترێتەوە، ئەوانەی فەلسەفیان تێدا دەخوێنرێت، بەپێودانگی ئەوەی تەنیا فەلسەفەی تەندروستەو ئەمە لەو کاتانەوە دەست پێدەکات کە تیایدا لیوی سیانزەیەم فەرمانێکی لەوبارەوە ساڵی ١١٧٣ دەرکرد، سەرەڕای ئەمەش بایەخی ئەکوینی تەنیا لەسەر لایەنی مێژویی کورتنابێتەوە، بەڵکو لەبەرئەوەیە کە

---

392– تۆماس ئەکوینی ساڵی ١٣٢٤ لەیەکێک لەقەڵاکانی ئیتاڵیای ناوەڕاست و لەخانەوادەیەکی خانەدان لەدایک بووە کە هەر لەتەمەنی پانزە ساڵییەوە ناردویەتی بۆ کڵێسەی (مۆنتی کاسینۆ)و لەم کڵێساوە پەیوەندیکردوە بەزانکۆی ناپۆلی و دایەپاڵ راهیبەکانی دۆمینیکان و لەسەر دەستی ئەلبێرتی گەورە لەکۆلۆنیاو پاریس خوێندویەتی و دەرچووەو بۆ دوو ماوە کە نۆ ساڵی خایاندوە بەسیفەتی مامۆستا ئامادە بووە کە تیایدا بەراوێژکاری عەرشی پاپا دامەزرا، دەوڵەمەندێکی خاوەن بڕیار بوو، هێمن و بێفیز بوو، بەم هۆیەوە بووە جێگەی خۆشەویستی خەڵکی، تەنانەت رکابەرەکانیشی.. لیستی دانراوەکانی نەوەدو هەشت کتێب لەخۆدەگرێت لەدیارترینیان: (بەڵگە لەسەر بێباوەڕان) و (بەڵگەی لۆژیکی).. بڕوانە: الموسوعة الفلسفية : سەرچاوەی پێشوو.. ٦٢ . ئەمەش بەراورد بکە لەگەڵ: يوسف كرم: سەرچاوەی پێشوو.. ل ١٥٢-١٥٣ .

393– ئەکوینی پێگەی باوەڕو مەعریفەی بەرزکردوەتەوە کاتێک سەرچاوەکەی گەڕاندوەتەوە بۆ خوداو بەمەش نادروستی ململانێی نێوانیانی سەلماندوە، لەبەرئەوەی هەردوکیان دوو میتۆدن یەکتریی تەواو دەکەن لەپێناو ناسینی خوداو جیهان، باوەڕ لەگەڵ عەقڵ پێچەوانە نایەتەوە بەڵام لەسەروی عەقڵەوەیەو ئەنجامەکانی باوەڕ لەڕوی دڵنیاییو یەقینەوە لەئاستێکی خواتردا نین، ئەمەش بەهۆی ئەوەی باوەڕ پشت بەسروشی راستەخۆ لەلایەن خوداوە دەبەستێت کە بەتەواوی لەسەرچاوەی راستییەوە نزیکی دەکاتەوە زیاتر لەفەلسەفەو پایەکانی کە بەرهەمی زیرەکی مرۆڤن بەتەنیا.. بڕوانە: الدكتور. حامد ربيع: محاضرات في الفكر السياسي: سەرچاوەی پێشوو.. ل ٦٤ .

کاریگەرییەکی زیندوی هەیە وەك ئەفلاتۆن و ئەرستۆو کانت و هێگڵ، بەڵکو ئەم لەوانیتر کاریگەرتر بوە، لەزۆربەی بابەتەکاندا بیروڕاکانی ئەرستۆی وەرگرتوە بەڵام بەئامانەتەوە، تەنانەت (الاستاجیری) بووە دانسقەی نێو کاتۆلیك و یەکێك لەپاپاکانی یان خەریك بو دەبوو.. بەلایانەوە رەخنەگرتن لەبابەتە فەلسەفە هاوتا بووە لەگەڵ کفرکردن لەئاییندا، بەڵام هەمیشە ئەمە راست دەر نەدەچوو، ئەو شەڕەی بۆ بەرگریی لەئەرستۆ لەسەردەمی لاکوینیدا بەرپا بوبوو، بەسەرکەوتنێکی یەکلاکەرەوە کۆتایی نەدەهات تا ئەو کاتەی ئەکوینی هات و (ئەرستۆ) سەرکەوتنێکی بۆ بەدەستهێنا کە تاکو سەردەمی رۆشنگەری بەردەوامی هەبو.[394]

بەڵام ئایا بنەما گشتییەکانی ناوەڕۆکی فەلسەفەی سیاسی ئەکوینی چییە؟.. چارەسەرە سیاسییەکانی تۆماس ئەکوینی لەبنەڕەتدا جەختی لەسەر رونکردنەوەی مانای دەوڵەت و کۆمەڵگاو سێستمەکانی فەرمانڕەوایی‌و پەیوەندی دەوڵەت بەکڵێساوە دەکاتەوەو هەروەها سروشتی یاسایش روندەکاتەوە، یەك لەدوای یەك ئەم بابەتانە دەخەینەڕو:

## یەك: دەوڵەت و کۆمەڵگە

قەشە تۆماس ئەکوینی دان بەرەوایەتی دەوڵەتدا دەنێت ئەوە رەتدەکاتەوە وەك ئۆگوستین تایبەتمەندی هەڵەکردن بداتە پاڵی.. بەو شێوەیە تەماشای جیهان دەکات کە سێستمێکی پلەبەپلە بەرەو بەرزی‌یە کە بەرزترین پلە تیایدا خواوەندە، بەڵام ئەم سێستمی پلە بەپلە بەرەو بەرزییە تەنیا بریتی نییە

---

394– بڕوانە: برتراند راسل: سەرچاوەی پێشوو.. لا ٣٣٢ .

لەسیستەمی ئاینی، بەڵکو هاوشان ئەو یاسادارشتنەش لەخۆدەگرێت کە لەسروشتی مرۆڤەوە هەڵقوڵاوەو ئەم یاسادارشتنە بونی خۆی لەخواستی مرۆڤەوە وەردەگرێت، بەمشێوە پەیوەندی نێوان شاری خواوەندیو شاری سەرزەویی پەیوەندی دژایەتی و جیاوازیی نییە، بەڵکو پەیوەندی ئیحتیواو لەخۆگرتنە.[٣٩٥]

بیرۆکەی دەوڵەت و بنەماکانی لەبنەرەتدا پەیوەستە بەئەنگێزەی هەڵچونی کۆمەڵایەتی مرۆڤەوە: مرۆڤ بەسروشتی خۆی بونەوەرێکی کۆمەڵایەتییەو لەچوارچێوەی کۆمەڵدا نەبێت ناتوانێت بژیو ئنجا دامەزراندنی دەوڵەت دەبێتە روداوێکی سروشتی کە سروشتی ژیانی مرۆڤایەتی دەیخوازێت و خۆی لەرێکخستنی ئازادانەی تاکەکەسەکاندا دەبینێتەوە لەپێناو بەدیهێنانی ئامانجە تاکەکەسەکان بەبەختەوەریی.

بەپێی ئەمە دەسڵات دێتەئاراوە بەپێودانگی ئەوەی هۆی بەدیهاتنی (لەچوارچێوەی دەوڵەتدا) بەرژەوەندی گشتییە یان ئامانجی هاوبەشی تاکەکەسەکان، دەسڵات پێداویستییەکی کۆمەڵایەتییە لەگەڵ بونی کۆمەڵایەتیدا پەیدادەبێت لەپێناو مەبەستەکانی مرۆڤدا بۆ گەیشتن بەفەزیلە، لەگەڵ ئەوەی سەرچاوەی ئەم دەسڵاتە نییە، بەڵکو سەرچاوەی لەخوداوەیە.[٣٩٦]

---

395- بروانە: الدكتور. حامد ربيع: ابحاث فى النظرية السياسية: سەرچاوەی پێشوو.. لا ١٦٣ .

396- بروانە: الدكتور. فؤاد العطار: النظم السياسية و القانونية الدستوری، دار النهضة العربية، القاهرة-١٩٦٤ .. لا ١١٢ .

**ئەکوینی وێنای ئەم لایەنە بەمشێوە دەکات**

ئەگەر کۆبونەوە مەسەلەیەك بێت سروشت سەپاندبێتیو ژیان لەکۆمەڵگەدا پێویستی بەبونی دەسەڵاتێکی ڕێکخەر هەبێت و لەکاتێکدا خودا دروستکاری ئەم گەردونەو بەڕیوەبەر بێت، کەواتە سەرچاوەی دەسەڵات لەخوداوەیە، بەڵام ئەگەر خودا سەرچاوەی دەسەڵات بێت؟، ئەوا شێوەکانی و ئاڵوگۆڕپێکردنی بۆ تاکەکەسەکان دەگەڕێتەوە.[397]

بێگومان ئەم تێزە بیرییە مافی تاکەکەس لەبەخشینی دەسەڵات بەفەرمانڕەوا لەخۆدەگرێت و هەروەها توانای لەوەرگرتنەوەی ئەو دەسەڵاتەدا ئەگەر فەرمانڕەوا بەچاکی بەکاری نەهێنا.

لەکاتی باسکردن لەبیرۆکەی کۆمەڵگە ئەکوینی سەرەتا وێنەیەکی دیاریکراوی سروشتی پێشکەش دەکات کە تەواو گونجاوە لەگەڵ بیروڕاکانی لەبارەی مەعریفەوە: گەردون بەلایەوە گوزارشتە لەسیستمێکی ڕێکوپێك لەچەندین پلە دروست دەبێت لەسەرەوە بەخودا دەست پێدەکات و بەنزمترین دروستکراوەکان کۆتایی دێت و هەر بونەوەرێك لەناویدا بەپاڵنەرێکی ناوەکی کە لەسروشتی خۆیەوە وەریدەگرێت کار لەسەر ڕێگەی چاکەو کامڵبونی تویژەکەی خۆی دەکات، هەمو هەوڵێکی دەخاتەگەڕ لەپێناو گرتنی پێگەی خۆی لەم سێستمە پلەدارەدا بەپێی ئەو پلەی کامڵبونەی کە پێی گەیشتوە، لەگشت بارەکاندا بەرزتر دەسەڵاتی بەسەر ئەوەی

---

397– الدكتور. نزار الطبقجلی: سەرچاوەی پێشوو.. ل ١٨٨ . هەروەها: الدكتور. عبدالكريم احمد، دراسات فی النظرية السياسية الحديثة، معهد البحوث و الدراسات العربية، القاهرة-١٩٧٣ .. ل ٣٢ .

خوارتردا دەشكێت و سودی لێوەردەگرێت و هەر بونەوەرێك چەند بێبەهایش بێت گرنگی خۆی هەیە، پێگەی هەیە، ئەركی لەسەرشانەو مافی هەیە لەرێگەیەوە بەشدار دەبێت لەبونیاتی كۆمەڵ و گەیشتن بەكامڵبون.

ناوەڕۆكی ئەو پلانە خۆی لەمەبەستەكەیدا دەبینێتەوە، واتە بەكاربردنی هەموان لەپێناو گەیشتن بەئامانجێكی دیاریكراو، لەم سیچستمەدا سروشتی مرۆیی دەبێتە ناوەندێكی دانسقە لەنێو گشت بونەوەرەكانی تردا، نەك تەنیا لەبەرئەوەی مرۆڤ خاوەنی جەستەیەو بەس، بەڵكو لەبەرئەوەی عەقڵ و رۆحی هەیە كە بەهۆیانەوە لەگشت بونەوەرەكانی تر لەخودا نزیكی كردوەتەوەو تەنیا بونەوەرێكە كە لەیەككاتدا جەستەو رۆحی هەبێت، ئەو سێستم و یاسایانەی كە كۆنترۆڵی ژیان و ئاراستەی دەكەن جەخت لەسەر ئەم راستییە بنچینەییە دەكاتەوە.[٣٩٨]

ئنجا ئەكوینی دێتە سەر باسی كۆمەڵگەو لەو بڕوادایە كۆمەڵگە وەك سروشتە كۆمەڵە ئامانج و مەبەستێكی هەیە كە دەخوازێت خوارتر خزمەتی سەروی خۆی بكات و گوێڕایەڵی بێت لەكاتێكدا سەروتر دەبێت هاوكاریی خوارتر لەخوی بكات، تۆماس ئەكوینی شوێن پێی ئەرستۆی هەڵگرتوەو كۆمەڵگای وەسفكردوە بەوەی كە ئاڵوگۆڕكردنی خزمەت و بەرژەوەندییە بەمەبەستی گەیشتن بەژیانێكی بەختەوەر، بەهرەو پیشەی زۆر بەشداریی لەپێكهێنانیدا دەكەن: كەشتیارو پیشەساز پێداویستییە مادییەكانی كۆمەڵگە دابیندەكەن و قەشەكانیش بەنوێژو بەبەجێهێنانی سروتە ئایینیەكان

398– بڕوانە: سباین: سەرچاوەی پێشوو.. ل ٣٥١-٣٥٢ .

بەشدار دەبن، وەك چۆن هەر گروپێك بەو كارە هەڵدەستێت كە بەباشی فێریبووەو دەیزانێت، بەرژەوەندی گشتی كۆمەڵگە وا دەخوازێت ئەم سیستەمە دەستەیەكی فەرمانڕەوایی هەبێت كارەكانی بەڕیوەبەرێت وەك چۆن رۆح رێنوێنی جەستە دەكات.[399]

## دوو: سیستەمەكانی فەرمانڕەوایی

تۆماس ئەكوینی بەتوندی دژایەتی ئەو رۆشنبیرە مسیحیانە دەكات كە ئارەزوی دەكەن پیاوانی كڵێسا رۆڵی پارێزەرانی ئەفلاتۆنی بگێڕن لەئەو كۆمەڵگەدا كە فەیلەسوفان فەرمانڕەوایی دەكەن، ئەكوینی هاوشێوەی ئەرستۆ چارەی ئەم خەونە تۆباوییانەی ناوێت، بڕوای بەو شتە - سروشتییە - هەیە بەو پێیەی لەمێژودا جێبەجێكراوە، سەرباری ئەمەش هاوكات لەگەڵ رەتكردنەوەی تیۆری گرێبەندی كۆمەڵایەتی جەخت لەسەر رەگەزی رێكەوتن هەیە لەدەستوریی كرداریی كۆمەڵگەی دادپەروەردا: یاسا، یەكەم و پێش هەموو شتێك فەرمانی بەچاكەی گشتی كردوەو فەرمانكردن بەچاكەی گشتی لەسەر كۆمەڵگە كورتدەبێتەوە یان ئەو كەسەی كە نوێنەرایەتی ئەو گشتە دەكات.[400]

ئەمە بەو مانایە نایەت كە تۆماس ئەكوینی ئارەزویی سیستمی دیموكراسی كردوە، بەوشێوە نەبوە، بەڵكو لەو بڕوادا بوە كە باشترین شاری زەمەنی ئەو شارەیە كە لەسەر شێوازیی ئاسمانی

---

399- هەمان سەرچاوەی پێشوو.. ٣٥٢-٣٥٣ .

400- موریس كرانستون: اعلام الفكر السیاسی، ترجمة: دار النهار للنشر، بیروت- ١٩٨١ .. ل ٣٦-٣٧ .

دروستبوه، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا لەبانگەشەکەیدا بەپێویستی زانیوە کە فەرمانڕەوایی لەسەر ڕێساکانی ڕێکەوتن و گونجان دابمەزرێت.

لەم ڕوانگەدا شوێن پێی ئەرستۆ هەڵدەگرێت سیستەمەکانی فەرمانڕەوایی دابەشدەکات بۆ سیستمێکی چاك کە تیایدا هەمیشە فەرمانڕەوا ڕەچاوی بەرژەوەندییەکانی ژێردەستە دەکات (سیستەمەکانی فەرمانڕەوایی پاشایەتیو ئەرستۆکراتیو دیموکراسی لەخۆدەگرێت)و سیستمێکی گەندەڵ کاتێك فەرمانڕەوایان بێجگە لەبەرژەوەندی تایبەتی خۆیان ڕەچاوی هیچ ناکەن ـ سیستەمەکانی فەرمانڕەوایی سەرکوتکارییو ئۆلیگارشییەو ئاژاوەچی لەخۆدەگرێت ـ بەڵام لەکاتێکدا ئەرستۆ ڕاڕایە لەوەرگرتنی لەپلەی باڵادا سیستمی پاشایەتیدا مەگەر لەسایەی مەرجگەلێکی دیاریکراودا، تۆماس ئەکوینی بەبێ هیچ کۆت و مەرجێك بەچاکتری داناوە.

ئەکوینی چاکەدانی سیستمی پاشایەتی بەسەر سیستەمەکانی تردا دەسەلمێنێت بەوەی کە ئەرستۆکراتییەت لەدانایدا لەپێش دیموکراسییەوەیەو پاشایەتی یان حکومەتی تاکەکەسی چاك لەئەرستۆکراتییەت باشترەو یەکسانە لەگەڵ سروشتدا، لەبەرئەوەی تێبینی دەکەین سروشت بەشێوەیەك دروستبوە کە یەك پرەنسیپ بۆ گشت شتەکان دادەڕێژێت: دەرون جەستە بەڕیوەدەبات، باوك خێزان بەڕێوەدەبات و جیهانیش لەلایەن خوداوە بەڕێوەدەبرێت، بەهەمانشێوە دەبێت دەوڵەتیش تاکەکەسێك هەبێت بەڕێوەی بەرێت.[401]

401- الدكتور. علي عبدالمعطي محمد: سەرچاوەی پێشوو.. ل ١٥٠ .

ئەکوینی پرەنسیپی هەڵبژاردنی فەرمانڕەوا پەسەند دەکات: پاشایەتی هەڵبژاردنیی دەبێت لەسەر ئەو بنەمایەی پاشا هاوکاری ئەنجومەنی ئەرستۆکراتی هەڵبژێردراو لەلایەن گەلەوە بکات، ئەم وێناکردنە سەبارەت بەفەرمانڕەوایی تێکەڵ کە لەسەر بنچینەیەك کە سەرۆکایەتی دەوڵەت لەلایەن پاشایەکی خاوەن فەزیلەوە بکرێت کە ئەنجومەنی ئەرستۆکراتی پێکهاتو لەعاقڵەکانی گەل کە لەلایەن گەلەوە هەڵبژێردراون ـ هاوکاری بکرێت، سیستمی ناوبراو بریتییە لەپاشایەتییەکی هەموارکراو بەئەرستۆکراتییەت و دیموکراسی.

لەمیانەی خستنەڕوی پەیوەندی ژێردەستەکان بەفەرمانڕەواکانەوە، ئەکوینی رقێکی ئاشکرا بەرامبەر سیستمی سەرکوتکاریی دەردەبڕی، ئەو مافەش بەگەل دەدات بەرەنگاری ئەو فەرمانڕەوا سەرکوتکارە ببنەوە کە سنوری خۆی دەبەزێنێت.[٤٠٢]

بەڵام، لەگەڵ ئەمەشدا، ئەم مافە پەیوەست دەکات بەدوو مەرجی بنەڕەتییەوە، ئەوانیش: نابێت ئەم مافە لەلایەن بەشێکی گەلەوە پیادە بکرێت، بەڵکو دەبێت لەلایەن گشت گەلەوەوە بێت، ئەوانەی بەرەنگاردەبنەوە پێویستە ئەو لێپرسراوێتییە لەئەستۆ بگرن کە نابێت لەجموجۆڵەکانیاندا خراپەگەلێکی ئەوتۆیان لێبوەشێتەوە

402- ئەکوینی جیاوازیی لەنێوان دوو جۆر لەبەرهەڵستیدا دەکات: بەرهەڵستییەکی گەلی کە رێگەی پێداوەو بەرهەڵستییەکی تاکەکەسی (تیرۆرکردنی سیاسی) کە رێگری لێکردوە، بەڵام کوشتنی فەرمانڕەوای چەوسێنەر لەلایەن تاکەکەسەوە کە لەخۆیەوە بەو کارە هەڵدەستێت رێگەی پێنەدراوە، بەڵام گەل یان نوێنەرێك لەئەنجومەنی رێگەپێدراو ئەو مافەی هەیە.. بڕوانە: یوسف کرم: تاریخ الفلسفه الاوربیه فی العصور الوسطی، دار المعارف-القاهره.. ل ١٧٥ . بەراوردی بکە لەگەڵ: فؤاد محمد شبل: الفکر السیاسی: سەرچاوەی پێشوو.. ل ١٨٨-١٨٩ .

زیاتر بێت لەخراپەکارییەکانی فەرمانڕەوای سەرکوتکار یان هاوتای بێت، ئەمە بەو مانایە دێت کە ئەکوینی عاقڵیو بیرتیژی بەچاکەی سەرەکیی داناوە لەژیانی سیاسیدا، بیرتیژی مەبەستە ئەخلاقییەکان هەڵناسەنگێنێت، بەڵکو هۆیەکانی پێشکەش دەکات، لێرەوە ئەکوینی ڕەزامەندی دەرنەبڕیوە لەسەر بەرەنگاربونەوەی ستەمکاران یان لەسەر عسیانی مەدەنی گەوجانە.[403]

وەك چۆن لەمیانەی ئەم پێشکەشکردنەوە ئاماژە بەڕێگەکانی چارەسەرکردنی ستەمکاریی دەکات و دەڵێت: گەل مافی یاسایی هەیە لەناچارکردنی فەرمانڕەوا (کە دەسەڵاتەکەی لەگەڵەوە وەردەگرێت) لەسەر پابەندبون بەو مەرجانەی کە بەهۆیەوە دەسەڵاتی دراوەتە دەست.[404]

واتە داننانێك لەئارادایە بەرامبەر مافی گەل لەکۆتایی هێنان (بەزەبری هێز) بەفەرمانڕەوایی سەرکوتکار، بەمەرجێك دور بگیریت لەزیانگەیاندن بەبەرژەوەندی گشتی، بۆیە دەکرێت بوترێت تۆماس ئەکوینی دامەزرێنەری تیۆری دەسەڵاتی گەلە.[405]

## سێ: پەیوەندی دەوڵەت بەکڵێساوە

تۆماس ئەکوینیو ئەو بیریارە مەسیحییە خۆرئاواییانەی لایەنگری دەکەن، ئەو بیرۆکە یۆنانییە ڕەتدەکەنەوە کە پێی وایە

---

403- بڕوانە: کرانستون: سەرچاوەی پێشوو.. ل ٣٧ .

404- بڕوانە: الدکتور. بطرس غالی و الدکتور. محمد خیری عیسی: سەرچاوەی پێشوو.. ل ١١٦ .

405- بڕوانە: الدکتور. ابراهیم الدسوقی اباظة و الدکتور. عبدالعزیز الغنام: سەرچاوەی پێشوو.. ل ١٢٠ و ل ١٣١ .

کۆمـــەڵ بـــەرزترین ئامانجـــە و سەرچـــاوەی ئەفرانـــدنی بـــەها ڕۆحییەکانـە، بۆیـە تێبینـی دەکـەین وێنـای پەیوەنـدی دەوڵـەت بەکڵێسـاوە بەلاسـایکردنەوەی ئـەو کەشـتییە دەکـات کـە لەسـەر دەریایـە، فـەرمانڕەوای زەمـەنی تیایـدا وەك ئـەو دەیاروانەیـە کـە لەگەشـتەکەدا کـاری چـاککردنەوەی کەشـتییەکەیە، لەکاتێکـدا مەسیح لەجێگـەی ئـەو کابتنەدایە کـە کەشتییەکە بەرەو ئامانجی کۆتایی ئاراستە دەکات.

بەواتایـەکیتر، ئـەکوینی لـەو بڕوادایـە، تـا ئـەو کاتـەی بەیەکداچـون لـەنێوان بوارەکـانی تایبەتمەنـدی کلێسـاو دەوڵـەت هـەبێت، پێویسـتە مەبەسـتە دنیاییـەکانی مـرۆڤ ملکەچـی مەبەسـتە ڕۆحییـەکانی بـبن، لەبەرئـەوەی ئەمـەی دوایـین تـەنیا مەبەسـتێکە لـەخودی خۆیـدا وەردەگیرێـت، ئنجـا پێویسـتە فـەرمانڕەوا بەشـوێن مەبەسـتی یەکـەم (دنیـایی)دا بگـەڕێت نـەك وەك ئامـانج، بـەڵکو وەك هۆیەك بۆ گەیشتن بەمەبەستی دوەمیـان (ڕۆحـی)و لەکاتێکدا بەم کارە هەڵدەسـتێت پێویسـتە ملکەچـی دەسـڵاتی ئـایینی ببێـت.. دەوڵـەت سـەربەخۆ نییـە لەکڵێسـا بـەڵکو ملکەچـییەتی بـەو ئەنـدازەی بوارەکانیـان تێکـەڵ بەیـەکتر دەبێـت، کەواتـە کڵێسـا لەسـەروی دەوڵەتەوەیە.[٤٠٦]

## چوار: یـــاســـا

تۆماسی ئەکوینی لەتوێژینەوەی یاسادا، جیاوازیی لەنێوان چوار جۆر لەیاسادا دەکات، ئەوانیش:

---

406- بڕوانە: الدكتور. حسن شحاتة: سەرچاوەی پێشوو.. ل ١٥٥ .

### أ. یاسای ئەزەلیی – Eternal Law

ئـەم یاسـایە هاوتایـە لەگـەڵ عـەقڵی خواوەنـددا لەبەرئـەوەی فـەرمانڕەوایی خـودا بۆ جیهـان بـەکات دیـاری ناکرێت، بەواتایـەکیتر ئـەو یاسـایە کـەخودا فـەرمانڕەوایی جیهـانی پێدەکات و دانـایی رێکخراوی‌خودایيـە بـۆ بونـەوەر، ئنجـا لەسـەروی سروشـتی مـرۆڤ و ئاسـتی تێگەیشـتنی مرۆڤەوەیـەو سـەرباری ئەمـەش نـامۆ نییـە بەدەرککردنی مـرۆڤ یـان پێچەوانە بێت لەگەڵ توانا عەقڵییـەکانی، تا ئەو کاتانەی مرۆڤ بەسروشتی جێبەجێی دەکات.

### ب. یاسای سروشتی – Natural Law

وەك رەنگدانـەوەی وشـەی خوداییـە لەسـەر بونـەوەرەکان و لـەئارەزوە سروشـتییەکانی مـرۆڤ لەئەنجامـدانی چاکەو هـەنگاونان بـەرەو کـاری ئـەخلاقیو فازیـل سەرچـاوەدەگرێت، ئەمـەش مانـای ئەوەیـە یاسـای سروشتی مرۆڤ لەرێگەی عەقڵییەوەو بەگـەڕان بـەدوای مەبەسـتی خـودا لەبونـەوەرو خواسـتەکانی لەسـەر ئـەو بونـەوەرە ئاشـکرای دەکـات، ئـەم یاسایە کە خودا بەخشیویەتی دەکەوێتە ژێرڕکێفی عـەقڵ یـان دەرونـی سروشتی فازیلەوە کە لەژێر کاریگەریی یاسای ئەزەلیدایە.[٤٠٧]

### ت. یاسای خودایی – Devine Law

407– تۆماس ئـەکوینی تیـۆرەکی لەیاسـای سروشـتیدا دارێـژا، کـامڵتر لەوانـەی پێش خۆی، ئەگەرچی بەدەر نەبوو لەهەندێک تەمومژاوییو ئەمـەش لەبـەر ئـەو دوو رۆڵەی داونیەتە پاڵ سروشت: لەکاتێکدا سروشـت بەلایـەوە بریتییـە لەگشـت ئـەو شتانەی کە دەستکرد نین، هاوکـات پێیوایـە سروشـت گشـت ئـەو شتانەیە کـە دەبێـت هـەبن، سـنورەکەی لەسنوری وەسـفکردنەوە درێـژە دەکێشـی تـا دەگاتـە سنورەکانی فەرمان و قەدەغەکردن.. بڕوانە: کرانستون: سەرچاوەی پێشوو.. ل ٣٦

ئـەم یاسـایە خـۆی لەکتێبـە ئاسمانییـەکان و ئـەو بەندانـەدا دەبینێتـەوە کـە لەڕێگـەی سـروش یـان پێڕاگەیاندنـەوە هـاتوە وەك ئـەو شـەریعە تایبەتـە خـودا بـۆ جولەکـەی دابەزانـدوەو وەك بەنـدەکانی ئایینی مەسیحی کـە ڕێگـەی کتێبـە پیرۆزو کلێساوە بڵاوبوەتـەوە، بـەم پێیـە یاسـای خـودایی بەخششـێکە لەبەخششـەکانی خواوەنـدو دروسـتکراوی عـەقڵی سروشـتیمرۆڤ نییـە، چـاوەڕوان نـەدەکرا ئەکوینی لەبایەخی یاسای مەسیحی کـە لەڕێگـەی سروشـەوە هـاتوە، کەمبکاتـەوە. ئەوەنـدە هەیـە جـەختی لەسـەر ئـەوە کردوەتـەوە کـە بۆشـایی نێـوان عـەقڵ و ئـەم یاسـایە فـراوانتر نـەبێت، بـەبڕوای ئـەو سروش لایەنگیری عەقڵە و ناکرێت بەرامبەری بوەستێتەوە.

## پ. یاسای مرۆیی (دانراو) – Human Law

بریتییـە لەشـەریعەتی عـەقڵ بۆ بـەدیهاتنی بەرەژەوەنـدی گشتی و لەلایـەن لێپرسـراوی چـاودێری کۆمەڵـەوە دادەڕژێـت، بـەهۆی دوو تەگـەرەوە پێویسـتمان بەیاسـای مرۆیـی دەبێـت: ئەسـتەمبونی تێگەیشـتنی خـەڵکی لەبەنـدەکانی راسـپاردەی ئـەقڵی خـودایی‌و ڕێنماییـەکانی، ئنجـا لەبـەر ئەسـتەمی جێبـەجێکردنی پرەنسـیپە گشتییەکانی یاسای سروشتی لەحاڵەت و بارودۆخی دیاریکراودا.

ئەکوینی مەرجگـەلێکی دانـاوە کـە دەبێـت یاسـای مرۆیـی لەگـەڵ عـەقڵ کـۆك بێـت، هـەروەها لەگـەڵ دادوەریـی و ڕێکبێـت

لەگەڵ سودی گشتیو متمانەی خۆی لەگەڵ یان لەو کەسەوە وەربگرێت کە گەل متمانەی پێبەخشیوە.[٤٠٨]

## سێیەم: دانتێ - (١٢٦٥ - ١٣٢١) Dante

ئەگەر بیروبۆچونەکانی تۆماس ئەکوینی زۆرترین رەنگدانەوەی لەسەر زانایانی مەسیحی هەبوبێت و بوبێتە مەزهەبی سیاسیو کۆمەڵایەتی رەسمیی ئەم ئایینە، ئەوا بیروڕا سیاسیو کۆمەڵاتییەکانی دانتێ(ئەدیب و شاعیر)[٤٠٩] کە لەکتێبی لەبارەی خاوەنداریتی Le Monarchiaدا بڵاویکردونەتەوە بووە مایە تورەکردنی کڵێساو بەجۆرێك پاپا یۆحنای بیست و دووەم ساڵی ١٣٢٩ فەرمانی دەرکرد بەسوتاندنی ئەو کتێبەو بەچەشنێك لەکاری لەدین دەرچوون ناویبرد، وەك چۆن ساڵی ١٥٥٤ فەرمانێکی دیکەی

---

408- سەبارەت بەجیاکردنەوەی ئەم چوار جۆرە لەیاسا، بڕوانە: فؤاد محمد شبل: سەرچاوەی پێشوو.. ل ١٩٠ . لەگەڵ: الدكتور. ملحم قربان: سەرچاوەی پێشوو.. ل ٤٣-٤٤ .

409- دانتێ لەشاری فلۆرەنسا لەدایک بووە و یەکێکە لەچاکترینی رۆشنبیرەکانی سەدەکانی ناوەڕاست و لەگەورەترین شاعیرەکانیەتی، دانەری (کۆمیدیای خواوەندی)یە کە بەزمانی رەشۆکی ئیتالی دایڕشتوە کە یارمەتیدەر بووە لەتەشەنەکردنی زمانی نوێی ئیتالیدا لەکاتێکدا زمانی لاتینی زمانی ستانداری ئەدەبی بووە، دانتێ یەکەم مەسیحییە شۆڕشی لەدژی بیرۆکەو گوزارشتی کلاسیکی کردوەو هەر بۆیە بەمژدەهێنی سەردەمی رۆشنگەری دادەنرێت، بەهرەی دانتێ بەتەنیا لەدانانی کۆمیدیای خواوەندیدا کورتنابێتەوە، بەڵکو سیاسەتمدارو دیبلۆماتێکی دیارو شارەزایەکی باشی هونەرەکانی جەنگ بووە، هەروەها ئاشنایەتیەکی باشی لەگەڵ کتێبەکانی فەلسەفەو مێژو و ئایین و زانستی زەماندا هەبوە، پاپاکان بۆ ماوەی نۆزدە ساڵ لەفلۆرنسا دوریان خستەوەو هەڕەشەی سوتاندنیان لێکرد ئەگەر بگەڕێتەوە بۆی.. بڕوانە: فؤاد محمد شبل: سەرچاوەی پێشوو.. ل ١٩٤ .

دەرکرد وتیایدا ئاڵوگۆڕ پێوەکردنی قەدەغەکردو ئەم قەدەکردنە تا چەند ساڵێکی کەمی پێش ئێستا لەسەر کتێبەکە لانەچو بو.

ئەم کتێبەی دانتیٚ بەرگریکردنە لەسەربەخۆبونی ئیمپراتۆر لەبەرامبەر کلێسادا، ئاشتی بەرقەرار نابێت ئەگەر ئیمپراتۆرییەت بەتەواوی نەکەوێتە ژێر رکێفی دەسڵاتێکەوە کە ئیمپراتۆر سەرکردایەتی دەکات، لەماوەکانی دواتردا بەرهەڵستی دانتیٚ سەرچاوەی ئیلهامبەخشی نیشتمانپەروەرەکانی ئیتالیا بوە، لەو بڕوادا بووە کە سیاسەتی پاپا سەرچاوەی ململانێیەکی نەبڕاوەیە فەرەنسا دەیقۆزێتەوە بۆ دەست تێوەردان هەر کاتێک یەکێك لەحزبەکانی داوای ئەوەی لێبکەن، بەڵام دانتیٚ لەسیاسەتەکانیدا نیشتمانپەروەرێکی توندڕەو نەبوە ئەگەرچی نوسینەکانی رۆڵێکی گەورەیان گێڕاوە لەدروستبونی زمانی نیشتمانی ئیتالیدا.

سیاسەتی دانتیٚ هاوتابو لەگەڵ ئەو سیاسەتەی لایەنگرانی ئیمپراتۆرییەت لەگەڵ دەستپێکردنی ململانیٚ لەگەڵ کلێسا لەسەردەمی هنری چوارەم و گریگۆری حەوتەم دا پەیڕەویان دەکرد وەك بەڵگە لەسەر ئەوەی کە دەسڵاتی ئیمپراتۆر راستەوخۆ لەدەسڵاتی خوداوە وەردەگیرێت و بەمەش سەربەخۆیە لەکلێسا. دانتیٚ بەتەواوی دانی بەدەسڵاتی رۆحی پاپادا ناوەو بەڵام وەك گشت لایەنگرانی تری ئیمپراتۆرییەت پەیڕەوی لەتیۆری جلاسیۆسی یەکەم کردوە کە دەڵێت بێجگە لەخودا کەس دوو دەسڵاتی یەکگرتوی نییە.[410]

---

410- بۆ زانیاری زیاتر بگەڕێرەوە سەر: الدکتور. ابراهیم درویش: الدولة نظریتها و تنظیمها: سەرچاوەی پێشوو.. لا ٧٢ .

بەم پێیە لەناو مرۆڤەکاندا کەس لەسەروی ئیمپراتۆرەوە نییە.

هەوڵدان لەشوێنکەوتنی بیرە سیاسیەکانی دانتیّ دا ئەوانەی لەکتێبی (لەبارەی خاوەنداریّتی) ئاماژەیان پێکراوە ئەوەمان بۆ دەردەخات مەبەست و روانگە بیرییەکانی لەمیانەی وەڵامدانەوەی سیّ پرسیاری سەرەکییەوە پوختکردوەتەوە، یەکەمی ئەم پرسیارانە تایبەتە بەخاڵێکی زۆر بنەڕەتی، ئەویش ئایا خاوەنداریّتی زەمەنی پێویستە بۆ بەختەوەریی جیهان؟

لەوەڵامدانەوەی ئەم پرسیارەدا دانتیّ یەکەمجار پێناسەی خاوەنداریّتی زەمەنی دەکات و بەو دەسڵاتەی دادەنێت کە کۆنترۆڵی گشت بونەوەرە دنیاییەکان دەکات، ئنجا دەڵێت هەمو کۆمەڵگەیەك خەبات لەپێناو بەدیهاتنی مەبەستێکی دیاریکراودا دەکات و شێوازی ئەرستۆ بەکاردەهێنێت لەسەلماندنی ئەوەی کە گەشەسەندنی کۆمەڵگا گواستنەوە بووە لەگوندەوە بۆ شارو ئامانجی باڵا لەسایەی ئیمپراتۆرییەتدا نەبێت بەدینایەت،[411].. بەڵام ئەم

411– لەمبارەوە سباین دەڵێت: دانتیّ کە دەیەوێت گشت رەگەزەکان یەکبخات و لەکەسێتی ئیمپراتۆردا کۆیانبکاتەوە.. لەسەر ئەو هێڵەی کێشاویەتی وەک کاردانەوەیکی بەهێزی کاریگەریی فەلسەفەی نوێی ئەرستۆ وایە لەسەر پرەنسیپەکانی مەسیحییەت و ئەریتەکانی ئەوانەی لەگەڵ لەداکبونیدا پەیدابون و تا سەدەی سیانزەیەم بەردەوامیان هەبووە، ئەم کاریگەرییەی ئەرستۆ رۆڵی هەبووە لەئاڵۆزکردنی بیری هەریەک لەتۆماس و دانتیّو هەروەها لەسەختبونی دەرکەوتنیاندا، سەرچاوەی ئەم سەختییەش بۆ نەتوانایی جێبەجێکردنی فەلسەفەی ئەرستۆی تایبەت بەکۆمەڵگای پشت بەخۆ بەست لەسەر ئیمپراتۆریەتی نمونەیی دەگەڕێتەوە، ئەوەشی ئەم سەختییەی قورستر کرد دەستێوەردانی کڵێسایە کە لەلایەک بانگەشەی دەسڵاتی رۆحی دەکردو لەلایەکی دیکەوە داوای سەروەریی سیاسی دەکرد.. بڕوانە: سباین ج٢: سەرچاوەی پێشوو.. ل ٧٤ .

ئامانجە بریتییە لەبەدیهێنانی ژیانێکی پێگەیشتو کە هاوتایە لەگەڵ ئەو عەقڵ و داناییەی کە بەخشراوە بەمرۆڤ و ئەمەش تەنیا لەسایەی ئاشتییەکی گشتیدا بەدیدێت کە بەختەوەری بۆ هەموان دەستەبەردەکات و لەبەرئەوەی کۆمەڵگا لەرێگەی هاوکارییەوە پێکەوە دەبەسترێت.. پێویستە ئەم کۆمەڵگایە سەرۆك یان فەرمانڕەوایەکی هەبێت.

بەم رێگەیە دانتیٚ سەلماندویەتی گشت رەگەزیی مرۆیی دەبێتە تەنیا کۆمەڵگایەك لەژێر رکێفی تەنیا یەك سەرۆك و یەك حکومەتدا، مەحاڵە ئاشتی لەنێوان خەڵکیدا سەقامگیر بێت ئەگەر فەرمانڕەوایەکی دادوەر دور لەچاوچنۆکیو هەواو ئارەزوەکان دانەمەزرابێت کە توانای هەبێت لەکپکردنەوەی ئەو ململانێیانەی لەنێوان پاشاو ئەمیرەکاندا رودەدەن، وەك چۆن ئازادی نابێت ئەگەر هێزیك نەبێت لەتوانایدا بێت ستەم و چەوساندنەوە لەناوبەرێت.

دانتیٚ سەرەڕای سوربونی توندی لەسەر حکومەتی پاشایەتی جیهانی دانی بەوەشدا ناوە کە کۆمەڵە کارەکتەرێکی پەیوەست بەعورف و داب و نەریت و زمان و رۆشنبیری هەمیشە دەبنە مایەی جیاوازیی لەنێوان گەل و نەتەوەکانداو لەیەکتریان جیادەکەنەوە، فەرمانڕەوا لەسەریەتی کاروباری فەرمانڕەوایی بەکۆمەڵە یاسایەکی جۆرەکی رێکبخات کە بۆ هەریەکەیان دەست بدات.[٤١٢]

پرسیاری دووەم کە دانتیٚ کردویەتی دەربارەی ئەوەیە کە ئایا گەلی رۆمانی مافی ئەوەی هەیە فەرمانڕەوایی جیهان بکات؟

---

412– بڕوانە: الدكتور. علی عبدالمعطی محمد: سەرچاوەی پێشوو.. لا ١٥٨ .

دانتیٚ پشتی بەمێژو بەستوە لەبەڵگەهێناوە بۆ مافی گەلی ڕۆمانی لەفەرمانڕەوایی جیهاندا، ئەوەی وەبیرهێناوەتەوە کە بابلییەکان و ئاشورییەکان و فارسەکان و میسرییەکان شکستیان هێناوە لەوەی کە فەرمانڕەوایی گشت جیهان بکەن، وەك چۆن ئەسکەندەری گەورە لەبەیهاتنی ئەم خەونەوە نزیك بووە، بەڵام تەنیا ڕۆمانییەکان توانیان ئیمپراتۆرییەتێکی ڕۆمانی جیهانی دابمەزرێنن و ئەمەش بەفەزلی خودا بووە.[٤١٣]

بەواتایەکیتر خواستی خودا کە خۆی لەپەرەسەندنی مێژوی مرۆڤایەتیو مێژوی ڕۆمادا دەبینێتەوە ئەوە دەسەلمێنێت کە کارئاسانی خودایی ڕۆمای گەیاندوەتە ئاستی دەوڵەتێکی خاوەن سایەو ئەمەش بەهۆی پێکهاتەی ئیمپراتۆرییەتی ڕۆمانییەوە بوە کە پێویایە وەکو چاودێرێکی پارێزەری خودایی (ڕۆما)و پایەبڵندنی ئەخلاقی ڕۆماو ئامرازیی بەدیهاتنی چاکەیە، وەك چۆن تەنیا هەوڵیشە سەرکەوتنی بەدەست هێنابێت، هەروەها ئەوەیشی سەلماند کە تەدبیروقەدەری خوادا دا بۆی نوسراوە کە لەجیهاندا بڵاوبێتەوەو رکابەرو دوژمنەکانی بشکێنێت و خواوەند دەیوست رکێفی جیهان بەدەست تەنیا حکومەتێکەوە بێت، ئەویش حکومەتی ئیمپراتۆرییەتی ڕۆمانییە.[٤١٤]

بەڵام پرسیاری سێیەم دەربارەی ئەوەیە کە ئایا دەسەڵاتی ئیمپراتۆرییەت راستەوخۆ لەخوداوە وەردەگیرێت یان لەرێگەی قەشەو پیاوانی کڵێسا لەسەروی هەموویانەوە پاپا؟

دانتیٚ لەو بڕوادایە مرۆڤ سروشتێکی دوانی (جەستەییو گیانی) هەیەو هەریەکەیان خاوەنی مەبەستێکی دیاریکراوە: جەستە هەوڵ بۆ

---

413– هەمان سەرچاوەی پێشوو.. ل ١٦٠-١٦١ .

414– بڕوانە: الدكتور. ابراهيم درويش: سەرچاوەی پێشوو.. ل ٧٣ .

بەدیهاتنی بەختەوەریی لەژیانی سەر زەویدا دەدات، ڕۆحیش ئامانجی دەستەبەرکردنی بەختەوەرییە لەو دنیاداو لەکاتێکدا کە عەقڵ و فەلسەفە تەنیا هۆن لەرێگەی بەختەوەری سەر زەویدا، دڵ و باوەڕ و ئامۆژگارییەکانی لاهوت تەنیا رێگەن بۆ گەیشتن بە بەختەوەریی هەمیشەیی و لەم گریمانەوە دانتیٚ دەگاتە ئەم راستییە:

مرۆڤ لەژیانیدا لەبەرئەوەی هەولی بەدیهاتنی دوو ئامانج دەدات پێویستی بەدوو رابەر هەیە، رابەری یەکەم پاپای گەورەیە کە مرۆڤ بەرەو ژیانی هەتاهەتایی دەبات کە هاوتایە لەگەڵ ئامۆژگارییەکانی ئینجیلداز دووەمیان ئیمپراتۆرە کە مرۆڤ بەرەو بەختەوەری سەر زەویی دەبات کە هاوتایە لەگەڵ رێنماییەکانی فەلسەفەدا.[415]

بەو مانایەی دەسڵاتی ئیمپراتۆر سەربەخۆیە لەدەسڵاتی پیاوانی کڵێسا بەپاپایشەوە، رێگەی ژیانی سەر زەویی لەهۆو ئامانجەکانیدا جیاوازە لەرێگەی ژیانی هەتاهەتایی، دەسڵاتی زەمەنی کە لەئیمپراتۆردا دەردەکەوێت بەهیچ شێوەیەك ملکەچی دەسڵاتی کڵێسا نییە، پێچەوانەی بانگەشەکانی پاپا، دەقەکانی ناو کتێبی پیرۆز هەرگیز پشتگیریی سەروەریی کڵێسا ناکەن بەسەر دەسڵاتی زەمەنیدا، بۆیە ئەو دەسڵاتە زەمەنییەی پاپا داوای دەکات لەبنەمادا پێچەوانەیە لەگەڵ سروشتی کڵێسا کە ئەم دنیایە جێگەی دروستبونی دەوڵەتەکەی نییە.

ئەمانە هاندەرمان دەبن لەوەی هەندێك ئەنجام بخەینەڕو کە دەکرێت لەبیری تۆماس ئەکوینیو یەجیری دانتیٚ دەربهێنرێت، هەردوکیان بیری سیاسیان لەکۆتاییەکانی سەدەکانی ناوەڕاستدا بەمشێوە دەرخستوە:

415- الدکتور. علی عبدالمعطی محمد: سەرچاوەی پێشوو.. ل ١٥٩-١٦٠ .

١. ڕەگـەزیی مرۆیـی کۆمەڵگەیـەك پێکـدەهێنێت و پێویسـتی بەتـەنیا فەرمانڕەوایەکە.

٢. گـرنگترین خەسـڵەتی ڕەگـەزیی مرۆیـی ئەوەیـە کـە لـەدوو ڕەگـەز پێکهـاتوە: ڕەگـەزی ڕۆح و ڕەگـەزی جەسـتە، بۆیـە پێویسـتی بـەدوو دەسڵاتە" دەسڵاتێکی ئایینیو دەسڵاتێکی دنیاییو لەسەر ئەمەش پێویستە حکومـەتی جیهانی دوو بـەش بێت" حکومـەتێکی ئایینی و حکومـەتێکی زەمـەنی.. کـە هەریەکـەیان تایبەتمەنـدێتیو سێستم و چینی فەرمانبەری تایبەت بەخۆی هەیە.

٣. کۆمەڵگای نێودەوڵەتی دەکرێت بەئیمپراتۆرییەت ناوببرێت.

٤. تـەنیا بیـانوی دەسڵاتی زەمـەنی یـان ئاییـنی بیـانوی ئـەخلاقی یـان ئایینیـە و بریتییـە لەپەسـەندکردنی سـودی گشـتی کۆمـاری مرۆڤایەتی.

٥. دەسـڵات لـەخوداو لەگەڵـەوە وەردەگیرێـت، پاشـا سـەرۆکایەتی کۆمـەڵگاو ملکەچـی یاسـاکانیەتی، دەسـڵاتی پاشـا ڕاگەیانـدنی دەسـڵاتی ژێردەسـتەکانییەتی، بـەڵام کـەمتر لەدەسـڵاتی گشـت کۆمەڵگا.

٦. دەسڵاتی پاشـا بریتییـە لـەدەنگی عـەقڵ و دانـایی، گـەل پێویسـتی بـەهێزی تـەوزیمی پاشـایە، تـا هێـزی جێبـەجێکردنی یاسـاکانی بـۆ بڕەخسێت، وەك ئـەوەی بیـانو بـۆ هێـز دەهێنێتـەوە ئەوەیـە هاوتایـە لەگەڵ یاساکانداو مەبەست لێی خۆشگوزەرانی کۆمەڵگەیە، ئیتر ئەو خۆشگوزەرانییە ماددیی بێت یان ڕۆحی.

# ئاوابونی باڵادەستی کڵێسا

گۆڕانکارییە سیاسیەکانی کۆتاییەکانی سەدەکانی ناوەڕاست بەکۆمەڵە تایبەتمەندییەك جیادەکرێتەوە، لەدیارترینیان: گەشەسەندنی هەستی دژایەتیکردنی کڵێساو پیاوەکانی، لاوازبونی پاپا، ئاراستەی بەرەو تێڕوانینی عەلمانی بۆ ژیان، پەیدابونی بۆرژوازییەت و دامەزراندنی دەوڵەتی نەتەوەیی.

ئەم گۆڕانکارییانە رەنگدانەوەیان لەسەر نوسینەکانی هەریەك لەمارسیلیۆس پادۆ و ویلیەم ئۆکام بەجێهشتوە.

## یەکەم: مارسیلیۆس پادۆ – Marsilio.of.Padua [٤١٦]

416- مارسیلیۆسس پادۆ لەماوەی نێوان ساڵەکانی ١٢٧٥-١٣٤٣ دا ژیاوە، *بەپیشەی* پزیشکیو قوتابی فەلسەفەو یاساو لاهوتەوە سەرقاڵ بووە، پادۆ کە شوێنی لەدایک بونیەتی یەکێکە لەشارەکانی ئیتالیا کە بەئازادیی دانیشتوانەکەیو بەرگریکردن لەخۆی لەبەرامبەر پیاوانی کڵێسادا ناوبانگی دەرکردوە، مارسیلیۆس پادۆ سەر بەچینی مامناوەندەو ئاراستە زانستیو واقیعییەکان بەسەر بیرکردنەوەیدا زاڵ بوون و پیشەی پزیشکی ئەنگیزەی رەخنەکردنێکی زانستی ئازادیی بۆ رێڕەوی فیکریی پادۆ زیادکردبوو.
کاریگەریی ئەرستۆ لەسەر پادۆ لەباوەڕبونی پتەویدا دەردەکەوێت بەتێبینی ئەزمونگەرایی لەفەلسەفەداو بەپرەنسیپی دەوڵەتی شار لەسیاسەتدا، وەک چۆن مانەوەی لەفەرەنسا یارمەتیدەری بووە، بەجۆرێک لەزانکۆی پاریس خوێندویەتیو دواتر وەک مامۆستا وانەی تێدا وتوەتەوە کاریگەریی لەسەر دارشتنی ئاراستەی بیریدا هەبووە، پاریس ببووە پێشەنگ لەبوارەکانی فەلسەفەو هونەرو ئەدەب، وەک چۆن ببووە ناوەندی ئەو بزوتنەوەو بیرە سکۆلارانەی هێرشیان دەکردە سەر پاپاو ئەم رۆشنبیرییە هەلیان مارسیلیۆس رەخساند تاکو ئەمیش وەک دانتێ دەربچێت: ئەڵقەیەکی پەیوەستی سەردەمی ناڤین بەسەردەمی "نوێ"وە ببەستێت،

پادۆ بیروڕاکانی لەکتێبە بەناوبانگەکەیدا بەناوی بەرگریکار لەئاشتی The dedua ساڵی ١٣٢٤ بڵاوکراوەتەوە، مەبەستی پادۆ لەدانانی ئەم کتێبە ئارەزوکردنی بووە لەتێکشاندنی سیستمی باڵادەستی پاپاکان و ئەو تیۆری وەك یاسایەکی کڵێسایی پشتی پێدەبەستن، گەیشتن بەئاراستەی دیاریکردنێکی وردو چالاکی ئەو دەسڵاتە ڕۆحییەی بانگەشەی بۆ دەکات لەمافی باڵادەستی (بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆ) بەسەر کارەکانی حکومەتی زەمەنیدا، لەم پیناوەدا پادۆ لەداڕشتنەوەکەیدا زیاتر لەهەر نوسەرێك کڵێسای خستوەتە ژێر ڕکێفی دەوڵەتەوە، ئەمەو ئەم حاڵەتە دەکرێت بەیەکەم ئەرستی دابنرێت لەمێژودا.

مارسیلۆ پادۆ بنچینەی تیۆر فەلسەفییەکەی لەئەرستۆ خواستوە، ئەوەمان وەبیردەهێنێتەوە کە کتێبەکەی تەواوکەری ئەو بەشەی کتێبی "سیاسیەت"ە کە باس لەهۆی شۆرش و ململانێ ئایینیەکان دەکات، و ئەوەیشی بۆ زیاددەکات و دەڵێت: هۆیەکی تر کە لەچوارچێوەو بیرکردنەوەی ئەرستۆدا بزربوە، هاندەری بووە لەنوسینی کتێبەکەیدا، ئەویش بانگەشەی پاپاکانە لەمافی باڵادەستیان بەسەر فەرمانڕەوا زەمەنییەکاندا، و ئەو بانگەشەیە کە کێشەی لەئەوروپاو بەتایبەت لەئیتالیا لێکەتوەتەوە، بۆیە پێویستە ڕێگەچارەیەك بۆ ئەم ئاژاوەو ناسەقامگیرییە بدۆزرێتەوە، پرەنسیپی ئەرستۆ سەبارەت بەکۆمەڵگای پشتبەستوو بەخود لەبەتوانا

---

لەگەڵ تێبینی کردنی ئەوەی دانتێ لەبیرو چارەسەرەکانیدا پەنا بۆ بیری ناوەڕاست دەباتەوە، لەکاتێدا مارسیلیۆس لەو بیرو چارەسەرانەدا ڕوو لەسەردەمی نوێ دەنێت.

لەپڕکردنەوی پێداویستییە ماددیی‌و ڕۆحییەکانیدای کردوەتە ئەو ڕوانگەی لەم لێکۆڵینەوەدا پەیڕەوی لێکردوە.

کتێبی "بەرگریکار لەئاشتی" دوو بەشی سەرەکی لەخۆدەگرێت: یەکێکیان چارەسەری ئەو ڕوانگە ئەرستییانە دەکات کە پادۆ لەچارەسەرە بیرییەکانی تایبەت بەدەوڵەت و حکومەتەکەیداو لەیاساو چۆنێتی داڕشتنی‌و ئنجا دەستەی جێبەجێکردندا خستونیەتەڕو، لەکاتێکدا بەشی دووەم تیشک دەخاتە سەر ئەنجامگیرییەکانی تایبەت بەکڵێساو پیاوەکانی‌و پەیوەندییان بەدەسڵاتی مەدەنییەوەو ئەو زیانانەی بەهۆی هەڵەتێگەیشتن لەمەسەلەکان دێتەئاراوە، لەبارەی ئەم لایەنانەوە دەدوێین:

## یەك: دەوڵەت و حکومەت

دەوڵەت (بونەوەرێکی زیندو) و لەکۆمەڵە ئەندامێك پێکهاتوە کە ئەرکە پێویستەکانی بەردەوامبونی ژیانی ئەنجامدەدەن و (تەندروستی) یان ئاسایشی ئەم بونەوەرە لەسەر ئەو سێستمە بەندە کە بەهۆیەوە گشت ئەندامێك ئەرکی خۆی بەئەنجامدەگەیەنێت، دوبەرەکی دورست دەبێت ئەگەر کاری یەکێك لەئەندامەکان شکستی هێنا یان دەستی لەکاری ئەندامێکی تر وەردا.

پادۆ لەو بڕوادایە شار لەخێزان پێکهاتوەو ئەو شارە کۆمەڵگەیەکی کامڵە یان دەسڵاتی بەسەردا دەشکێت گشت پێوداویستییەکانی دابین بکات کە ژیانێکی سروشتی (دنیایی

بێت یان ئەو دنیایی) بژی، ئنجا شوێنپێی بیرییەکانی ئەرستۆ هەڵدەگرێت و ئەو چینانە دەژمێرێت کە پێکەوە کار بۆ دروستبونی کۆمەڵگە دەکەن: کەشتیارو پیشەسازو بەهەمانشێوە سەربازو کاڕمەندان و پیاوانی کڵێسا هەن کە دەوڵەتیان لێ پێکدێت، ئەوەی لەم بوارەدا نوێ بێت وێناکردنی - مەسیحییەت - ە وەك کارەکتەرێکی نوێ لەدامەزراندنی دەوڵەتدا، پادۆ زۆر ئازایانە دان بەوەدا دەنێت پیاوانی ئایینی لەپەیوەندییە دنیاییەکاندا جیاوازییان نییە لەگەڵ هیچ کام لەچینەکانی دیکەی کۆمەڵداو دواجار هیچ جیاکردنەوەیەك نییە لەنێوانیان و لەنێوان هەر چینێکی تری کۆمەڵگەدا، بێگومان ئەمە مەسەلەیەکی گرنگەو خاڵی وەرچەرخانە لەبیری مەسیحیدا.[417]

مەسیحییەت لەتێڕوانینی پادۆدا ئایینێکی ئاسمانییەو سروشتی نییە Super naturalو ناکرێت ملکەچی بیرکردنەوەی لۆژیکی بکرێت، بەپێچەوانەی دەوڵەتەوە کە پێکهاتەیەکی سروشتی هەیەو پادۆ لەمەدا جیاواز لەتۆماس ئەکوینی بیردەکاتەوە کە دەیویست لەکاتی بیانوهێنانەوە بۆ مەسیحییەتدا یەکخستن لەنێوان عەقڵ و بیروباوەڕدا دروستبکات.

ئەرکی ئایین بریتییە لەرونکردنەوەی ڕێگە لەبەردەم ئەوانەی خوازیاری دەربازبونی هەتاهەتایین لەو دنیادا، پیاوانی کڵێسا لەروی مەدەنییەوە چینێکی کۆمەڵگەن کە ئەرکێك بەجێدەهێنن لەسەروی ئاستی بیری مرۆڤایەتییەوەیەو لەمەشدا هاوشێوەیە لەگەڵ ئایینەکانی تردا، بتپەرستی بێت یان ئاسمانی.. لەو

---

417- بڕوانە: الدكتور. ابراهیك درویش: سەرچاوەی پێشوو.. ل ٧٧ .

روانگەوە عەقڵی مرۆڤ ناتوانێت لەرێگەی بیرکردنەوەی لۆژیکیانەوە بگاتە سەلمانی راستییەکانی، وەك چۆن کشتوکاڵ و پیشەسازیی ملکەچی دەبن و ملکەچی پیاوانی ئایین بۆ دەوڵەت هاوشێوەیە لەگەڵ ملکەچی چینەکانی تردا.[418]

ئایینی مەسیحی، بەواتایەکیتر دیاردەیەکی تەواو کۆمەڵایەتییە، ئەمە بەو مانایە نایەت مارسیلیۆس پادۆ دەیەوێت هێرش بکاتە سەر ئایینی مەسیحی، بەڵکو پێداگری لەسەر پیرۆزی بیروڕاکانی دەکاتەوەو لەو بڕوادایە کە لەسەروی گشت عەقڵێکەوەیە کە بیری لێدەکاتەوە، بەڵام ئەو راستییەی کە ناکرێ لەیادبچێت ئەوەیە کڵێسا بەبەشێك لەدەوڵەت دادەنرێت.

کاتێك مارسیلۆ پادۆ چارەسەری شێوازەکانی حکومەت دەکات، دەبینین هەمان ئەو پۆلێنە دوبارە دەکاتەوە کە پێشتر ئەرستۆ پەسەندی کردە، ئەویش حکومەتەکان یان ئەوەتا چاکن و یان ئەوەتا گەندەڵن: حکومەتە چاکەکان بریتیین لەپاشایەتیو ئەرستۆکراتییەت و دیموکراسی، حکومەتە گەندەڵەکانیش ئەمانەن: فەرمانڕەوایی تۆتالیتارو فەرمانڕەوایی کەمینە – ئۆلیگارشییە – و دیموکراسی، بەڵام بنەمای جیاوازیکردن لەنێوان چاك و گەندەڵی ئەم حکومەتانە بریتییە لەئاستی بەپیرەوەچونی خزمەتی ژێردەستەکان و گونجانی کارەکانی لەگەڵ خواستەکانیان، یان بەپێچەوانە هەنگاونان بەئاراستەی

418- بڕوانە: سباین: سەرچاوەی پێشوو.. لا ٤٠٩-٤١٠ ز ئنجا بەراوردی بکە لەگەڵ: الدكتور. بطرس غالی و الدكتور. محمود خيری عيسی: سەرچاوەی پێشوو.. لا ١٢٤ .

خزمەتکردنی فەرمانڕەوایان و پشتگوێخستنی بەرژەوەندییەکانی ژێردەستەکان.

لەگەڵ ئەوەی ئەرستۆ ئەرستی بووە لەپۆلێنکردنی جۆی حکومەتەکاندا، کەچی لەدوو لایەنی سەرەکییەوە لێی جیاوازە: یەکەمیان ڕێزگرتنی خواستەکانی گەلی کردوەتە سەنگی مەحەك وەك بنەڕەت لەجیاکردنەوەی حکومەتە چاکەکان لەحکومەتە گەندەڵەکان، لەکاتێکدا ئەرستۆ بەبیرۆکەی دەربارەی مافی هەندێك لەفەرمانکردن و گوێڕایەڵی هەندەکەی تر ڕێگەی نەداوە ئەوانەی گوێڕایەڵیان لەسەرە مافی فەرمانکردنیان هەبوە، واتە ڕێگر بووە لەبەردەم ڕێزگرتنی خواستەکانی گەل و پێداویستی ڕەزامەندی دەربڕینی لەسەر ئەو فەرمانانەی لەلایەن فەرمانڕەواکانەوە دەردەچن.. دووەمیان پادۆ جیاوازیکردوە لەنێوان حکومەت و ئەو ڕێگەی بەدیهاتنی ئەم ئامانجەدا، ئەمە لەلای ئەرستۆ بەدیناکرێت، ئامانجی حکومەت بەدیهێنانی بەرژەوەندی گشتییەو ڕێگە (شێوان) لەو ڕێگەدا خۆی دەبینێتەوە کە ئەم ئامانجە دیاریدەکات، دیموکراسی وەك شێوەیەك لەشێوەکانی فەرمانڕەوایی یەکەمجار پەیوەستە بەو شێوازەی کە حکومەت بۆ خۆی دەیگرێتەبەر، بەڵام ئەنجامەکان (مەبەست) دەکرێت باش یان خراپ بێت.[٤١٩]

---

419– بڕوانە: الدکتور. علی عبدالمعطی محمد: سەرچاوەی پێشوو.. لا ١٦٥ . و بەراوردی بکە لەگەڵ: فؤاد محمد شبل: سەرچاوەی پێشوو.. لا ٢٠٦ .

دوو: **یاساو دەستەی شەرعی**

یاسا وەك چۆن مارسیلۆ پادۆ رونیدەکاتەوە" یان ئەوەتا پیرۆزەو یان ئەوەتا مرۆیی‌یە، یەکەمیان راستەوخۆ فەرمانەکانی خودایە کە دەیەوێت بەشێوەیەك کاروبارەکانی مرۆڤایەتی رێکبخات تا ئامادەیان بکات بۆ چێژوەرگرتن لەبەخششەکانی ئەو دنیا.

بەڵام یاسای مرۆیی بریتییە لەفەرمانی کۆمەڵێك لەهاوڵاتیان، یان زۆرینەیان بۆ رێکخستنی کارەکانی تاکەکەس لەپێناو دەستەبەرکردنی ژیانێکی فازیل لەم دنیاداو هاوکات لەگەڵ ئەم یاسادا هێزێکی جێبەجێکاریش هەیە ئەرکی سەپاندنی سزایە بەسەر ئەو کەسانەی کە سەرپێچی بەندەکانی دەکەن.

ئەو ئەنجامەی لەك پێناسەوە دەست دەکەوێت، جیاوازی نێوان هەردوو یاساکە لەسەر چۆنێتی ئەو سزایە بەندە کە هەریەکەیان بەسەر تاوانباردا دەیسەپێنن: لەکاتێکدا سزای یاسای پیرۆز بێبەشکردنە لەچونە بەهەشت (ئەم سزایە جێگەکەی ئەو دنیایە) سزای یاسای مرۆیی دنیاییەو ناکرێت بوترێت ئەم یاسایە بنچینەیەکی پیرۆز یان خودایی هەیە، دەسڵاتەکەی لەیاسای تاکەکەسەکانەوە وەردەگرێت.

ئەم جیاکردنەوە زۆر گرنگە، چونکە ئەوە روندەکاتەوە کە پیاوانی ئایینی ناکرێت دەسڵاتییان هەبێت لەبەرئەوەی لەم دنیادا دەسڵاتەکەیان هێزی جێبەجێکردنی لەگەڵدا نییە، مەگەر بکرێت یاساداڕێژ دەسڵاتێکی هاوشێوە بخاتە ژێررکێفیانەوە، لێرەوە پادۆ قورساییەکی گەورەی داناوە بۆ هێزی جێبەجێکردن

کە لەپشت جێبەجێکردنی یاساوەیە، قورسایی هاوشێوەی بۆ یاساداڕێژو پشتبەستنی یاسا بەخواست و دەسڵاتەکەی داناوە، ئەو یاسا وەك شتێکی دەرچوو لەدەستەیەکی دەستوریی (تێکڕای هاوڵاتیان) تەماشادەکات کە هێزو هەیبەتی خۆی لەو سزایانەدا دەبینێتەوە کە بەسەر سەرپێچیکەراندا دەسەپێنرێت.[420]

لەبەرئەوەی هیچ یاسایەك بەبێ یاساداڕێژەر نابێت مارسیلۆ پادۆ دەپرسێت دەبێت ئەو یاساداڕێژەرە مرۆییە کێ بێت؟.. وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارەی پایەی سەرەکی تیۆر سیاسیەکەیەتی: یاساداڕێژەرو سەرچاوەی یاسای چالاك بریتییە لەتاکەکەسەکان یان تێکڕای هاوڵاتیان یان زۆرینەیان کە بەخواستی خۆیان لەئەنجومەنی گشتیداو بەزمانێکی پاراو کە هیچ لێکدانەوەیەك هەڵناگرێت بڕیار لەسەر ئەو کارە مەدەنییان دەدەن کە رێگەیا پێدراوەو ئەوانەش کە قەدەغەکراون، لەگەڵ روبەڕوبونەوەی ئەوانەی سەرپێچی یاسا دەکەن بەدانی غەرامە یان لەئەستۆگرتنی هەر سزایەتی تری دنیایی.[421]

---

420- بڕوانە: سباین: سەرچاوەی پێشوو.. ل ٤١٢ .

421- ئەم چەمکە بیرۆکەیەکمان لەبارەی سەروەری (خواستی گشتی)ەوە دەداتێ، رۆسۆمان وەبیردەهێنێتەوە تەنانەت زیاتر لەوەبیرهێنانەوەی بودان یان ئۆستن، کارەکە هەرکامێکیان بێت بەدڵنیاییەوە جیهانێکی تەواو جیاوازە لەجیهانەکەی تۆماس ئەکوینی، لێرەدا هیچ پێگەیەك بۆ بیرۆکەکەی (ئەکوینی) تایبەت بەوەی کە دەوڵەت ملکەچی سیستمێك لەبەهای هەتاهەتایی رەها دەبێت کە یاسای خودایی‌و یاسای سروشتی گوزارشتی لێدەکەن، دەوڵەت سەرچاوەی یاسایەو یاسەکەی پێویستە جێبەجێ بکرێت نەك تەنیا لەبەرئەوەی بەندەکانی پشت بەدەسڵاتی ناچارکردن دەبەستن، بەڵکو بەهەمانشێوە

یاسایی مرۆیی ئەنجامی کاری هاوبەشی نێوان کۆمەڵە لەدانانی ڕێساگەلێکدا لەپێناو کۆنترۆڵکردنی هەڵسوکەوتی هەموو ئەندامەکان، یان بەواتای بەرامبەر دەوڵەت بریتییە لەکۆمەڵە تاکەکەسێك کە پێویستە گوێڕایەڵی کۆمەڵە یاسایەکی دیاریکراو و گەل یان زۆرینەی بێت و بریتییە لەسەرچاوەی دەسڵاتی یاسایی ئیتر خۆی پیادەی بکات یان ئەو کارە لەڕێگەی دەستە یان لیژنەیەك وەیان خستنە ئەستۆی ئیمپراتۆرە پیادە بکات، گومانی تێدا نییە مارسیلیۆس پادۆ لەبیرکردنەوەی خۆیدا سیستمی فەرمانڕەوایی لەدەوڵەتی شاردا لەپلەی یەکەمدا داناوە، سەرەڕای ئەوەی هیچ ئاستەنگێکی بەدینەکردوە لەوەی کە ئەم پیناسەیە بەسەر هەر دەوڵەتێکی تریشدا جێبەجێبکات.

کەواتە گەل بەگوێرەی ئەم وێناکردنە بریتییە لەو یاسادارێژەی کە یاساکان دادەڕێژێت، خۆی خاوەنی دەسڵاتەو ئەوەیشی پیادەی دەکات بەناوی ئەوەوە پیادەی دەکات، ئەم بیرۆکەیە لەدەوڵەتی شاردا هەبوە، ئنجا بەکاربراوە لەشرۆڤەکردنی دەسڵاتی ئیمپراتۆرییەتی ڕۆمانیداو ئەو دەستەواژەی (زۆرینە لەنەتەوە)ی کە یاسادارێژ بیروڕاکانی بەهەند وەردەگرێت، لێرەدا مەبەست لێی زۆرینەی ژمارەیی نییە، بەڵکو ئەو بەشەیە لەژیانی کۆمەڵگەدا سەنگی هەیە، ئەم لێکدانەوە لەم وتە ڕاشکاوانەی (پادۆ)دا ڕوندەبێتەوە: کاتێك دەڵێم زۆرینەی نەتەوە مەبەستم هەردوو لایەنی ژمارەییو بەهاییە، پیاوماقوڵانی کۆمەڵگە سەنگێکی گەورەتریان هەیە

---

لەبەرنەوەی لەخۆیدا گوزارشت لەدادوەریی دەکات.. بڕوانە: الدكتور. عبدالكريم احمد: دراسات فى النظرية السياسية الحديثة: سەرچاوەی پێشوو.. لا ٢٥

لەتاکەکەسە ئاساییەکان، ئەم بیرۆکەیە بۆ ئەرستۆ دەگەڕێتەوە وەك چۆن لەسەدەکانی ناوەڕاستیشدا باو بووە.[٤٢٢]

## سێ: دەستەی جێبەجێکردن

مارسیلیۆس پادۆ لەو بڕوادایە کە دەستەی جێبەجێکردن لەلایەن دەسەڵاتی یاسادانانەوە هەڵدەبژێردرێت، نەریتەکان رێگەی هەڵبژاردن لەگشت گەلێکدا دیاریدەکات و گەل سەرچاوەی دەسڵاتی ئەم دەستەیە، بۆیە پێویستە کارەکانی کۆك و گونجاو بن لەگەڵ یاساکانی دەوڵەت و ماف و ئەرکەکانی ئەو سنورانە نەبەزێنن کە گەل رێگەی پێداوە، گەل ئەرك و مافەکانی دەسڵاتی جێبەجێکردن روندەکاتەوە.

یەکێك لەئەرکەکانی دەسەڵاتی جێبەجێکردن بریتییە لەدڵنیابونەوە لەوەی گشت بەشەکانی دەوڵەت بەو ئەرکانەی خۆیان هەڵساون بەوشێوەی کە دەبێتە هۆی بەدیهاتنی بەرژەوەندی گشتی، ئەگەر کەمتەرخەمی لەمەدا کرد گەل مافی لەکارخستنی هەیە، هەروەها دەبێت دەسەڵاتی جێبەجێکردن یەکگرتو بێت بۆ ئەوەی لەگشت دامەزراوەکانی تر بەهێزتر بێت، بۆ ئەوەی لەتوانایدا بێت یاساکان جێبەجێبکات و ئەو لەمەدا مەبەستی هێرشکردنە سەری ئەم بیرۆکەیە کە دەیەوێت دەسڵات لەنێوان پاپاو ئیمپراتۆردا دابەشبکات.[٤٢٣]

---

422– بڕوانە: سباین: سەرچاوەی پێشوو.. ل ٤١٤ . هەروەها: الدکتور. علی عبد المعطی محمد: سەرچاوەی پێشوو.. ل ١١٦ .

423– بڕوانە: سباین: سەرچاوەی پێشوو..

بەمشێوە پادۆ وێنەیەکی تەواوی لەبارەی سروشتی ئەو کۆمەڵگە سیاسییەوە پێشکەش کردوین کەپشت بەخۆی دەبەستێت: کۆمەڵگە لەتێڕوانینی ئەودا جەستەی بنەڕەتییەو لەو چینانە پێکهاتوە کە گشت رەگەزە سروشتیو ئەخلاقییە پێویستەکانی بەردەوامبونی تێدایەو دەسڵاتی یاسادانان ئەو ئامرازەیە کە بەکاری دەهێنێت لەرێکخستنی گشت بەشەکانیدا بەجۆرێك سودی هەموانی تێدابێت، بەڵام دەسڵاتی جێبەجێکردن لەجێگەی بریکار یان نوێنەرێکە کە کۆمەڵگە بواری جێبەجێکردنی ئەو شتانەی پێداوە یەکێتی دەوڵەت دەیخوازێت و هیچ بوارێکی بەکارهێنانی هێزو ململانێ لەسەر پسپۆڕی تێدا نییە، بەڵام بەرژەوەندییە رۆحییەکانی کۆمەڵگە بۆ جیهانێکی دیکە دەگەڕێتەوەو دەست تێوەردان نییە لەپسپۆڕی کۆمەڵگەی زەمەنی.

کاتێك مارسیلیۆس پادۆ دێتە سەر بەشی دووەمی کتێبەکەی (بەرگریکار لەئاشتی) ئەم بەشە تایبەت دەکات بەلایەنی رۆحیو چارەسەری ئەو دامەزراوە دەکات کە سروتەکانی ئایینی مەسیحی لەخۆدەگرێت و ئەرکی پیاوەکانیو پەیوەندی بەخاوەندارێتییەوە، ئەمەش سەرباری رێکخستنەکەی..

### یەك: کلێساو پیاوەکانی

مارسیلیۆس پادۆ لەو بڕوایە فەرمانبەران دەسڵاتەکەیان لەکۆمەڵگەوە وەردەگرن ئیتر یان لەرێگەی کردنە بریکار یان لەرێگەی نوێنەرایتیکردنەوە، لەبەرئەمەشە پیاوانی کلێسا

دەسـڵاتی جێبـەجێکردنیان نییـە، چـونکە چـینێکن لەچـینەکانی کۆمەڵگـەو ئـەرکیان ئەنجامـدانی خزمـەتی ئـاینی پێویسـتە بەکۆمـەڵ، ئـەم ئەرکـە هاوشێوەی گشـت ئەرکـەکانی تـر ملکەچـی کۆمەڵگـەو رێکخسـتنەکانییان دەکـات، ئەگـەر سەرپێچـییان کـرد رەوانـەی دادگـای مـەدەنی دەکرێن و بەنـدەکانی یاسـایی مرۆییـان بەسـەدا جێبەجێـدەکرێت، بـەڵام سەرپێچـی کردنـی یاسـای پـیرۆز لەو دنیا روبەڕوی سزایی خوادایان دەکاتەوە.

بەواتایـەکیتر کڵێسـا دەسـڵاتی سـزادانی نییـە بەسـەر تاکەکەسەکاندا یان ئەوانەی پشتیان لەئایین کردوە، ئەگـەر ئەوانە هەڵـەیان کردبێـت سـزاکەیان لـەم دنیـادا نییـە، بـەڵکو لـەجیهانی دواییداو کڵێسا ناتوانێت و تەنانەت مافی سزادانی ئەوانی نییە، تـەنیا دەزگـای دەوڵـەت مـافی سـزادانی راسـتەوخۆی لەیاسادەرچـوانی لەدەسـتدایە، دەوڵـەت بەشـێوەیەکی کرداریـی ئـامرازە هەمەچەشـنەکانی ناچـارکردنی بـەزۆری ئامـادە کـردوە لـەپێناو بەرپەرچـدانەوەو ناچـارکردنی لەیاسادەرچـوان بـۆ پابەندبون بەیاساوە.[٤٢٤]

مارسیلیۆس ئەرکی قەشە بەئامۆژگاریی پزیشك دەچوێنێت، ئەگـەر ئەنجامـدانی سـروتە ئایینییـەکانمان وەلاوەنـا، دەبیـنین ئەرکی پیاوانی ئـایینی لـەئامۆژگاریی‌و رێنوێنیدا کورتدەبێتـەوە، ئـەوان ئامۆژگـاری پیاوخراپـان دەکـەن، بـەڵام نـاتوانن ناچـاریان بکـەن بگەڕێنـەوە یـان دەسـت لـەتاوان هـەڵبگرن، هـیچ یـەکێك لەنوسەرانی سـەدەکانی ناوەڕاسـت بەئەنـدازەی مارسـیلیۆس پـادۆ

---

424– بڕوانە: علی عبدالمعطی محمد: سەرچاوەی پێشوو.. لا ١٧٠-١٧١ .

باسی لەجیاکردنەوەی تەواوی نێوان کاروبارە رۆحیو کاروبارە دنیاییەکاندا نەکردوە.[425]

## دوو: موڵکەکانی کڵێسا

ناکرێت بوترێت کڵێسا موڵکی هەیە، چونکە ئەوەی هەیەتی هیچ نییە بێجگە لەبەخشش یان هاوکاریی کە لەلایەن کۆمەڵگەوە پێشکەشی کراوە بۆ ئەوەی بەئەنجامدانی ئەرکە رۆحییەکانی هەڵسێت، لەسەر ئەمە کڵێسا مافی باجی دەیەك و بواردنی لەباجە گشتییەکانی نییە.

## سێ: ئەرکی پیاوی کڵێسا

لەبەرئەوەی پیاوی کڵێسا لەبەرامبەر ئەنجامدانی ئەرکەکەیدا کرێ وەردەگرێت دەوڵەت ئەو مافەی هەیە ملکەچی ئەنجامدانی ئەرکی تایبەتی ئەو پۆستەی بکات، وەك هەر فەرمانبەرێکی تری مەدەنی کە خزمەتی دەوڵەت دەکات.

## چوار: رێکخستنی کڵێسا

مارسیلیۆس پادۆ دان بەوەدا دەنێت کە کڵێسا بۆ ئەوەی هەژمونی بەسەر مەسەلە رۆحییەکاندا هەبێت پێویستی بەسێستمێکی جیاوازە لەسێستمی مەدەنی، بۆیە پێگەیەکی پێدەبەخشێت کە تەواو گونجاوە لەگەڵ رێکخستنی دەوڵەتدا کە لەگشت مەسیحییەکان پێکهاتوە بەقەشەو ئەوانیترەوە، گشت پیاوانی ئایینی جیادەکرێنەوە بەوەی بریکاری بەرێوەبردنی کاروبارە ئایینیەکان و ئەنجامدەری سروتەکانی پەرەستنن و

---

425– بڕوانە: سباین: سەرچاوەی پێشوو.. ل ٤١٦ .

هەروەها بۆ رۆشنبیرکردن، کەواتە پیاوانی کڵێسا لەروی ئایینیەوە یەکسانن و هیچ جیاوازییەك نییە لەنێوان پاپاو قەشەدا لەروی ئایینیەوەو هیچ یەکێکیان چاکەی بەسەر ئەویتریانەوە نییە، مەگەر بەخۆپاراستن و کاری چاکە.

مارسیلیۆس تەنیا باوەڕی بەئینجیل هێناوەو گشت ئەو زیادەکاریی‌و بیروڕایانەی رەتکردوەتەوە کە لەلایەن ئەم پاپا یان ئەویتریانەوە خراونەتەڕو، ئەوەشی رونکردوەتەوە کە ئەگەر ئینجیل جێگەی راڤە جیاوازەکان بێت، ئەوا پێویستە تەنیا لەپاپا یان لەدەستەیەکی کڵێساوە دەرنەچوبێت بەڵکو لەگشت ئیماندارنەوە بێت، ئەم پێداگرییە مەسەلەی زەروربونی گەڕانەوەی بۆ ئینجیل بەپێودانگی ئەوەی تەنیا سەرچاوەی بیروباوەڕو یاسای خوداییە رۆڵی هەبوە لەبەشداریکردن دروستبونی بزوتنەوەی ریفۆرمی ئایینی پرۆتستانتی‌دا.[٤٢٦]

رێکخستنی کڵێسا کارێکە ناکرێت تەنیا پاپا پێی هەڵسێت، بەڵکو بەئەنجومەنێکی گشتی دەسپێردرێت کە لەیەن گشت مەسیحییەکانەوە هەڵدەبژێردرێت، ئەم ئەنجومەنە گشتییە دەسڵاتی تەواوی دەبێت لەمەسەلە ئایینییەکانداو بڕیارەکانی بەسەر هەمواندا جێبەجێدەبێت بەخودی پاپایشەوە، بەو واتایە مارسیلیۆس رێکخستنێك بۆ کڵێسا بڕیاردەدات کە گونجاوە لەگەڵ ئەو رێکخستنەی کە بۆ دەوڵەتی داناوە، کڵێسا لەمەی دوایین بەوە جیادەکرێتەوە" کڵێسا کۆمەڵگەیەکی جیهانییەو گشت مەسیحییەکان لەخۆدەگرێت، وەك چۆن دەوڵەت لەگشت

---

426- الدکتور علی عبد المعطی محمد: سەرچاوەی پێشوو.. ل ١٧١ .

ئەو هاوڵاتیانە پێکدێت کە لەناویاندا نوێنەر بۆ لەئەستۆگرتنی دەسڵات دیاریدەکرێت، بەهەمانشێوە مەسیحییەکانیش هەمویان ئەنجومەنێکی گشتی رادەسپێرن بۆ بەڕیوەبردنی دەسڵاتی جێبەجێکردن.

لەکۆتاییدا ئەگەر شتێك مابێتەوە بوترێت، ئەوەیە مارسیلیۆس هاوشێوەی دانتیٚ بایەخی بەدامەزراندنی ئیمپراتۆرێتییەکی جیهانی نەداوە، بەڵکو جەختی لەسەر هەبونی جیاوازیی زۆر لەنێوان کۆمەڵگەکاندا کردوەتەوە (ئیتر ئەو جیاوازییانە زمانیی بن یان ئایینی یان رۆشنبیری و یان پەیوەستبن بەدابونەریتەوە) دەبنە هۆی دروستبونی حکومەت و دەوڵەتی زۆرو سەربەخۆ، لێرەوە ئەم بیروڕایانە رۆڵیان هەبوە لەدروستبونی دەوڵەتی نەتەوەیی کە سەرەتایەکی راستەقینەی ئاوابونی سەدەکانی ناوەڕاست و چونە ناو قوناغێکی نوێیە کە قۆناغی تازەیە.

## دووەم: ویلیەم ئۆکام[427]

427- ویلیەم ئۆکام پاش قەشە تۆماس ئەکوینی لەدیارترین فەیلەسوفە فێرگەخوازەکانە، لەشاری (ئۆکام)ی سەر بەویلایەتی یۆرکشایەر سالّی ١٢٩٠ لەداک بووەو سالّی ١٢٨٩ کۆچی دوایی کردوەو بەشێک لەژیانی لەئۆکسفۆرد گوزەراندوەو ئنجا لەوێشەوە رۆشتوەتە فەرەنسا و سالّی ١٣٢٨ بڕیاردا لەستافی کلێسا دەربکرێت، ئەوەبو لەئەفیۆن هەلآت ولەگەڵ مارسیلیۆس پادۆ لەمیوشن لەسایەی ریعایەتی ئیمپراتۆردا گیرسانەوەو لەوێوە دەستی کرد بەنوسین نامە سیاسیەکانی دژ بەپاپا.
نوسینە سیاسیەکانی ئۆکام بەشێوازی جەدەلی فەلسەفی دەناسرێتەوەو دەکرێت چەندین نمونە بهێنرێتەوە بۆ رونکردنەوەی میتۆو تێڕوانینەکانی" چەندین نامەی نوسیوە لەوانەی تایبەت بەپرسیارکردن دەربارەی بابەتەکانی پەیوەست بەسیاسەتی

سروشتی ململانێی دژ بەدەسڵاتی رەهای کلێسا لەسەدەی چواردەهەمدا بەشێوەیەکی زۆر رونتر لەنوسینەکانی ویلیەم ئۆکامدا دەردەکەوێت بەبەراورد لەگەڵ ئەو نوسینانەی لەکتێبی (بەرگریکار لەئاشتی)ی مارسیلیۆس پادۆدا هاتوە، دەتوانین بڵێین تیۆرکانی ویلیەم ئۆکام لەڕوی تەواویی و رێکخستنەوە لەئاستێکی نزمتردایە لەتیۆرکانی پادۆ لەلایەکەوە، وەك چۆن ناتوانرێت بەئاسانی پەی پێببرێت لەکاتێکدا لەنێوان زیاتر لەیەك دانراودا دابەش بووە.

نوسینەکانی ئۆکام رەنگدانەوەی بەشێکی گەورەی ئەو شۆرشەیە کە ڕای گشتی مەسیحی بەرامبەر بەرکێفی پاپا هەیبوە کە بووە هۆی بڵاوبونەوەی ئەو بڕوایەی کە پاپا نەك تەنیا شەڕە بەسەر کلێسا بەڵکو شەڕە بەسەر ئەورپاشەوە، بیروڕاکانی لەم روانگەوە بواری پسپۆڕی هەریەك لەدوو دەسڵاتەکە دیاریدەکات: دەسڵاتی رۆحی کە لەپاپادایەو دەسڵاتی زەمەنی کە ئیمپراتۆر نوێنەرایەتی دەکات، ئۆکام چۆن تیۆرکەی لەم بارەوە داڕشتوە؟

---

کردارییەوە: ئایا دەکرێت تەنیا کەسێک لەیەککاتدا سەروەری باڵای هەبێت بەسەر کلێساو دەوڵەتدا؟.. ئایا دەسڵات راستەوخۆ لەخواوەندەوە سەرچاوە دەگرێت یان نە؟.. ئایا پاپا مافی ئەوەی هەیە دەسڵاتی پاسادانان ببەخشێتە ئیمپراتۆر؟.. ئایا هەڵبژاردنی کاندیدەکان دەسڵاتی رەها دەداتە دەست پاشای ئەڵمانیا؟.. ئایا ئاهەنگی تاج لەسەرنان دروست دەبێت ئەگەر پیاوانی کلێسا پێی هەڵنەسن؟.. ئایا هەڵبژاردنی پاشا لەلایەن دەنگدەرانەوە مافی ئەوەی دەدەنێ نازناوی ئیمپراتۆر لەخۆی بنێت؟.. ئایا میر دەتوانێ بەبێ پرسکردن بەپاپا دەست بەسەر موڵکەکانی کلێسادا بگرێت؟.. بڕوانە: برتراند راسل ج٢: سەرچاوەی پێشوو.. ل ٢٥٨ و ل ٢٦٢ .

دەستپێك پێویستە ئاماژە بەوە بکەین ویلیەم ئۆکام بیری نەکردوتەوە لەوەی کڵێسا لەدەوڵەتدا بتوێنێتەوە، بەڵکو تەنیا هەوڵیدەدا بوارەکانیان جیا بکاتەوەو لەرێگەی دیاریکردنی بوارەکانی پسپۆڕی هەریەکەیانەوە چاککاری لەکڵێسادا بکات و لەپێناو بەئەنجامگەیاندنی ئەم مەبەستەدا دەبو بەرهەڵستی بانگەشەکانی پاپا بکات سەبارەت بەدەسڵات و دەست بەسەرداگرتنی، بۆیە ئۆکام پێیوایە دەسڵاتی کڵێسا بەگوێرەی ئەو سێستمەی لەئارادایە ئەرك و مافەکانی ئەوانیتر ناگرێتەوە بەمەبەستی رەتکردنەوەی یان سنور بۆدانانی، بەتایبەت ئەوەی بۆ فەرمانڕەواکان دەگەڕێتەوە لەئیمپراتۆرو پاشاو میرەکان، چونکە ئەم ماف و ئازادییانە دەچێتە چوارچێوەی ئەو لایەنە زەمەنییانەی کە ئاسایی پاپا دەسڵاتی بەسەردا ناشکێت.[٤٢٨]

بەم بۆنەوە پاپا ناتوانێت ماف لەکەسێك قەدەغە بکات کە لەئەوی وەرنەگرتەوە، بەڵکو لەخودا یان لەسروشت یان لەپیاوێکی تر وەرگیراوە، وەك چۆن پاپا بۆی نییە ئەو ئازادییانە لەخەڵکی زەوتبکات کە خودا یان سروشت پێی بەخشیوە، لێرەدا تێبینی دەکەین ئۆکام سروشت و رێکەوتننامە مرۆییەکان لەپاڵ خودادا وەك سەرچاوەی ماف وەردەگرێت، ئەمەش بەیەکێك لەگەشترین روەکانی بیری ئۆکام دەژمێردرێت.

تیۆری سیاسی ئۆکام لەپایە بنەڕەتییەکانیدا بەپارێزکار دادەنرێت، ئەو لەهەوڵیدا بۆ پشتگیریی ئازادی کڵێسا بەرامبەر بەپاپا چوارچێوەی بیرەکانی سەردەمی خۆی تێنەپەڕاندوە،

---

428– بڕوانە: جان توشار: سەرچاوەی پێشوو.. لا ١٧٥ .

بەڵگەی لەسەر ئەو بیرۆکە هێناوەتەوە کە دەڵێت دەسڵاتی رەهای پاپا لەرێگەلادان و دەرچونەو لەم لایەنەوە کۆمەڵە بیروڕایەکی پێشکەش کردوە کە دەوترێت جێگەی رەزامەندیی هەموان بوە،

ئۆکام لەو بڕوادایە دەکرێت هەماهەنگی لەنێوان پسپۆڕییەکانی هەردوو دەسڵاتی زەمەنیو رۆحیدا بکرێت لەمیانەی دوپاتکردنەوەی پرەنسیپی سەربەخۆی هەریەکەیان لەئەویتریان بەجۆرێك بوار لەبەردەم هاوکاریکردنی بەرامبەر لەنێوانیاندا دەرەخسێنێت، لەگەڵ ئەمەشدا داوای چوارچێوەیەکی کردوە کە لەسەر بنەمای نوێنەرایەتیکردن دروست بوبێت بۆ شکاندنی ئەو سنوربەزاندنەی کە پێی وابو بەکارهێنانی دەسڵاتی پاپایە بەرێگەیەکی سەرکوتکارانە.[٤٢٩]

لەم بابەتەدا رێگر نابێت لەوەی پاپا خۆی هەڵسێت بەنەهێشتنی ئەو سنوربەزاندانەی خۆی ئەگەر وەك پێویست خاوەنی هەڵسوکەوتی چاك بێت، بەڵام ئەم مەرجە بەتێڕوانینی ئۆکام تەنیا لەوانەدا فەراهەم دەبێت کە پاپای راستگۆن.

کاتێکیش چارەسەری مەسەلەی ئیمپراتۆر دەکات، ویلیەم ئۆکام ئەوە رەتدەکاتەوە دەسڵاتی ئیمپراتۆر لەدەسڵاتی پاپاوە وەرگیرابێت، یان ئەوەی ئاهەنگی تاج لەسەرنان رەوایەتی دەسڵاتی ئیمپراتۆر زیاتردەکات، وەك چۆن ئەوەش رەتدەکاتەوە کە پەسەندکردنی هەڵبژاردنەکان لەلایەن پاپاوە پێویست بێت بۆ سەلماندنی تەندروستی هەڵبژاردنەکە.. بەلەبەرەچاوگرتنی ململانێی نێوان ویلیەم ئۆکام لەگەڵ پاپا تێبینی دەکەین کۆمەڵە

---

429– بڕوانە: سباین: سەرچاوەی پێشوو.. لا ٤٢٦ .

دەسـڵاتێکی ئـەوتۆ دەداتـە پـاڵ ئیمپراتـۆر کـە لەتوانایـدا بێـت بەمەبەسـتی چـاککردنی بـاری کلێسـا دەسـت لـەکاروبارەکانی وەربدات، لەگـەڵ ئەوەشدا جەختدەکاتـەوە لەسـەر ئەوەی کـە ئـەم دەسڵاتە بەخشـراوانە کۆمەڵـە دەسڵاتێکن تـەنیا لەکاتی قـەیران و ناکاوەکاندا بەکاردەهێنرێن.[٤٣٠]

ئەگـەر سـنوری نێـوان هـەردوو دەسـڵاتی رۆحـیو زەمـەنی بەمشـێوە دیـاریکرابن، چ دەسـڵاتێك بەدەسـت کلێسـاوە دەمێنێتەوە؟

لەم روانگەوە ویلیەم ئۆکام پێیوایـە کـە دەبێت پاپا لەهـەردوو لایـەنی رۆحـیو زەمەنییـە دەسـڵاتێکی دیـاریکراو لەمسـیحەوە وەربگرێـت، دەسـڵاتێك بـواری بـدات کـۆنترۆڵی عـاقڵبونی تێکـڕای ئیمانـداران بکـات، بـەمانای ئـەوەی دەسـڵاتێکی بەرتەسـکە بـەجۆرێك دەیپارێزێـت لەبـەرکارهێنانی سـەرکوتکاریی، رێـز لـەو ئازادییـە دەگرێـت کـە مـافی سروشـتیو مـافی گـەلان (یاسـای نێودەوڵـەتی)و یاسـا مەدەنییـەکان دەیبەخشـنە مەسـیحییەکان، بـەگوێرەی ئەمـە پاپـا دەسـڵاتدار دەبێـت بەسـەر گشـت ئـەو دامەزراوانـەی بنچینەکانیان بێجگـە لـەئینجیل لـەهیچ جێگەیـەکی تـردا نییـە (بـەڕێوەبردنی قەشـەکان، پاراسـتنی راهیبـەکان و پێگەیاندی کەهنوتـەکان و هەڵبـژاردنی ئەوانەی ئـەرکی فێرکردنـی گـەل بەئەسـتۆ دەگـرن) لەکاتێکـدا بـۆی نییـە ئـەرکێك زیادبکـات ئەگـەر یاسـاکانی ئینجیـل فـەرمانیان پێنـەکردبێت، لـەم بارانـەدا تـەنیا ئەوەنـدە بەسـە ئامۆژگـاری پێشـکەش بکـات و ئەگـەر

430– هەمان سەرچاوەی پێشوو.. لا ٤٢٧ .

لەدەرەوەی حاڵەتی پێویست بەم کارە هەڵسا، فەرمانەکانی کاریان پێناکرێت و دواجار گوێڕایەڵی پێویست نابێت: لەبەرئەوەی مەسیح هیچ شتێکی لەو دەسڵاتانە نەداوەتێ کە بەکارهێنانی ببێتە مایەی زیان لێکەوتنی تێکڕای نەتەوە.[431]

بەدواداچونی بیروڕاکانی ویلیەم ئۆکام ئەوە دەردەخات کە رقی لەدەسڵاتی سەرکوتکار یان ئەوەی ئەو سنورانە دەبەزێنێت کە یاسا دیاریکردون، دەبێتەوە.. بۆیە کاتێك باس لەپیادەکردنی دەسڵات دەکات، پێیوایە ئامانج لێی بەدیهاتنی بەرژەوەندی گشتیو چەسپاندنی دادوەرییو ئەخلاقە، ئەگەر دەسڵات بەرێنوێنی ئەم ئامانجانە پیادە نەکرا ئەوا بەدەسڵاتێکی سەرکوتکار دادەنرێت و حکومەتیش دەبێت ئەوەی کە ئۆگوستین لەبارەیەوە وتویەتی: (دزیکردنێکی ئاشکرا لەسەر ئاستێکی فراوان) ئەم تێزە سەرچاوەی نهێنی دژایەتیکردنی ئۆکامە بۆ پاپا جۆن کە سنوری دەسڵاتی خۆی بەزاندوەو بەمەش لەپاپایەك کە خۆی (خزمەتکاری بەندەکانی خودا) ناودەبرد بووە (تەنیا چەوسێنەریەکی سەرکوتکار).[432]

لەم میانەدا ئۆکام پێشنیاری پێکهێنانی ئەنجومەنێکی کڵێسایی دەکات بەمەبەستی چاککردنەوەی ئەو هەڵانەی بەهۆی فەرمانەکانی پاپاوە دروست دەبن و بەشێوەیەکی رون سنورێك بۆ دەسڵاتی پیاوانی کڵێساو کۆمەڵە دەستورێکی رێکخراویان بۆ دابنێت، بەتێڕوانینی ئۆکام ئاشتی لەنێوان پاپاو وڵاتانی تری

431- بڕوانە: جان توشار: سەرچاوەی پێشوو.. لا ٧٦ .

432- بڕوانە: سباین: سەرچاوەی پێشوو.. لا ٤٢٧ .

مەسیحییدا بەرقەرار نابێت تەنیا ئەو کاتانە نەبێت گشت پیاوانی کڵێسا یەکبگرن و سنورێکی دادوەرانە بۆ دەسڵاتی پاپاو سایەی دابنێن، باشترین رێگە بۆ گەیشتن بەو ئامانجە بریتییە لەدامەزراندنی حکومەتێکی دەستوریی بۆ کڵێسا لەرێگەی ئەنجومەنێکی گشتییەوە کە باشترینی مەسیحییەکانی لەروی زانستیو بیروباوەڕەوە لەخۆگرتبێت لەگەڵ بەشداری پێکردنی کۆمەڵە کەسێك لەخەڵکی رەشۆك و قەشەکان و هەروەها ئافرەتیش.[٤٣٣]

لەپیناو ئەوەی ئەم بیرۆکەیە بگۆڕدرێت بۆ هەقیقەتێکی بەرجەستە، پێویستە هەر تایفەیەکی ئایینی لەگشت ناوچەکان کەسێك هەڵبژێرن تا لەئەنجومەنی کڵێسایی هەرێمی نوێنەرایەتییان بکات کە ئەویش لای خۆیەوە نوێنەرانی خۆی بۆ ئەنجومەنی گشتی هەڵدەبژێرێت، ئۆکام ئەم پرۆژەی لەمیانەی ئەزمونی رۆژگاری خۆیەوە لەگەڵ کڵێساو لەناو دەوڵەتدا وەرگرتوە، پەرلەمانەکانی سەدەکانی ناوەڕاست نوێنەرایەتی ناوچە جیاوازەکانی دەوڵەتیان دەکرد، بەڵام مەبەست لەخستنەڕوی پرۆژەکە ئارەزوکردنیەتی لەوەی سیستمێك لەکڵێسادا تەشەنە بکات کە ناسراوبوە تەنانەت پێش گونجانی لەگەڵ بیرۆکەیەکدا کە لەو سەردەمەدا باوبوەو پوختەکە ئەمەیە" دەستە یەکگرتوەکان لەتواناياندایە وەك یەکەکان بڵێت و کاربکات، ئەوەندە هەیە ئەو ئاستەنگانەی روبەڕوی ئەم بیرۆکەیە

433– هەمان سەرچاوەی پێشوو.. ٤٢٩ .

بونەوە گەیاندیانە ئەو ئاستەی کە تەنیا جۆرێك لەفەرمانڕەوایی خوازراو بێت.[٤٣٤]

ئەگەر فەلسەفەی سیاسی ئۆکام بەشێوەیەکی ئاشکرا ڕەنگدانەوەی باری بیری سیاسی سەدەی چواردەهەم بێت، لەچوارچێوەیەی لێکۆڵینەوە لەسروشتی پەیوەندی نێوان هەردوو دەسەڵاتی ئایینیو دنیایی دەرنەچوبێت سەرباری ئەوەی دەسەڵاتی کرداریی پاپا بەسەر پاشاکانەوە خەریك بو کۆتایی پێبێت، لایەنی نوێی ئەم فەلسەفە بریتییە لە(ئەگەر ئەو بەشداربوبێت لەوتووێژە سیاسیەکانی پەیوەندی نێوان پاشاو ژێردەستەکانی، هەروەها مافی ئەو ژێردەستانە لەبەرەنگاربونەوەیدا ئەگەر بریارێکی دەرکرد لەگەڵ ویژدانیاندا نەهاتەوە، وەك بەرگرییەك لەوەی کە وای بۆ دەچن بیروباوەڕی راستەقینەی مەسیحییەتە).[٤٣٥]

---

434– هەمان سەرچاوەی پێشوو.. ل ٤٣٠ .

435– هەمان سەرچاوەی پێشوو.. ل ٤٣١ .

# کۆتایی سەدەکانی ناوەڕاست

کۆمەڵگە ڕۆژئاوایی لەنێوان سەدەکانی چواردەیەم و پانزەیەمدا کۆمەڵە گۆڕانکارییەکی قوڵ و فرەی بەخۆیەوە بینی: قەیرانی توندی ئابوریی بووە هۆی هەڵایسان سەرباری داڕوخانی چینە گەلییە فراوانەکان، درم و پەتا جۆراوجۆرەکان بونە هۆی لەناوبردنی سێیەکی دانیشتوان لەوڵاتانی وەك فەرەنساو بەریتانیا وەك چۆن بووە هۆی ترساندنی جەماوەر، پاڵنەری کەوتنەوەی قەیرانی سیاسیو بیری بو، بەڵام ئەو ئابڕوبەرییەی کە لەئەنجامی دەستبڵاوی کڵێساو دابەشبونەکانی هاتبوە ئاراوە بوە مایەی پەرتەوازەبونی کڵێساو چەندین شەڕی لەنێوان میرەکاندا لێکەوتەوە کە بوە هۆی لاوازبونی رای گشتی.

ئەوەندە هەیە ئەم قەیرانە لەنێو خۆیدا هەڵگری مەشخەڵانی ئایندەی باشتربو: دوابەدوای قەیرانی ئابوریی سەرەتاکانی ڕێنیسایسی ئابوریی دەرکەوت و دوابەدوای لاوازبونی دەسڵاتی کڵێسا دادوەریی زیاتر لەدابەشکردنی هێزەکانی رۆحیو زەمەنی هاتەکایەوەو پاش جەنگەکان هەستی نەتەوەیی بزوا کە پێکەوەبەستی نێوان یەکە سیاسیەکانە.[٤٣٦]

بەمشێوە توانرا هێڵی نوێ بدۆزرێتەوە لەبیرو پیادەکردندا کە تێیدا سەدەی پانزەیەم کۆتایی دێت و بۆ ئەوەی ئەو کۆرپەی

---

436- بڕوانە: جان توشار: سەرچاوەی پێشوو.. ل ١٦٩ .

لەسەدەی شانزەیەمدا گەشە دەسێنێت و بۆ ئەوەی ئەو سەردەمە بەسەردەمی رۆشنگەریی ناوبرێت: سەردەمێك كە نزیكبونەوەی روخانی روشنبیری كاتۆلیكی بەخۆیەوە دەبینێت، هەروەها دانانی بنەما نوێكانی تاكگەرایی لەلایەن لایەنگرانی بزوتنەوەی مرۆڤایەتییەوە.

بەندی یەکەم

# ئاراستە گشتییەکانی بیر

# لەکۆتایی سەدەکانی ناوەڕاستدا

لەماوەی سەدەی پانزەیەمدا ململانیٚ لەبارەی دەسڵاتی رەهای پاپا لەکڵێسادا تەشەنەی کردو بەئەورپادا بڵاوبووەو بووە بابەتی سەرزاریی گشت خەڵکیو بابەتی وتوویژەکانیان، روانگەیەك لەئارادابو نەك تەنیا لەدیاریکردنی مافەکانی دەسڵاتی کڵێسا، بەڵکو بەهەمانشێوە لەدیاریکردنی چاکسازیی سەرتاپای دامەزراوەی کڵێساداو لەناویدا چاودێریکردنی پاپا لەبەخشینی فیودالەکان و رێوشوێنی ئەو دادگایکردنانەی کە تایبەتن لەبیروباوەڕ لەبەردەم دادگا ئایینییەکانداو حەواڵەکردنی بڕە پارەی قەبە بۆ خەزێنەکانی پاپا، کە بووە هۆی پەرەسەندنی هەڵویستی سەلبی لەبەرامبەر کڵێساو پیاوەکانیدا، ئەو خۆشگوزارنییەی تێیدا دەژیان و ئارەزوکردنی وەرگرتنی بەرتیل بەشێوەیەکی ئاشکراو رو لەزیادبون، ئەوەی مەسەلەی بەتەواوی ئاڵۆزتر کرد بریتی بو لەو دابەشبونە گەورەی کە ماوەی چل ساڵ بەردەوام بوو (١٣٧٨ - ١٤١٧) تەنانەت ئەستەمە چاودێر بتوانێت ئاستی کاریگەری خراپی لەسەر رای گشتی لەسەرتاسەری کیشوەری ئەورپادا دیاری بکات.[٤٣٧]

بنچینەی ئەم دابەشبونە لەئەنجامی ململانێی نێوان فەرەنساو ئیتالیاوە دێت لەسەر کورسی پاپا: بەجۆرێك بەئاشکرا دیار بوو کە

---

437- بڕوانە: سباین: سەرچاوەی پێشوو.. ل ٤٣٤ .

ئەگـەر پاپـا بیـەوێت لەسـەر کورسـی گشـت کلێسـای کـاتۆلیکی بمێنێتـەوەو دەسڵاتی کاریگـەری هـەبێت پێویسـتە خـۆی لەفەرەنسـا رزگاربکات و ئەویش بەگەڕانەوە بۆ ئامێزی رۆما.

بـەم پێیـە رکابـەری لـەنێوان کەرادلـە فەرەنسـیو کەرادلـە رۆمانییەکانـدا هاتـەئاراوەو بـەرەو جیـاوازیی بـردن و تـا دواجـار هەریەکـەیان پاپایـەکی هەڵبژارد کـە لەگـەڵ ئاراسـتەو خواسـتەکانیدا بگونجێت: پاپایەکی ئیتالی هەڵبژێردرا لەسەر خواستی کەرادیلەکانی رۆماو گروپێکی تر پاپایەکی دیکەیان هەڵبژارد کە ئەمەیان لایەنگری گروپی فەرەنسی بو، بارەگای سەرەکی لەشاری ئەفینیۆن بو.

دواتـر فەرەنسـا دانـی بـەو پاپاداناکـە لەشـاری ئـەفینیۆن دادەنیشت، لەکاتێکدا دوژمنەکانی دانیان بەپاپا ئیتالییەکەدا دەنا، سکۆتلەندە پاپاکەی ئەفینیۆنی پەسەندکردو بەریتانیا کە دوژمنی فەرەنسا بو دانی بەپاپا رۆمانییەکەدا دەنا.[438]

ئەم دابەشبونە بەشێوەیەکی قوڵ بووە مایەی بێزاری خەڵکی، بێگومـان بینینـی دوو پاپـا و هەنـدێکجار سـێ پاپـا کـە رکابەرایـەتی یەکتر دەکەن و جنێو و تۆمەت بدەنەپاڵ یەکترو پەنا بۆ گشت جۆرە جیاوازەکـانی فریـودانی سیاسـی لەکاتێکـدا هـیچ نـەبو جگـە لەدەسکەلای هەندێك لەخێزانە پاشاییەکان و روانگە نەتەوەییەکان، کـە کاریگەریـەکی گـەورەتری هـەبووە لەسـەر داڕوخـانی ئـەو رێـزە کلاسیکییەی خەڵکی بەرامبەر بەپێگەی پاپا هەیانبو.[439] وەك چۆن ئـەو گەنـدەڵیو لەبەریـەك هەڵوەشـانەی بـەهۆی دابەشـبونەکەوە

---

438- بڕوانە: برتراند راسل: سەرچاوەی پێشوو.. ل ٢٨٠ .

439- سباین: سەرچاوەی پێشوو.. ل٤٣٤ .

سێستمی کڵێسای گرتەوە رۆڵی هەبو لەناشرینکردنی پیاوانی ئایینی بەشێوەیەکی گشتی، لێرەوە پێداویست بونی چاکسازیی لەکڵێچسادا دێتەئاراوەو دەبێت ئەمەش لەمیانەی گواستنەوەی دەسڵاتی رەهای پاپاوە بێت بۆ دەست ئەنجومەنی گشتی کە نوێنەرایەتی گشت ئیمانداران دەکات، لایەنەکانی ئەم بیرۆکەیە چۆن گەشەی سەند؟

# بزوتنەوەی ئەنجومەنگەرایی

بیرۆکـەی چاکسـازیی فـەرمانڕەوایی لـەناوخۆی کڵێسـادا لـەو ئارەزووە سەرچاوە دەگرێت کە لەکۆمەڵگەی ئەورپادا دروست بوبو سـەبارەت بەچاکسـازیکردن لەکڵێسـادا، چاکسـازییەك سـەرو ئەندامەکانیش بگرێتەوە.[440]

لەئاکامـدا وتوێـژی گشتی گەرم درویت بـو، ئەم وتوێژانـە وەکو بزوتنەوەیـەکی گـەورە وابـو لەرێگـەی پـەروەردەی سیاسـیانەی خەڵکیـدا، سـەرەڕای ئـەوەی بـەمانا وردەکـەی نەگەیشـتە ئاسـتی فەلسـەفەی سیاسـی، وەك چـۆن بـیروڕای هەنـدێك لـەبیریارە مەسیحییەکان لەبارەی سروشتی دەسڵاتەوە کە پیاوانی کڵێساو پاپا لێی بەهرەمەند دەبن و مەبەست لێی لاوازکردنی ئەو پێگەیە ئەوان هەیانەو بەمەش پاپا بووە کێشەی سەرەکی سەردەمەکە.

هەریـەك لـەوکلیف(١٣٢٠ - ١٢٨٤) ئینگلتەراییوهـەس(١٢٧٣-١٤١٥)ی بـوەیهیمی نمونـەی ئـەو بیراوڕایانـەن کـە بـەرگرییان لـەو چاکسـازییە کـردوە، بەئاشـکرا دیاردەکـانی" سـروتە ئایینـەکان و قۆرخکردنی دەسڵات بەشێوەیەکی رەها لەلایەن پیاوانی ئایینییەوە لەناویاندا خودی پاپایان رەتدەکردوە، وەك چۆن کڵێسایان ناساندوە بـەوەی کـە بریتییـە لەگشت مەسـیحییەکان لەخـەڵکی رەشـۆك و قەشـەکان.. لەبەرئـەوەی کڵێسـا ببێتـە کۆمەڵگەیـەکی کامـڵ پێویستە گشـت ئـەو هێـزە پێویسـتانە لـەخۆبگرێت کـە پێویسـتن بـۆ دوبـارە

---

440- هەمان سەرچاوەی پێشوو.. ل ٤٣٥ .

پەرەسەندنی، بۆیە مافی گشتە گەندەڵییەکانی پیاوانی ئایی
چاکبکەنەوە.[441]

بەمشێوە مەسەلەی سەربەخۆبونی کڵێساو پشتبەخۆبەست
لەمەسەلە رۆحییەکاندا بووە بیانوییەك بۆ بەرپاکردنی هەڵمەتێك
بەپیاوانی ئایینی، وەك چۆن هاوکات بووە هۆیەك بۆ بەهێزکرد
دەسڵاتی زەمەنی لەسەر حسابی دەسڵاتی رۆحیو دواجار زمین
خۆشکرد بەشێوەیەکی کۆتایی ئەم دەسڵاتە بخرێتە ژێررکێف
پاشاوە.

تیۆری ریفۆرمی کڵێسا لەرێگەی دامەزراندنی ئەنجومە
گشتییەوە تیۆریەیەکە کۆمەڵێك لەو بیریارانە دایانڕشتوە کە بایە
تەواویان بەکێبەکانی پێشوتر دەدا وەك ئەوەی مارسیلیۆس پادۆ
ویلیەم ئۆکان پێشەکەشیان کردوە، لایەنگرانی ئەم تی
سەرکەوتوبون لەسازدانی ئەنجومەنێك بۆخۆیان لەکۆنستان
Constance یەکەمجار ساڵی (١٤١٤ – ١٤١٨) و ئنجا لەبا
Basel لەنێوان ساڵەکانی ١٤٣١ – ١٤٤٩.

ئەنجومەنەکەی کۆنستانس یەکەمجار لەسەر ئەوە رێکەوت
پاپا مافی هەڵوەشاندنەوەی ئەنجومەنی نییەو لەسەریانە لەهەند
کاروباردا ملکەچیش بن، هەروەها لەسەر ئەوەش رێکەوتن
پێویستە لەئایندەدا پاپاکان هەر حەوت ساڵ جارێك ئەنجومەنێ
گشتی سازبدەن، بەڵام ئەنجومەنی بازل چووە ململانێیەك لەگ
پاپادا کە لەبەرژەوەندی نەشکایەوە، بەجۆرێك پاپا(یۆجینیۆس
چوارەم) ناوبانگییەکی ئەدەبی بەرزی بەدەستهێنا پاش ئەو

441– هەمان سەرچاوەی پێشوو.. ل ٤٣٥-٤٣٦ .

ێسای یۆنانی لەروی ناوەوە ملکەچی رۆما بو، بەشێوەیەکی
ئەرکەوتو بەروی سیاسەتدا دەریخست، ئەگەرچی شکستەکەی
روی رۆحییەوە زۆر گەورەتر بو، چونکە نەیتوانی رێزی پێگەی
پا لەدڵ ودەرونی خەڵکیدا چێبکات.[٤٤٢]

بزوتنەوەی ئەنجومەنگەرایی لەبنەمایەکی سەرەکییەوە
ەرچاوە دەگرێت ئەویش کڵێسا بەوەی کۆمەڵگەیەکی کامڵی پشت
خۆبەستوە پێویستە گشت ئەو رەگەزانە لەخۆبگرێت کە پێویستن
مانەوەو بەڕیوەچونی رێکوپێکی فەرمانڕەوایی‌و دەستگرتن بەسەر
اردەکانی گەندەڵی تیایدا، بەمەش دەسڵاتی رۆحی کە چاوی
سەر بوە لەخودی کڵێسادا چڕدەبێتەوە.. پیاوانی ئایینی‌و
اویاندا پاپا هیچ نین جگە لەکۆمەڵە بریکار یان ئەندامێك کۆمەڵگا
ێگەیانەوە ئەرکێکی کامڵ ئەنجام دەدات.[٤٤٣]

ئەمە بەو مانایە دێت بنچینەی ئەم بزوتنەوە لەو روانگەوە
ەرچاوە دەگرێت، گشت کڵێسا، واتە گشت ئیماندااران سەرچاوەی
ساکانییەتی‌و، پاپاو پیاوانی ئایینی هیچ نین جگە لەزمانحاڵ و
زمەتکاری.. بەچاکەی هەردوو یاسای ئاسمانی‌و سروشتی
ردەوامی بەژیان دەدات، وەك چۆن ملکەچی ئەو یاسایانەش دەبن
ە ژیانی کڵێسا رێکدەخات، مافی خۆیەتی‌و باشتریشە دەسڵات
رمانڕەواکانی پابەندی ئەو سنورانە بکات کە یاساکە کێشاویەتی،
ێگەی دامەزراوەی تری سەر بەکڵێساوە لەسنوری خۆیاندا
ەستێنرێن، پێویستە پاپا راسپاردەکانی بخاتە بەردەم دەستەیەکی

---

— بڕوانە: بوتراند راسل: سەرچاوەی پێشوو.. ل ٢٨١ .

— بڕوانە: سباین: سەرچاوەی پێشوو.. ل ٢٨١ .

نوێنەرایەتی بۆ وتوێژکردن لەسەری‌و ڕێگەپێدانی بۆ ئەوەی لەلایەن کڵێساوە قبوڵبکرێت، ئەگەر ئەم کارەی نەکردو دەسەڵاتی زیاد لەسنوری ئەرکی خۆی قۆرخکرد دادوەریی وادەخوازێت لەکاربخرێت و یەدەنگی هەبوە لەسەر ئەوەی کە ئەنجومەنی گشتی لەتوانایدایە پاپا لەکاربخات.[٤٤٤]

بەڵام دەسەڵاتی ئەنجومەنی گشتی بەگوێرەی ئەم تیۆر بریتییە لەڕێکخستن و سەرپەرشتیکردن، بەبێ ئەوەی ئەم ئەنجومەنە جێگەی هیچ یەکێك لەئەندامەکانی کڵێسا بگرێتەوە یان بیانکاتە بریکار یان کارمەندی سەر بەئەو، ئەو بیروباوەڕەی باوبو ئەوەبو حکومەتی کڵێسا هاوشێوەی حکومەتی پاشایەتییەو لەپاڵیدا دەستەیەکی ئەرستۆکراتی هەڵبژێردراو هەیە لەتوندوتیژییەکانی کەمدەکاتەوەو دەسەڵات لەگشت کڵێسادا چڕدەبێتەوەو بەشێوەیەکی یەکسان لەنێوان ئەندامەکانیدا دابەشکراوە، واتە لەنێوان هەمو ئیمانداراندا‌و بەجۆرێك هەر ئەندامێك ماف و ئەرکی کارکردنی هەیە لەهێشتنەوەی ئەندامەکانی تر لەپۆستەکانیاندا، لەکاتێکدا هەمویان ملکەچی یاسا بنەڕەتییەکەن کە گشت کۆمەڵگە پێکەوە دەبەستێتەوە.[٤٤٥]

لەراستیدا ئەوانەی بانگەشەی ریفۆرم دەکەن لەرێگەی ئەنجومەنی گشتییەوە، ئەگەرچی توانیبێتیان کۆمەڵە یاسایەکی تایبەت لەم بوارەوە دەربکەن، ئەوا نەیانتوانییەوە بەکرداریی هیچ

---

444- هەمان سەرچاوەی پێشوو.. ل ٤٤٣ .

445- هەمان سەرچاوەی پێشوو.. ل ٤٤٦-٤٤٧ .

هەنگاوێك بەرەو پێشەوە بنێن، ئەمەش بۆ چەند هۆیەك دەگەڕێتەوە[٤٤٦]:

١. ئەنجومەنی پێشنیازکراو بۆ چاکسازیی دەسڵات یان توانای نەبوە لەدروستکردنی کاریگەری لەسەر ئەو بەرژەوەندییە قەبانەی کە پیاوانی ئاینی کردوە خاوەن سایەو دەسڵات، لەئاکامی ئەمەشدا چاکسازییەکە دواکەوت تا ئەو کاتانەی فەرمانڕەوا زەمەنییەکان هاتن و بەناوی چاکسازییەوە گشت ئەو داهاتانەیان لەناوبرد کە پێشتر کڵێسا لێی بەهرەمەند دەبو.

٢. بانگەشە بۆکەرانی ئەنجومەنی گشتی بیریان لەئەستەم دەکردەوە کاتێك لەو بڕوادابون بەئاسانی حکومەتێکی نوێنەرایەتی بۆ کڵێسا دادەمەزرێت و دەستەوەستان بون لەتێگەیشتن لەوەی خودی حکومەتەکانی دەستوریی فیودالی دەبێت جەخت لەسەر یەکێتی سیاسی بکەنەوە، لەسەدەی پانزەیەمدا هەرچییەك لەبارەی یەکێتی کڵێساوە وترابێت هێشتا خاوەنی یەکێتییەکی سیاسی نەبوە.. یەکێتی لەبیروباوەڕدا هەبوەو هەروەها لەنمونە باڵاکان لەئاداب و لەئایینـدا، بەڵام هەستکردن بەیەکێتیەکی سیاسی لەئارادا نەبوە لەتوانایدا بێت لەپێناو بەرژەوەندییە ناوخۆییو نەتەوەییەکاندا بەرەنگاری ناکۆکییە گەورەکان ببێتەوەو ئەنجومەنەکە بکاتە ئەندامێکی کارا لەحکومەتدا.

٣. کارەکتەرێکی تریش هەیە کە لەدەوڵەتدا فەراهەمەو لەکڵێسادا نییە، ئەویش کارەکتەری یەکێتی نەتەوەییە کە رۆڵێکی گەورەی هەبوە لەگەشەسەندنی هەستی نەتەوایەتی بەیەکبون و

---

446- هەمان سەرچاوەی پێشوو.. ل ٤٤٩-٤٥٠ .

دەستپێوەگرتنێك كە ڕێگەی ژیان و بەردەوامی بۆ سێستمە نوێنەرایەتییەكان ئاساندەكات.

ئەگەر چارەنوسی بزوتنەوە ئەنجومەنگەرایی زۆر جیاوازیی نەبوبێت لەچارەنوسی پەرلەمانەكانی سەدەكانی ناوەڕاست لەو ڕووەوە هێزی پاشا داگیركەرەكان لەسەدەی شانزەیەمدا لەگشت جێگەكاندا سێستمە دەستورییەكانی ملكەچی دەسەڵاتی ڕەهای پاشاكان كرد، دەكرێت ئەوە وەبیربهێنینەوە" ئەو ململانێی لەچوارچێوەی كڵێسادا رویدا وێنەی ئەو هێڵە گشتیانەی كێشا كە جەدەلی نێوان هەردوو سێستمی سەركوتكاری‌و دەستوریی لێدروست بو، وەك چۆن چەشنێك لەفەلسەفەی سیاسی داڕێژا كە دەكرێت بەهۆیەوە بەرەنگاری سەركوتكاری ببینەوە، مافی خوداوەند لەموڵكداریی‌و دەسەڵاتی باڵای گواستەوە بۆ مەیدانی فەرمانڕەوایی زەمەنی كە موڵكی گەلە.[٤٤٧]

---

447– هەمان سەرچاوەی پێشوو.. لا ٤٥١ .

# کۆتایی

بیری هەر نەتەوەیەك لەنەتەوەکان هیچ نییە جگە لەرەنگدانەوەی بەهای گوزارشتکەر لەکولتوری شارستانی ئەو نەتەوە، بێگومان ئەم کولتـــورە نوێنەرایـــەتی لایەنـــە جیاجیاکـــانی ژیـــانی نەتەوەیـــەکی دیـاریکراو دەکـات، لـەنێو ئـەو لایەنانـەدا" لایـەنی سیاسـیو ئابوریی‌و کۆمەڵایەتی.

بۆمـان رونبویـەوە کـە بـیر پـێش بـزاوت/جوڵـەو تەنانـەت پـێش بیرۆکـەی دروسـتبونی خـودی دەوڵـەتیش کـەوتوە، ئـەویش هـیچ نییـە جگە لەگوزارشتکردن لـەبیروڕاو پرەنسیپ و بیرە باوەکانی کۆمـەڵێکی مرۆیـــی دیـــاریکراو(نەتـــەوەو گـــەلان) لەماوەیـــەکی زەمـــەنی دیاریکراودا. [448]

مەودایەکی فراوانی مێژومان تاوتوێکرد کە پەرەسەندێکی رونـی بـیری لـەخۆگرتوەو لەمیانـەی ئەمەشـدا بایـەخ بـەو رەگـەزە دراوە کـە ئارەزیـەکی دیـاریکراو لـەلای تاکەکەسـەکان دروسـتدەکات و بەمـەش شـتێکیان لـەلا بەجێـدەهێلێت ئـیتر یـان ئـەوەتا بەدیـدێت یـان دەبێتـە نمونەیـەکی باڵـا، یـان هەسـتێکی بـەهێزی ئـەوتۆیان لـەلا دروسـت دەکات ئێستا بگۆڕن بۆ ئایندەیەکی باشتر.

لەبنەڕەتدا بایەخدان بەرابردوو ئارەزوکردنـە لەتێگەیشتن، ئـەوەی ئێسـتا لەئارادایـەو بۆیـە بـەوە گەیشـتین کـە ئـازادیی وەك بەهایـەك پێویسـتە ببەسـرێتەوە بەئـەتیناو نـەزم و یاسـاش بەشـێوەیەکی

---

448 - بڕوانە: الدکتور. فاضل زکی: سەرچاوەی پێشوو.. لا ٩-١٠ .

راستەوخۆ بەرۆماوە ببەسرێتەوە، وەك چۆن یەكەی رەگەزی مرۆیی نمونەی باڵای بیری سیاسی ناقین بووە.

ئەگەر ئازادیی ئەتینایی ئەو بنەڕەتە بێت كە شارستانیەتێكی گەورەی لەسەر بونیاتنراوە كە ئەویش شارستانیەتی گریكە، ئەوا رۆما خاوەنی چاكەیە لەهاتنەئارای ئەوەی لەنێوان نەزم و یاسا پەیوەندی لەعەقڵی خەڵكدا دروستكرد، هەروەها چاكەی ئەوەشی بۆ دەگەڕێتەوە" ئەو ژمارە زۆرەی هۆزە جیاوازەكان ئەم شارستانیەتە ئەوروپاییەی ئێستا پێكبهێنن.

لەئاكامەكانی سێستمی نوێ" ئەوەیە یەكەمین هەستی راستەقینەی برایەتی لەنێوان ئەو نەتەوانەدا دروستكرد كە ملكەچی فەرمانڕەوایی دەوڵەتی رۆمانی بوون، گومانی تێدا نییە گریك نەك رۆمانەكان ئیلهامبەخشی تیۆر جیهانییەكانی خۆیان بوون بۆ رەواقییەكان، ئەوەندە هەیە ئاراستەیەكی هاوشێوە دەكرا وەك روانگەیەكی فەلسەفیانە بمایەتەوە، ئەگەر رۆما نەیخستایەتە بواری جێبەجێكردنەوەو بیروباوەڕێكی لەناو گەلە جیاوازەكانی ژێردەستیدا بڵاوكردوە، كە ئەو هەستەی لەلا دروست دەكردن پێكەوە یان لەنێوانیاندا بەرژەوەندی هاوبەش هەیە.

رۆما گشت ئەو شتانەی بڵاودەكردوە كە لەبیری گریكەوە پێی گەیشتبوو، ئنجا لەرێگەی تەشەنەپێكردنی لەبوارە نوێیەكاندا ئەم بیرانەی پەرەپێدا، لەكاتێكدا پۆلیپ (بۆ نمونە) هەوڵیدەدا لەبەر رۆشنایی چەمكە یۆنانییەكاندا رڤەی سێستمی رۆمانی بكات،

دەبینین شیشرۆن هەوڵیدەدا لەبەر رۆشنایی بەندە دەستورییەکانی رۆماوە لەفەلسفەی یۆنانی تێبگات.[٤٤٩]

ئنجا سەدەکانی ناوەڕاست دێت و لەگەڵ خۆیدا مەسیحییەت وەك بیروباوەڕێك دەردەکەوێت کە لەناوکیدا بیرۆکەی برایەتی مرۆیی لەخۆگرتوە، خەڵکی هەموو بەگوێرەی ئەم پێودانگە هەڵسوکەوتیان دەکرد، کەواتە بەمشێوە خەسڵەتەکانی گۆڕانگاری قوڵی سیاسی دەبینین.

سەردەمی ناڤین بەبەراورد لەگەڵ سەردەمی کۆندا، چەندین جۆری دوانیەتی لەخۆدەگرێت: دوانیەتی پیاوانی کڵێسا لەبەرامبەر عەلمانییەکاندا، دوانیەتی لەمەملەکەتی خودادا بەرامبەر بەپاشاکانی ئەم دنیا، لەگەڵ دوانیەتی رۆح بەرامبەر بەجەستە، گشت ئەم دوانیتیانە لەناو دوانیەتی پاپا بەرامبەر ئیمپراتۆردا.[٤٥٠]

بەپێی ئەمانە دەتوانین بڵێین" ماوەی سەدەکانی ناوەڕاست ماوەیەکە جیاواز لەسەردەمەکانی پێشوو یان سەردەمەکانی دواتر: لێیان جیاوازە نەك تەنیا لەبواری فەلسەفەدا، بەڵکو لەچەندین رووی ترەوە کە گرنگترینیان هێزی کڵێسایە، کڵێسا توانی پێوەندی نێوان بیروڕا فەلسەفیی و بارودۆخە کۆمەڵایەتی و سیاسییەکاندا بەشێوەیەکی توندوتۆڵتر نزیکبکاتەوە، ئەوەی کە لەسەدەکانی ناوەڕاست یان سەدەکانی دواتردا دەوترا.

---

449- بڕوانە: دلیل بیرنز: سەرچاوەی پێشوو.. ل ٧٧ .

450- برتراند راسل: تاريخ الفلسفة الغربية، الكتاب الثانى: سەرچاوەی پێشوو.. ل ٣ .

کڵێسا بووه سەرچاوەی هەڵقوڵانی دەرچوون بەرەو یەکەیەکی سیاسی کە خۆی لەئیمپراتۆرییەتی رۆمانیدا دەبینێتەوە: گشت گەلی مەسیحی یەك دەوڵەت و لەبەر ئەمەشە پێویستە یەك سەرۆك یان یەك پاشا بەسەر ئەو دەوڵەتەوە بێت.

هەریەك لەکڵێساو دەوڵەت بەشوێن یەك ئامانجی بنەڕەتیدا وێلن و ئەو ئامانجەش بریتییە لەوەی جیهان ببێتە دەوڵەتێکی کامڵ، مرۆڤایەتی تەنیا ئامانجێکی هەیە ئەویش یەکێتی فەرمانڕەواییەو ئەم یەکێتی بوونە لەفەلسەفەی سەدەکانی ناوەڕاستدا بەواتای (وەحدانییەتی فەرمانڕەوا) دێت، دواجار پەیوەندی فەرمانڕەوا لەگەڵ وڵاتەکەیدا وەك پەیوەندی خودای لێدێت لەگەڵ جیهاندا.[٤٥١]

بەمشێوەو لەمیانەی ئەم لێکۆڵینەوە ئەوەمان بۆ دەردەکەوێت" گشت میللەتێك کولتورێکی بیریو شارستانی هەیەو کولتوری هەر میللەتێك ئیتر شارستانی بێت یان بیری پێویستە کارلێك لەگەڵ کولتوری میللەتانی تردا بکات و هەندێك لەشارستانیەتەکان لەگەڵ هەندێکی تر لەشارستانییەتەکاندا لەبیروڕاو تێڕوانین و دەسکەوتەکاندا هاوبەشی دەکەن، ئەو شارستانیەتەش کە لەجێگەی خۆیدا دەمێنێتەوەو دەروازەکان بەڕوی خۆیدا دادەخات شارستانییەتێکی بێگیانەو رەگەزەکانی کاریگەری تێدا نییەو دواجار بەرەو ئەوە دەچێت ببێتە شارستانییەتێکی شوێنکەوتوو نەك شارستانییەتێکی کاریگەر یان ئەکتیڤ.[٤٥٢]

---

451- دلیل بیرنز: سەرچاوەی پێشوو.. لا ١٢١ .

452- الدکتور. فاضل زکی محمد: سەرچاوەی پێشوو.. لا ١٠ .

# سەرچاوەکان

## سەرچاوە: بەزمانی عەرەبی

- الدكتور ابراهيم احمد شلبى: تطور الفكر السياسى.. دراسة تأصيلية لفكرة الديمقراطية فى الحضارات القديمة - بيروت ١٩٨٥.

- الدكتور ابراهيم درويش: الدولة نضرياتهاو تنظميها.. دراسة فلسفيةو التحليلية، دار النهضة العربية - القاهرة ١٩٦٩.

- الدكتور ابراهيم درويش: النضرية السياسية فى العصر الذهبى، دارالنهضة العربية - القاهرة ١٩٧٣.

- الدكتور ابراهيم نصحى: تاريخ الرومان منذ اقدم العصور حتى عام ١٣٣ق.م .. ج ١ ، دارالنجاح- بيروت ١٩٧٣.

- الدكتور احمد فؤاد الاهوانى: المدارس الفلسفية، المكتبة الثقافية، دار المصرية للتأليف و الترجمة . القاهرة ١٩٦٥.

- أ.هـ. م. جونز: الديموقراطية الاثينية، ترجمة" عبدالمحسن الخشاب، الهيئة المصرية العامة للكتاب . القاهرة ١٩٧٦.

- ارسطو: السياسة، ترجمة" احمد لطفى السيد، مطبعة دار الكتب المصرية . ١٩٤٧.

- افلاطون: جمهورية افلاطون، ترجمة" الدكتور فواد زكريا، المؤسسة المصرية العامة للتأليف و النشر، دار الكتاب العربى للطباعة و النشر. القاهرة ١٩٦٨.

- افلاطون: رجل الدولة، ترجمة" الدكتور اديب منصور، دار بيروت للطباعةو النشر. بيروت ١٩٥٩.

- الدكتورة اميرة حلمى مطر: فى فلسفة السياسية من افلاطون الى ماركس، دار الثقافة للطباعةو النشر. القاهرة ١٩٧٥ .

- برتراند راسل: تاريخ الفلسفة الغربية (كاتابان) ترجمة" الدكتور زكى نجيب محمود، لجنة التأليف و الترجمة و النشر المصرية - القاهرة ١٩٦٧.
- الدكتور بطرس غالى و الدكتور محمود خيرى عيسى: مدخل فى علم السياسية، مطبعة الفنية الحديثة - القاهرة ١٩٦٦ .
- تشارلز وورث: الامبراطورية الرومانية، ترجمة" الدكتور رمزى عبدة جرجس - القاهرة ١٩٦١ .
- الدكتور ثروت بدوى: اصول الفكر السياسى و النظريات و المذاهب السياسية الكبرى، دار النهضة العربية - القاهرة ١٩٧١ .
- جورج سباين: تطور الفكر السياسي (الكتابان الاول و الثانى) دار المعارف - القاهرة ١٩٧١ .
- جان توشبار: تاريخ الفكر السياسى، ترجمة" الدكتور على مقلد، الدار العالمية للطباعة و النشرو التوزيع - بيروت ١٩٨٣ .
- الدكتور حامد ربيع: أبحاث فى النظرية السياسية، مكتبة القاهرة الحديثة - القاهرة ١٩٧٠.
- الدكتور حامد ربيع: تطور الفكر السياسى، كلية الاقتصادو العلوم السياسية، جامعة القاهرة ١٩٧٦- ١٩٧٧ .
- الدكتور حامد ربيع: نظرية التحليل السياسى، مكتبة القاهرة الحديثة - القاهرة ١٩٧١ .
- الدكتور حسن شحاته سعفان: اساطين الفكر السياسى و المدارس السياسية، مكتبة القاهرة المصرية - القاهرة ١٩٥٩ .
- دليل بيرنز: المثل السياسة، ترجمة" لويس اسكندر، سلسلة الالف كتاب (٤٩) مؤسسة سجل العرب - القاهرة ١٩٦٤ .

- رستو فتزف: تاريخ الامبراطورية الرومانية الاجتماعي و الاقتصادي، ترجمة و مراجعة" زكي علي و محمد سليم سالم، مكتبة النهضة المصرية - القاهرة ١٩٥٧.

- شارل فرنر: الفلسفة اليونانية، ترجمة" تيسير شيَخ الارض، دار الانوار - بيروت ١٩٦٨ .

- الدكتور عباس حلمي الحلي: اراء الفارابي في الدولة و المجتمع الانساني و التخطيط الاقتصادي، كتاب فارابي و الحضارة الانسانية.

- الدكتور عبدالقادر احمد يوسف: العصور الوسطى الاوربية، مكتبة العصرية - بيروت ١٩٦٧ .

- الدكتور عبد الحميد متولي: الوجيز في النظريات و الانظمة السياسية و مبادئها الدستورية، دار المعارف - القاهرة ١٩٥٩ .

- الدكتور عبدالرحمن بدوي: ربيع الفكر اليوناني، مكتبة النهضة المصرية - القاهرة ١٩٥٨ .

- الدكتور عبدالرحمن بدوي: خريف الفكر اليوناني، مكتبة النهضة المصرية - القاهرة ١٩٥٩، ط ٢ .

- الدكتور عبدالرحمن بدوي: افلاطون، مكتبة النهضة المصرية - القاهرة ١٩٤٣ .

- الدكتور عبدالكريم احمد: دراسات في النظريات السياسية الحديثة، معهد البحوث و الدراسات العربية - القاهرة ١٩٧٣

- الدكتور عبدالرضا الطعان: الافكار السياسية في الشرق القديم، مكتبة النصر للطباعة - بغداد ٧٧/ ١٩٧٨ .

- الدكتور عثمان امين: الفلسفة الرواقية، مكتبة الانجلو المصرية - القاهرة ١٩٧١ ، ط ٣ .

– الدكتور على احمد عبدالقادر: تطور الفكر السياسى (الاغريق، الاقدمون) مكتبة نهضة الشرق ـ القاهرة ١٩٧٤
– الدكتور على احمد عبدالقادر: مقدمة فى النظرية السياسية، شولينارى للنشر ـ القاهرة ١٩٧٤ .
– الدكتور على عبدالمعطى محمد: الفكر السياسى الغربى، دار الجامعات المصرية ـ القاهرة ١٩٧٥ .
– الدكتور على عبدالمعطى محمد و الدكتور محمد على محمد: – السياسة بين النظرية و التطبيق، دار الجامعات المصرية ــ الاسكندرية ١٩٧٦ .
– الدكتور عمار الطالبى: النظرية السياسية عند ابن رشد.
– كارل ياسبرز: فلاسفة انسانيون، ترجمة" الدكتور عادل العوا، منشورات عويدات ـ بيروت ١٩٧٥ .
– الدكتور فاضل زكى محمد: الفكر العربى الاسلامى بين ماضيه و حاضره ، دار الحرية للطباعة ـ بغداد ١٩٧٦ .
– فؤاد محمد شبل: الفكر السياسى، دراسة مقارنة للمذاهب السياسيةو الاجيماعية، الهيئة المصرية العامة للكتاب ــ القاهرة ١٩٧٤ ، ج ١ .
– ماركريت تايلور: الفلسفة اليونانية، تعريب" عبدالمجيد عبدالرحيم، مكتبة القاهرة الحديثة، القاهرة ١٩٦١ .
– الدكتور محمد فتحى الشنيطى: نماذج من الفلسفة السياسية، مكتبة القاهرة الحديثة، القاهرة ١٩٦١ .
– الدكتور محمد لبيب شقير: تاريخ الفكر الاقتصادى، مطبعة الرسالة ـ القاهرة.
– محمد محفل: تاريخ الرومان، مطابع غندور ـ بيروت ١٩٧٤ .

- الدكتور مصطفى البارودى: لمحات من الفكر السياسى حول الفرد و الدولة، مطبعة الجامعة ـ دمشق.
- الموسوعة الفلسفية المختصرة، مكتبة الانجلو المصرية ـ القاهرة ١٩٦٣ .
- موريس كرانستؤن: اعلام الفكر السياسى، ترجمة" دار النهار للنشر ـ بيروت ١٩٨١ .
- مونتغمرى واط: اثر الحضارة العربية الاسلامية على اوربا، ترجمة" جابر ابى جابر، مطبعة وزارة الثقافة و الارشاد القومى ـ دمشق ١٩٨١ .
- الدكتور ناجى معروف: الفارابى عربى الموطن و المربى (كتاب الفارابى و الحضارة الانسانية).
- الدكتور نزار الطبقجلى: الوجيز فى السياسى، شركة الطبع و النشر الاهلية ـ بغداد ١٩٦٩ ، ج ١ .
- الدكتور وليد فستق: السياسة فى الفلسفة الاسلامية: الفكر السياسى عند الفارابى.
- الدكتور وليم جيمس ديورانت: قصة الفلسفة من افلاطون الى جون ديوى، ترجمة" الدكتور فتح الله محمد المشعشع، مكتبة المعارف ـ بيروت ١٩٧٢ ، ج ٢ .
- هارتمان و باركلاف: الدولة و الامبراطورية فى العصور الوسطى، ترجمة" جوزيف نسيم يوسف، دار المعارف ـ القاهرة ١٩٦٦ .
- يوسف كرم: تاريخ الفلسفة اليونانية، لجنة التأليف و الترجمة و النشر ـ القاهرة ١٩٥٨ .

## سەرچاوە: بەزمانی ئینگلیزی


*- Adcock, F.E., Roman Political idea's and Practice, univesity of Michigan Press, 1972.

*- Allan, Donald, The Philosophy of Aristotle, Oxford university Press, N.Y., 1952.

*- Barkre, Sir Ernest, The Political thought of Plato and Arstotle, Dover Publications, INC., N.Y., 1959.

*- Barkre, Ernest, Greet, Popolitical theory, Macmilan Co., LTD., Landon, 1960.

*- Coker, Frnest w., Readings in Political thought, The Macmilan Co., N.Y., 1938.

*- Ebenstein, William, Introduction to Politcal Philosophy, Rine-Hart and Co., Princeton university, 1952.

*- Elliot, William and Neil, Mcdonald, Western Political beritage, Prence- Hall, INC., Engiewood Cliffs, N.J., 1963.

*- Essays in the history of political thought, Edited by Isaac Kramnick, Prentice- Hall, INC., N.J., 1969.

*- Foster, Michael B., Masters of Political thmught, Georg, G Harropand co., London, 1942.

*- Gettell, Raymond G., History of political thoughl, Allen and Unwin, LTD., London. 1951.

*- Gettell,s History of political thought Edited by Lawrence C., Wanlass, Novelloand co., London. 1964.

*- Harmon. M. Judd, Political thought from Plato to the Aristotle, Mcgraw- Hill book co., N.Y., 1962.
*- King, J. Charles and Mcgilvray, James a., Political and Social Philosphy, Magraw Hillbook co., N.Y., 1672.
*- Mcdonald, Lee Cameron, Western Political theory, From it,s Origins to the Prssent, Harcourt- Brace and World, INC., 1968.
*- Reither, Joseph, World history, Abrief introduction Mcgraw Book co., N.Y., 1973.
*- Russell, Bertrand, History of Western Philosophy and it,s Connection with Political and Social Circumstances from the earliest times to the present day, George Allen and unwin, LTD, London, 1947.
*- Sabine, G.h., Ahistory to Political theory, Holt, N.Y., 1961.
*- Dentreves, Alexander Passerin, The Medival Contribution to Political thought, the humanities Press, N.Y., 1959.

# پێرست

## سوپاس:

زۆر سوپاس بۆ خاتو ڤیان مەجید کە لە پێداچوونەوەی ئەم کتێبەدا هاوکاریکردم، بەتایبەت لەناوی کەس و شوێنەکاندا..

دوبارە سوپاس

# بلاكراوەكانی خانەی چاپ و بلاوكردنەوەی چوارچرا

| ژ | ناوی كتێب | بابەت | نوسینی | وەرگێرانی |
|---|---|---|---|---|
| ١ | یاساكانی ژیان | دەروونناسی | دیل كارنگی | جەبار تەنیا |
| ٢ | هەرەسی هەتاو | شیعر | سوهراب سپیهری | جەهانگیر غەفاری |
| ٣ | ئیمان بێنن بەسەرەتایی وەرزی سادرد | شیعر | فروغ فروغزاد | جەهانگیر غەفاری |
| ٤ | ژیانی خەونەكان | شیعر | سوهراب سپیهری | جەهانگیر غەفاری |
| ٥ | سرودو ئامۆژگاری بۆمندالان | سرودی منالان | ئارام كانی مازویی | |
| ٦ | دیل | شیعر | فروغ فروغزاد | جەهانگیر غەفاری |
| ٧ | مەرگی رەنگ | شیعر | سوهراب سپێهری | جەهانگیر غەفاری |
| ٨ | هونەری شێلان و مەساج كردن | هونەری شێلان | د. ایمن الحسینی | دیاری علی |
| ٩ | كارە نائاساییەكانی نەست | دەروونناسی | د.علی وەردی | بەرزان ئەحمەد |
| ١٠ | چۆن هەلسوكەوت لەگەل خەلكی دەكەیت | دەروونناسی | دیل كارنگی | سەلام كەریم |
| ١١ | زمان و رۆژنامە | لێكۆلینەوە | سەلام كەریم | |
| ١٢ | خۆشەویستی و جوانی ئافرەت | ووتەی زانایان | عەبدولكەریم كەسوانی | سەلام كەریم |
| ١٣ | هەنگاوەكانی گەشەی مندال | گەشەی مندال | ئیلیڤیا ئیلینبای | شەهلا علی — ئەبوبكر كاروانی |
| ١٤ | شێوازی ئاخاوتنی عێراقییانە | فێر بونی زمان | ئەبوبەكر كاروانی | |
| ١٥ | كار لەكارترازا | رۆمان | ژان پۆل سارتەر | ئەیوب نوری |
| ١٦ | لێكۆلینەوەیەك لەسەر سروشتیكۆمەلگای عێراق | كۆمەلناسی | د. علی وەردی | بەرزان ئەحمەد |
| ١٧ | كولبژێرێك لە هونەری چیرۆك نوسین | هونەری چیرۆك نوسین | ئیبراهیم یونسی | ئەبەز جەهانگیر پور |
| ١٨ | هونەری ووتار بێژی | دەروونناسی | دیل كارنگی | حسەین ئەجمەدین |
| ١٩ | بیری سیاسی كۆن و ناوەراست | مێژوویی | د. غانم محمد | سەلام كەریم |